پرۆژەی تیشك

٢

# نەزانیی و بێشەرمیی

## بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا

عومەر کەمال دەروێش

چاپی سێیەم

٢٠٠٦




# نـــەزانیی و بێشـــەرمیی

## بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵە بجەیی

## لە كتێبی( سێكس و شـــەرع و ژن )دا

عومەر كەمال دەروێش

# ناوەرۆك

ناوی کتێب: نــەزانیی‌و بێشــەرمیی بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شــەرع و ژن)دا.

نووسەر: عومەر کەمال دەروێش.

شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا

چاپ: سێیەم

تیراژ: ٢٠٠٠

ژمارەی سپاردن: ٢٠٨ ساڵی ٢٠٠٦.

## بەناوی خوای گـەورەو میهرەبان

### پێشەکی پرۆژەی (تیشك)

جێگای دڵخۆشـی بـوو, کـە یەکـەم بەرهـەمی پـرۆژەی تیشـك (بـە ئیسـلامکردنی کـورد، ماسـتەرنامە, یـان هەڵەنامـە؟) دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو لە ناوەندە رۆشنبیریی و ئەکادیمییەکان و خوێنەرانێکی زۆر دەستخۆشـییان لێکـردین و هـانی بەردەوامبوونیان داین.

ئەم دەنگدانەوە و پێشوازیلێکردنە, بەڵگەی واقیعیبوون و پێویستیی گۆرەپانی رۆشنبیری کوردییە بەم جۆرە پرۆژانـە, هاندەری ئێمەش بوو بۆ بەردەوامبوون لەسەر ئەو ئەرك و ئامانجانەی, کە لە سەرەتای پرۆژەکەدا رامانگەیاند.

بە پێویستی دەزانین دووپاتی بکەینەوە, قۆناغی یەکەمی ئەم پرۆژەیەمان بـۆ راسـتکردنەوەی ئـەو هەڵـە و نەزانینانەیـە, کە بەبێ بەڵگە لەسەر ئایین و مێژوو کولتووری کوردیی دروست دەکـرێن و بـە شـێوازێکی بابـەتیی و زانسـتییانە, موناقەشـەی راو بۆچوونەکان دەکەین و بێ دەمارگیریی, وەڵامیان دەدەینەوە.

وەڵامـی "نـەزانیی و بێشـەرمی..." دووەم بەرهـەممان دەبێـت, هەرچـەندە لـە بەرنامـەدا نـەبوو بـەو خێراییـە وەڵامـی (مەریوان) بدرێتەوە، چونکە کتێبەکەی لە لاوازترینی ئەو نووسینانەن, کە لە ماوەی ساڵانی رابـردوودا, بەرامبـەر بـە ئـایینی ئیسلام بڵاوکراونەوە، بەڵام ئەو هەڵڵایەی لە سـەری دروسـتکراو قەبـەکردنی نووسـەر و کتێبەکـەی, بـە مـەرامی سیاسـیی، هاندەرمان بوون, کە تۆزە برێ بۆ بکەین. هەڵبەتە کەسایەتیی مەریوان و بابەتەکەی، پـێش ئێمـە زۆریـان لـە سـەر نووسـرا، نەك لەو هەڵانەی بەرامبەر بە ئایین دەیانکات، بەڵکو دەربارەی دەستپیسیی و دزیی ئەدەبیی و نـارەوایی ئـەو شاباشـانەی, کە سیاسییەکان پێیان بەخشی.

ئەم بەرهەمەی ئێمە, خۆی لەو ئاقارانە نادات و بەجێیان دەهێڵێت بۆ نزیکـانی مـەریوان، ئەگـەر سیاسـەت رێگـر نـەبێت، ئەوان دەتوانن لەو بوارانەدا زۆر راستی روون بکەنەوە.

لاوازیی لایەنی ئەکادیمیی و فکریی کتێبەکە و ئەو کەلێنـە ناقۆڵایانـەی, کـە لـەو بـوارەدا تێیکـەوتوون، دوا دەخـەین بـۆ نووسینێکی دیکە.

ئەم بەرهەمە, تەنها بەشێك لەو هەڵانە دەستنیشان دەکات, کە مەریوان تیایاندا گلۆڵە بـووە و شـەرمیش ناکـات, کـە بـە بـێ زانیـاریی و شـارەزایی, دەم لـە مەسـەلەیەك دەکـوتێ, کـە هیچـی لێ نازانێـت، تەنانـەت نەشـیتوانیوە ئـەوەی لـەملاولا کۆیکردۆتەوە، بە ئەمانەتەوە نەقڵی بکات, یان دایرێژێتەوە، لە راستیدا ئەمە ئەوپەڕی بێشەرمییە.

لەوەش زیاتر، ئەو رووهەڵماڵراوییەی لە نووسینەکەیدا هاتووە و بێ لزووم دەیەوێت بیسـەلمێنێت پابەنـدی هـیچ ئـەدەب و نەریتێك نییە، دیسان بێشەرمیی نووسەر دەردەخات.

لـە راسـتیدا, نەشـارەزایی و شـەرمنەکردن لـەو نەشـارەزاییە، دیـارترین نەخشـی نووسـینەکەن، بۆیـە نـاوی "نـەزانیی و بێشەرمیی" پڕ بە پێستی نووسەرو نووسینەکەیەتی.

دیسـان دەیڵێینـەوە, پـرۆژەی (تیشـك) مـوڵکی هـەموو خامەیـەکی رەسـەن و هـەموو نووسـەرێکە, کـە مەبەسـتی بێـت راستییەکان بخاتە روو، بێ ئەوەی رەچاوی لایـەنی سیاسـیی و حزبیـی هـیچ نووسـەرێك بکـات، چـونکە پـرۆژەی (تیشـك) پرۆژەیەکی سەربەخۆ و بێلایەنە و مەبەستێتی لەو رووەوە پارێزراو بێت.

tishkbooks@yahoo.com

# پێشــەکی

ئیسـلام, کـە خـۆی دەبینێتـەوە لـە دوو سەرچـاوەی سـەرەکی و گـرنگ, ئـەوانیش قورئـان, کـە وتـەی خـوای پەروەردگاری زاناو ئاگاداره بەهەمـوو شتێك, هـەروەها لەگـەڵ وتـەو کـردارو ڕەفتاره شیرین و پـڕ واتاکـانی سـەروەری مرۆڤایـەتی موحەممـەد ﷺ کەلـە ڕێگەیـەکی ڕاسـت و دروسـتـەوە یەکلابوبێتـەوە, ئـەم دوو سەرچـاوەیە تـەعبیر لـە ناوەڕۆکی ئیسلام دەکەن و هەرکەس بیەوێت, بزانێت کە ئیسلام چییەوچۆنەو چی دەوێ و چی پێیـە؟, پێویسـت دەکـات بگەڕێتەوە سەر ئەو دوو سەرچاوە ڕەسەن و بێخەوشە, تا ئیسلام وەك خۆی بناسێ, ئەمـە هـەر وەك چـۆن فـەرمان دراوە بە گشت باوەڕداران کە لەم دوو سەرچاوە پیرۆزەوە ڕێنموونییەکانی خۆیان وەرگـرن, وەك: ﴿ قُلْ أَطِيعوا اللّه والرسولَ ﴾ آل العمران/٣٢، ﴿وأَطِيعوا اللّه والرسولَ لَعلكُمْ ترْحمونَ﴾ آل العمران/١٣٢.

بەهەمان شێوەش, فەرمان دراوە, کە ئەم پەیامەش بۆ خەڵکی ڕوون بکرێتەوەو نیشانیان بدرێـت. ﴿ قُلْ هذِهِ سـبِيلي أدْعو إِلى اللّهِ على بصِيرةٍ أنا ومن اتبعنِي وسبْحانَ اللّهِ وما أنا مِن الْمشْرِكِين ﴾ یوسف/١٠٨.

هەر بۆیە دەبێ بڵێین: گەر وایە ئیسلام باس لە چی دەکات؟

ئیسلام, مرۆڤـی وەك بەهایـەکی بـەنرخ و بنەمایـەکی ژیـان داوەتـە قەڵـەم, چونکە خـوای گـەورە توانایـەکی لاشـەیی وهزریـی ئـەوتۆی پێـداوە, کـە بـەردەوام بێـت لـە خۆگونجاندنـدا. بەڵگـەشمان ئەوەیـە, کـە ئـەرکی بەرپرسـیارێتی پێسپاردووە.

ئیسلام, لە مەسەلەی نەژادی مرۆڤدا, هەموو شتەکانی کۆتایی هێناوە بەوەی کە دەگەڕێتەوە سەریەك سەرچاوەو لە ڕووی دروست کردن و(بیۆلۆژی) یەوە یـەکێکن و بەشـی دەرەوەی مرۆڤـەکان ناخوێنێتـەوە, وەك: درێـژی و کورتی بـاڵاو ڕەگەزەکانی و.......هتد, خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ يا أَيها الناس إِنا خلَقْناكُم من ذَكَرٍ وأُنثَى وجعلْناكُمْ شعوبا وقَبائِـلَ لِتعارفُوا إِن أَكْرمكُمْ عِند اللَّهِ أَتقَاكُم﴾الحجرات/١٣.

واتە: "ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان لە پیاوو ئافرەتێك دروست کردووە, ئێوەمان کردە نەتـەوە نەتـەوەو هـۆز هۆز, تا یەکتر بناسن و کردەوەی چاکە بکەن, بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا, خۆپارێزترینتانە".

لەم ڕوانگەیەوە, مرۆڤ گاڵتە بە برا مرۆڤەکانی ناکـات و زوڵمیشـی لێ ناکـات و ڕقیشـی لێـی نییـە, مافـەکانی پێشێل ناکـات, بـەو مانایـەی کـە ئـەو مرۆڤـی شارسـتانیەتەو خـوای گـەورەش ڕێـزی لێگرتـووەو بـە گـەورەتری گرتـووە بەسـەر زۆربەی دروست کراوەکانیدا.

ئیسلام, لە بەرئەوەی حەقیقـەتی مـرۆڤ یەکێکـە, بۆیـە ئیسـلام پێویسـتی کـردووە, کـە مافـەکانی ڕەچـاوی یەکسـانی تەواو بکرێت, لەبەردەم قەزایەکی دادپەروەری بێلایەن, کـە کەرامـەتی مـرۆڤ بپـارێزێ و هۆکارەکـانی تـرس و ڕاڕایـی و دوو جەمسـەری دوور بخاتەوە.ئەمە مەسـەلەیەکە قورئـان و سـوننەت ئاگاداریـان کـردووین لـە گرنگێتـی, نـەك تـەنها بۆ موسڵمانان, بەڵکو بۆ سەرجەم مرۆڤەکان, لەو سۆنگەیەوە کە مرۆڤن, خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يا أَيها الَّذِين آمنـوا كُونوا قَوامِين بِالْقِسْطِ شهداء لِلَّهِ ولَوْ على أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوالِديْنِ والأَقْربِين إِن يكُنْ غَنِيا أَوْ فَقَيرا فَاللّه أَوْلَى بِهِما فَلاَ تتبِعـوا الْهوى أَن تعْدِلُوا وإِن تلْووا أَوْ تعْرِضوا فَإِن اللّه كَانَ بِما تعْملُونَ خبِيرا ﴾ النساء/١٣٥.

واتە: "ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە دادگـەرو بـە ئینسـاف بن, لەبـەر خـوا شـایەتی بـدەن, هەرچـەندە بـە زیـانی خۆتان, یا دایك و باوك و نزیکەکانتان بێ, جا چ ئەوان دەوڵەمەند یا هەژار بن, چونکە خوا بۆیـان باشـترە, جـا لـە بـەر ئەمە بە دوای هەواو هەوەسدا مەڕۆن, کە لە دادگەریی (لە شایەتی دان لە سەر حەق) کەلا ئەبن و لادەدەن, ئەگـەر لـە حەق مل بابـدەن و بـەرگری لێنەکـەن و دوای بخـەن, یـا ڕوو لـە دەربڕینـی وەربگێـڕن, بەڕاسـتی خـوا بـەوەی دەیکـەن بەئاگایە".

هەروەك دەفەرموێ: ﴿...ولا يجْرمنكُمْ شنآنُ قوْمٍ على ألاّ تعْدِلوا اعْدِلوا هو أقْربُ لِلتقْوى واتقُوا اللهَ إن اللهَ خبِيرٌ بِما تعْملُونَ﴾ المائدة/٨.

واتە: "دوژمنایەتی لەگەڵ تاقمێك, واتان لیٚ نەكات دادوەری نەكەن, دادوەری بكەن, ئەوە لە تەقواوە نزیكترە".

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: "ئەوانەی پێش ئێوە, كاتیٚ تیاچوون, كە گەورەكانیان دزییان دەكرد, وازیان لیٚ دەهێنان, كاتێكیش بێدەسەڵاتێك دزی دەكرد, سزایان دەدا, سوێند بە خوا, گەر فاطمە ی كچی موحەممەد دزی بكات سزای دەدەم, بە دەست بڕینی" (إنما أهلك الذين من قبلكم, إذا سرق فيهم الشريف تركوه, وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد, فوالله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها)[١].

ئیسلام, كاری لەسەر ئەو كەسانە پێویست كردووە, كە دەتوانن كار بكەن و ئیجتیهادی تیادا بكەن, چونكە هەر لەو كاتەوە خوای گەورە بەدی هێناوین, ئەو وزەیەشی پێبەخشیوین, كە پێویستمانە بۆ ئەم كارەو سەرهەڵدانی بەرهەمەكانی, خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ هو الذِي جعلَ لكُم الأرْض ذلُولًا فامْشوا فِي مناكِبِها وكُلوا مِن رزْقِهِ وإليْهِ النشور﴾ الملك/١٥.

واتە:"خوا زاتێكە زەوی بۆ ئێوە رام كردووە, بەهەر شوێن و جێگەیەكی دەتانەویٚ بڕۆن, جۆرەها كارو كەسابەت و بازرگانی بكەن و لە رزقی خوا بخۆن, وە گەڕانەوەش هەر بۆ لای خوایە".

ئیسلام, بڕیاری خاوەندارێتی تاكە كەسی داوە, بەچەند كۆت و زنجیرێكیش پەرژینی كردووە, هەر لە ژیانی ئەو كەسەوە تا دوای مردنیشی, تا نەبێتە ئامێرێك بۆ خستنە ژێربارو كۆبوونەوەی سامانی گوێزراوە لە چنگی كۆمەڵە كەسانێكی هەلپەرست.

هەروەها ئیسلام بڕیاری خاوەندارێتی گشتیشی داوە, پێغەمبەرﷺ چوار شتی دەستنیشان كردووە, كە هەموو لایەكمان تیایدا هاوبەشین (ئاو, لەوەرگا, سوتەمەنی و خویٚ)[٢].

ئیسلام, پێیوایە ئایین ڕاستیییەكە پەیوەستە بە دڵ و قوڵایی ویژدانەوە, بۆیە بیٚ فشاری دەرەوە, پێویستە قەناعەتی خۆی بۆ دروست ببیٚ, چونكە بەندایەتیكردن لە ئیسلامدا بۆ خوای گەورەیە, باشترین دیاردەی ئەم بەندایەتی كردنەكەش (دڵسۆزیی و خۆشەویستیی و ملكەچییە), ئا لێرەوە ئیسلام ئایینی بۆ ئازادیی ویژدانەكان جێهێشتووە, داواش لە خەڵكی ناكات بەزۆر بێنە ناو ئیسلامەوە, خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لا إكْراه فِي الدين قد تبين الرشْدُ مِن الغي فمنْ يكْفُرْ بِالطاغُوتِ ويُؤْمِن بِاللهِ فقدِ اسْتمْسك بِالعُرْوةِ الوُثْقى لا انفِصام لها واللهُ سمِيع علِيم﴾ البقرة/٢٥٦.

واتە: "بۆ قبوڵ كردنی دین هیچ زۆر لێكردنێك نییە, چونكە ڕێگای ڕاست (بڕوا)و ڕێگای خوارو سەرلێشێواویی (كوفر) دەركەوتووە".

ئیسلام, هانی مرۆڤی داوە, كە بە ڕاشكاویی و بیٚ ترس, بۆچوونی خۆی دەرببڕیٚ, ئەو ئایەتانەشی, كە لە قورئاندا هاتوون باشترین گەواهی لەسەر بیركردنەوەو خستنەگەڕی ئازادیی بیر دەدەن, ئەوانەش كەم نین, كە تێبینی ڕەخنە ئامێزی خۆیان هەبووە لە خزمەتی پێغەمبەرداﷺ, وەك ئەوەی لە (سوڵحی حودەیبییە)دا ڕوویدا لەسەر گەڕانەوە, ئیعتیراض گرتنی هەندێك لەسەر نوێژكردنی لەسەر گۆڕی (عبدالله بن ئوبەی) كە لەسەر دووڕوویی مرد, باشترین بەڵگەیە بۆ ڕێزگرتنی ئیسلام لە مرۆڤ.

ئیسلام, هەمیشە داكۆكی لە ژیانی ئەو مرۆڤە كردووە, كە ڕێزی لێگرتووەو كردوویەتییە جێنشینی سەر زەوی, خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ولكُمْ فِي القِصاص حياةٌ يا أولِيْ الألْبابِ لعلكُمْ تتقُونَ﴾ البقرة/١٧٩.

---

[١] صحيح, جامع الصغير, رقم (٢٣٤٤).

[٢] الاموال: لأبي عبيد, ص٤١٣.

واتە: "ئەی خاوەن ژیران و هۆشمەندان تۆڵەوەرگرتنەوە ژیانی تێدایە".

ئەوە ئیسلامە، کە ڕێزی بۆ مرۆڤ داناوەو هەڕەشە لە بکوژانی دەکات بەوەی، کە ئەگەر کەسێ بکوژرێ، بە دەستی چەند کەسێك، دەبێ هەر هەموویان بکوژرێنەوە، وەك ئەو کۆمەڵەی کە لە تۆڵەی کوشتنی کەسێکدا لە یەمەن کوژرانەوە، چونکە هەموویان بەشداربوون لە ناوچوونی تەنها یەك مرۆڤ، عومەری کوڕی خەتتاب وتی: "گەر هەموو خەڵکی(سەنعا) بەشداربونایە لە کوشتنی ئەو کەسەدا، هەموویانم لە تۆڵەیدا دەکوشتەوە، کە حەوت کەس بوون و هەر حەوتیانی کوشتەوە".[٣]

ئیسلام، خاوەندارێتی حەڵاڵ کردووە لە سنوری ڕەواو شەرعیو سەرچاوەکانیدا، وە لە پێناوی پاراستنی ڕێزیدا سزای توندی داناوە بۆ (دز)، هەروەها ئیسلام سزای گەورەی داناوە بۆ ڕێگرەکان و ئەوانەی خراپەکاریی لەسەر زەوی بڵاودەکەنەوەو خەڵکی دەتۆقێنن و ئاشتی کۆمەڵگا دەشێوێنن، خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿ انما جزاء الذين يحـاربونَ اللّه ورسوله ويسْعوْنَ فِي الأَرْض فَسادا أن يقَتلوا أوْ يصلبوا أوْ تقَطع أيْدِيهمْ وأرْجلهم منْ خِلافٍ أوْ ينفَوْا مِن الأرْض ذَلـك لَهمْ خِزيٌ في الدنْيا ولَهمْ فِي الآخِرةِ عذَاب عظِيم﴾ المائدة/٣٣.

واتە: (بەڕاستی سزای کەسانێك کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و فەساد لە زەمیندا ساز دەکەن ئەوەیە، کە (بکوژرێن، یان لەدار بدرێن، یان دەس و پێیان ڕاست و چەپ ببڕدرێت، یان شار بەدەربکرێن، ئەمە بۆ ئەوان ڕووڕەشی و ڕسواییە لە دونیاو دوا ڕۆژیشدا تووشی سزای گەورە دێن).

ئیسلام، داوای مامەڵەی باش لەنێوان مرۆڤەکان دەکات، بە مافێکی چەسپاویان دادەنێت، خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿ لا ينْهاكُم الله عن الذِين لَمْ يقَاتِلُوكُمْ فِي الدين ولَمْ يخْرجوكُم من دِيارِكُمْ أن تبروهمْ وتقْسِطُوا إِلَـيْهِمْ إِن اللـه يحِـب المقْسِطِ ﴾ الممتحنة/٨.

خوا لە چاکە کردن لەبەرامبەر ئەواندا، کە لەگەڵ ئێوەدا لەسەر دین نەجەنگاون و لەشارو وڵاتتان دەریان نەکردوون، نەهێتان لێناکات و دادپەروەر بن، بەڕاستی خوا دادوەرانی خۆش دەوێ).

ئیسلام، بەکۆمەڵ سزادانی خەڵکی ڕەتدەکاتەوەو پێیوایە هیچ کەسێ لەبری تاوانی کەسێکی دی لۆمە ناکرێ، خوای گەورە دەفەرمویێ: ﴿ ولَا تزِر وازِرةٌ وِزْر أُخْرى﴾فاطر/١٨.

واتە: "وە هیچ کەسێ باری تاوانی کەسی تر هەڵناگرێ".

زۆر بە کورتی:

ئیسلام، پەیامێکی هەمە لایەنەیە، هاتووە بۆ ڕێنوێنی کردنی خەڵکی لە مامەڵە کردنیان لەگەڵ دروستکارەکەیان و چۆنێتی لێ تێگەیشتنیان لێیو مامەڵە کردنیان لە هەموو بوارەکانی ژیانی دونیا، هەر لەو کاتەی هێشتا لە سکی دایکیاندان، چۆنێتی بە خێوکردنیان، پەروەردە کردنیان، گەورەبوون و تەواوی پێویستییەکانی دونیایان، بە هەموو بوارەکانەوە بە گەورەو بچوکەوە، خۆشی و ناخۆشی، چاك و خراپی، هەر هەمووی بۆ دەستنیشان کردوون، گەرچی لێرەدا ئەمە باسی سەرەکی ئێمە نییە، بەلام وەك ڕێ خۆشکردنێك ئەم چەند شتەمان نووسی بۆ ئەوەی بڵێین:

ئیسلامێك بەو هەموو فراوانی و هەمە لایەنەوە، کەسانێکی وەك (مەریوان) دەیانەوێ، ئیسلام بێدەنگ بێ لەبەردەم کارێکی زۆر پێویست و گرنگ لەلای مرۆڤایەتی، کە ئەویش مەسەلەی (سێکس)ە، ئیسلام وەك (قورئان و سوننەت)، بەمافێکی ئاسایی و زەروریی خۆی دەزانێ، کە قسە لە سەر کارێکی وەها هەستیار بکات، بەو جۆرەی کە ئیسلام باسی کردووەو ڕێگەی بۆ داناوە، نەك وەکو مەریوان دەیەوێو ویستویەتی و هەوڵی بۆ داوە.

ئەوپەڕی شانازیی و مایەی گەورەیی ئیسلامە، کە ئەو لایەنە گرنگەی مرۆڤایەتی فەرامۆش نەکردووە، هەر وەك چۆن تەواوی لایەنەکانی تری ژیانی مرۆڤایەتی ڕەچاوکردووەو بایەخی خۆی پێداوەو ڕێگەی بۆ داناوە.

---

[٣] تفسير القرطبي، ج٢، ص٢٥١.

تەواوێتی ئیسلام لەوەدایە, کە هەموو لایەنەکانی پێویستی مرۆڤایەتی تێدا باس کراوەو پلان و نەخشەسازیی بۆ کراوە, لەلایەن خاوەنی هەموو بوونەوەرو بە پێغەمبەرەکەیدا گەیاندویەتی, تا مرۆڤایەتی لێ ئاشنا بێت و بە بەرنامەکاریی خۆیان بەڕێوە بەرن.

لەپاش ئەمە:

کتێبی (سێکس و شەرع و ژن لە مێژووی ئیسلامدا) لە نوسینی مەریوان هەڵەبجەیی, کاتێك خوێندمەوە, لە پێشدا, وامزانی (مەریوان) هەوڵیداوە ڕاستی بەیان بکات بۆ خوێنەر, بەڵام بۆم دەرکەوت کە ئەو مەبەستەی نییە, بەڵکو مەبەستی ناشیرین کردن و بێزراوکردنی ئەو پەیامە جوانەیە, کە بە درێژایی چواردە سەدە, ڕۆژ لە دوای ڕۆژ, عاشقانی زیاتر دەبن, وام دەزانی مەریوان, یەکێکە لە قەڵەم بە دەستە چاونەترس و دەستپاك و قەڵەمپاکەکان, کە مەبەستییەتی زانیارییەکی نوێ ببەخشێ بە خوێنەری کورد, بەڵام بە داخەوە مەریوان ترسنۆکانە, بە قەڵەمی ژەهراویی و دەستی پیسەوە ئەو نوسینەی نوسیوە, چونکە (مەریوان) هەر وەك درۆی بە دەم ئیسلامەوە کردووە, دزیی و چەواشەکاریشی ئەنجامداوە, کە لە نوسینی بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا زۆر بە ڕوونی بەدەردەکەوێ, جگە لەوەی نەفامیی خۆشی بە ڕوونیی لە هەموو لایەکدا والآکرد, کە بەڕاستی (مەریوان) نەخوێندەوارە, بێسەلیقەیە, خەڵەفاوە, زۆر سێکسییە, چونکە هەندێ شت کە باسی لێدەکات کتوپڕو بێ ئەملاولا پەیوەستی دەکات بە (سێکس)ەوە, بۆ نمونە بڕوانە: بڕگە (٥و٩) لە بەشی یەکەمدا.

## مەریوان و نوسینەکەی و مەبەست لێی

مەریوان, بە حوکمی ئەوەی هەر لە منداڵییەوە لە سۆزیی دایك و باوکایەتی بێبەش دەبێت و دواتر دەبرێتە بەشی چاودێریی بێنەوایان, واتە هەر لە سەرەتای لا کردنەوەیدا بێبەشبووە لەو مافانەی, کە هاوڕێکانی هەیانبووە, ئەم بێکەسییە وا لە (مەریوان) دەکات هەر لە منداڵییەوە هەست بە "ڕووخان" و "کەمتر تێکەڵاویی نێو خەڵکی" بکات, ئەمەش بە پێی زانستی دەروونزانی وا دەکات کەسێك دەرچێت, کە لە ژیانیدا(فاشل)بێت, ئەمەش هەر لە سەرەتای تەمەنییەوە پێوەی دیاری دەدات, کە ناتوانێ بەردەوامی بە خوێندنی ئاسایی خۆی بدات و دواتر بە ناچاری پێش ئەوەی بگاتە پۆلی سێیەمی ناوەندی, دەست لە خوێندن هەڵدەگرێت, پاشان ڕوو لە سەربازیی لە سەربازگەکانی حکومەتی (بەعس)دا دەکات, ئەمیش بۆ خۆی گرێیەکی دەروونیی دیکەی دروست کرد لەلای (مەریوان), لەپاش ڕاپەڕین و ئاڵۆزبوونی باری دارایی زۆربەی خەڵکی کوردستان, مەریوان, یەکێك بوو لەو هەزاران کەسەی کە کەوتبووە بەر هێرشی گرانیی و هەژاریی و بێدەرامەتی, ئەم هۆکارانە بمانەوێ و نەمانەوێ, گەر کەسێکی بکوژو ڕێگر بە فیعلی دروست نەکات, بەجۆرێك لە جۆرەکان خۆی دەخاتە نێو هزرو بیرییەوە, پاش چەند هەوڵێك لە هەڵەبجەو دواتر لە سلێمانی, بۆ دەستەبەر کردنی بژێویی ڕۆژانەی, کە لەمەشدا بەخت جارێکی تر یاوەری نەبوو, وەك دەڵێن: "بەڕە هەموو جارێ لای تەنکییەوە دەدڕێ". مەبەستم تەنها ڕوونکردنەوەی باری دەروونیی و کەسێتی مەریوانە, نەك شتی تر, بۆیە ناچار مەریوان دەست دەکات بە نووسین, هەر جۆرە نووسینێك, بەڵام ئیتر لێرەوە مەنفەزی خۆ خاڵی کردنەوەی گرێ دەروونییەکانی دەست پێدەکات, خۆ کردن بە کەسێکی دی و موکافەئە وەرگرتن بەناویانەوە, ماوەیەك بەردەوام دەبێ, تا دوا جار لەکاتی موکافەئە وەرگرتنەکەدا, کەشف دەبێت کە ئەم مەریوانە ئەو مەریوان هەڵەبجەییە نییە, کە لە تاران سەرقاڵی کارەو جارجارەش نووسین دەنوسێ بۆ ئەم گۆڤارو ئەو ڕۆژنامەیە, مەریوان دەزانێ مەبەستم چییەو ئەگەر ئەم دێڕە بخوێنێتەوە تێدەگات کە چ ڕۆژێکی ناخۆش بوو ئەو ڕۆژە!. زانایەك دەڵێ: هەندێ کەس بۆ ئیسلام دەژین و هەندێکیش بەسەر ئیسلامەوە. جا مەریوان لە کەسی دووەمە, دیارە بۆ بژێویی دەستخستن باشترین شت ئەوەیە لەسەر ئیسلام بنوسیت!, چونکە کەسانێك هەن خۆشییان لەسەر ئەم بابەتانە دێت و یارمەتی دەریشن, مەریوان دەستیکرد بە نووسین لەسەر ئیسلام, "دەروازەکانی ئایین"و چەند نووسراوێکی تر, تا نوسینی "خوێننامە"کەی, کە لەم جارەدا توانی تاڕاددەیەك بەشێکی بچوك لە مەبەستەکانی بهێنێتەدی, کە بریتیبوو لە

(وەرگرتنی پارچە زەوییەك لە سلێمانی)، وەك دەستخۆشی و بەخشش لەسەر ئەو کتێبەی، جگە لە چەند هەزار دینارێکی سویسری ئەو کات، ئەمە وای لە مەریوان کرد زیاتر لەم بابەتەدا خۆی خەریك بکات، چونکە لە هەموو کارەکان و هەوڵەکانی تر بەختی چاکترە تیایدا!.

مەریوان، لە رووی زانستی دەروونناسییەوە کەسێکی نەخۆشە، بەڵام ئەوەی باشە مەریوان وەك خەڵکی تر ئەو نەخۆشییە بە پەلاماردانی خەڵکی و چونە سەر جادەکان دەرنابڕێت، بەڵکو بەنووسین ئەو هەستە خاڵی دەکاتەوە، نووسینەکانی جوانترین شاهیدن!، بەتایبەت ئەم کتێبەی ئێستای، من وا دەبینم، هەر واشە کە دەبێت مەریوان کتێبێکی تر بنووسێت، تا ئەوپارچە زەوییەی، کە وەك بەخشش وەریگرتبوو، ئەوەندە بەخشش و دیاری وەربگرێت کە بتوانێت بیکات بە خانوو.

مەریوان، بۆ چەواشە کردنی خەڵکی سەرچاوەیەکی زۆری لە سەرچاوە ئیسلامییەکان هێناوە، کە من پێموایە تەنها بۆ قەرەباڵغی و خۆڵکردنە چاوی خەڵکە، هەر بۆ نمونە لە باسی (موتعەی نیکاح) زیاد لە (١٥) سەرچاوە دەنوسێ، کە من دڵنیام هیچ یەکێ لەو سەرچاوانە ناچێت بەلای ڕەوایی (موتعە)و ئەو مەبەستانەی، کە مەریوان نوسیویەتی. لە جێگەی خۆیدا بەچاکی لەسەری دەدوێم.

## کاری من لەسەر کتێبەکە

بە گشتی نووسینەکەی مەریوان خۆی لە چەند بەشێکدا دەبینێتەوە، کە من بەم جۆرە دابەشم کردووە:

١-دەستکاریی کردنی دەقەکان و شێواندنیان، هەموو ئەو دەقانە دەگرێتەوە کە مەریوان:

أ-بە سەقەتی و نارێکی و دوور لە هیچ بنەمایەکی زانستیی کردویەتی بە کوردی و مانای کردووە، بۆ نمونە: بڕگەکانی:(٢و٩و٣٠).

ب-ئاماژەی داوە بەسەرچاوە، بەڵام لەو سەرچاوەیەدا بوونی نییە، بۆ نمونە: بڕگەکانی:(٣٣و٥٤).

ج-دانە پاڵی قسەو دەقێك دوور لە خاوەنەکانیان، بۆ نمونە: بڕگەکانی: (١٩و٢٤و٣٦).

د-قرتاندنی بەشێك لە دەقەکە، کە بەهۆیەوە واتاکە دەشێوێت، بۆ نمونە: بڕگەکانی:(٣٧و٧١).

چەندین کاری سەرسوڕهێنەری تری هاوشێوەی ئەمانە.

٢-وتە لاوازو بێ بنەماکانی، ئەمەش هەموو ئەو دەقانە دەگرێتەوە کە مەریوان هێناونی، بەڵام:

أ-یان لاوازن لە رووی زانستی فەرموودەناسییەوە.

ب-یان بێ بنەمان، یان هەڵبەستراوەو دروستکراوە.

٣-باسی پێغەمبەران و خێزانەکانیان، کە ئەمەش قسە کردنە لەسەر:

أ-ئەو باسانەی کە مەریوان لە (تەورات)ەوە هێناویەتی.

ب-ڕوانینی قورئان بۆ پێغەمبەران و هاوسەرەکانیان و وتەی زانایان لەسەریان.

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست لەسەر بەشی یەکەم.

مەریوان، لەم بەشەدا، کە دەتوانم بڵێم سەرجەم کتێبەکەی گرتۆتەوە، بەڵام من تەنها (١٨٩)جێگەم دیاری کردووە، کە قسەی لەسەر بکەم، بە ڕاست کردنەوەو ڕوونکردنەوە لەسەری، دەنا گەر مەبەستم بوایە، هەر هەموو دێڕو دوو دێڕێك قسەی خۆمم لەسەر دەکرد، بەڵام وەك دەڵێن: "مشتێك نمونەی خەرمانێکە"، بۆیە داوا لەو کەسانە دەکەم، کە بەتایبەتی بەشی یەکەم دەخوێننەوە، زۆر ورد سەرنج لە وەڵامەکان بدەن کە نوسراون، بە دەستەواژەی "دەڵێین:" دەستم کردووە بە وەڵامدانەوەی هەر بڕگەیەك، کە هەیە، جاریوایە قسەم زۆر لەسەر وەڵامەکە نەکردووە، واتە بەراورد کردنەکەیم جێهێشتووە بۆ خوێنەر، لە بەر ئاشکرایی وەڵامەکەو گەڕانەوەی کات، بۆنمونە: بڕگەکانی: (١٩)و(٢٢)و(٨٢).

هەروەها دەكرێ ئەم بەشی یەكەمە, وەلاٌمێكی گشتی بێت بۆ سەرانسەری كتێبەكە, چونكە لەم بەشە زۆربەی هەرە زۆری ئەو دەقانە ڕاستكراونەتەوەو وەلاٌمی شیاوی خۆیان دراوەتەوە, كە مەریوان بنەمای كارەكەی لەسەر دروست كردووە, بۆیە دەكرێ بڵێین: هەر ئەنجام و(إستنباط)ێك, یان قسە كردنێك كە مەریوان لە پێش, یان لە پاش هێنانی دەقەكە كردوویەتی, پووچەو بێبایەخە, چونكە هەر شتێ لەسەر پووچ بنیاتنرا ئەو شتە پووچە.

من لێرەدا,لەم بەشەدا, ئەمەوێت بڵێم: كەسێك ئاوەها چەواشەكارو بوختانچیی و فێڵبازو درۆزن بێت, ئایا ڕەوایە باوەڕ بە نووسینەكانی بكرێت؟, بێگومان نەخێر.

كەواتە, با بۆ خەڵكی دەركەوێت, كە مەریوان زۆر نەزانە, هەر نووسینێكی لەوەو پێش, یان لەمەو دوا, گەر نووسی, لە حاڵی ئەم نووسینەی ئێستای باشتر نییە و هەمان چەواشەكاریی تێدا پەیڕەو دەكاتەوە.

لە كۆتایشدا دەڵێم: ویژدانی زیندووی هەموو كەسێكی ژیر دەكەمە دادوەرو تەنها با خۆی بڕیار لەسەر (ڕەوشت, زانیاریی, كەسایەتیی, دەروون و .....تاد)ی مەریوان بدات.

دەگێڕنەوە:

جارێك كابرایەك زۆر ڕقی لە مەلای مزگەوتەكەی خۆیان دەبێت, بۆیە هەرچەندە هەوڵ دەدات لەلای خەڵكی ناشرینی بكات و خەڵكی لێ بتەكێنێتەوە, هەوڵەكانی پووچ دەبێتەوە, تا ڕۆژێك (مەلا)كە لەوتاری هەینیدا باسی (فیرعەون) بۆ خەڵكەكە دەكات, كە چەندە ستەمكارو خوێنڕێژە....تاد, باسی ئەوەیان بۆ دەكات و دەڵێت: (فیرعەون) ئەوەندە لە خۆی بایی بوو بوو دەیوت: "(أنا ربكم الاعلى) من خوای هەرە گەورەی ئێوەم". كابراكەش ئەم قسەیە بە فرسەت دەزانێ, تا خەڵكی لە دژی (مەلاكە) هان بدات, دەچێت یەخەی (مەلاكە) دەگرێت و دەڵێت: خەڵكینە ئەم (مەلا)یە دەركەن و سزای بدەن, خۆ بە گوێی خۆتان گوێتان لێی بوو ئەو كوفرە گەورەیەی كردو وتی: "من خوای هەرە گەورەی ئێوەم". (مەلا)كەش دەڵێ: ڕاوەستە كابرا خوا بتگرێ بۆ بوختانم بۆ دەكەی, من كوا شتی واموتووە, من وتوومە: فیرعەون بە گەلەكەی دەوت:".....". تۆ بۆچی باسی (فیرعەون)ەكەت لابرد.

جا من, وا دەبینم (مەریوان)یش, لە نووسینی ئەو كتێبەیدا, بەدەردی هەمان كابرا چووە, لەو كتێبەدا, هاتووە چەندین دەقی قورئان و سوننەتی شێواندووە, بە وێنەی ئەو كابرایە, بگرە خراپتریش, هەندێك جار ئاماژەی بە سەرچاوەیەك كردووە, بەڵام یان ئەو سەرچاوەیە شتی وای (هەر تیا نییە), یان (بەجۆرێكی ترە), یان هاتووە هەر لە خۆیەوەو بەبێ ئەوەی ئەو دەقە بەهیچ جۆرێك بچێت بەلای ئەو واتایەدا, ئەم ئاوەها ئەو واتایەی لێكداوەتەوە, نەك تەنها دەقە قورئانی و سوننەتەكان, بەڵكو لە كاتی گواستنەوەی دەقێك, یان باسێك لە سەرچاوەیەكەوە, هاتووە دەستكاریی كردووەو خۆی چۆنی پێباش بووبێت, ئاوەها نووسیویێتییەوە.

جا بۆ ئەوەی ڕاستی ئەم قسانەمان بۆ هەموو لایەك دەركەوێت, هەمووانیش بزانن, كە (مەریوان) چ ناپاكییەكی كردووە لەو نوسینەیدا لە بەرامبەر پەیامی خواو ئیسلام و سەرچاوەكانی, ئێمە یەك بە یەك, بەبێ دەستكاری, نوسینەكەی (مەریوان)دێنین و پاشان بەدواداچوونی بۆ دەكەین.

١- لە لاپەڕەی (٤و١٩٣)دا, فەرموودەیەك باس دەكات, كە پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگە ئافرەتێك دەبینێت.....

مەریوان, بەم شێوەیە واتای كردووە: "جارێكیان پەیامبەر لە كاتی ڕۆشتندا چاوی بە ژنێكی جوان دەكەوێ و(عەورەتی ڕەق) دەبێ, خۆی پێناگیرێ و بە(پەلە)خۆی دەگەیەنێتەماڵەوە....". لەدواییدا دەقە عەرەبییەكە بە سەرچاوەوە دەنووسێت.

دەڵێین:

خەڵكینە ئێستا با پێكەوە دەقە عەرەبییەكە بخوێنینەوە, بزانین وایە وەك (مەریوان) وتویەتی, فەرموودەكە لە جابرەوەیە, دەڵێ: "أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) رأى امرأة فأتى امرأته زينب....".

من بە ئێوە دەڵێم: لە كوێدا باسی "عەورەتی ڕەق دەبێ" هاتووە؟, ئەمە زیادەیەكەو لە بۆچوونی خۆیەوە دەریبڕیوە, چونكە وەك شتێكی ئاشكرایە لە لای پیاوان مەرج نییە هەركات پیاو چاوی بە ئافرەتێكی جوان بكەوێت یەكسەر (عەورەتی ڕەق)بێت, چونكە ڕاكێشانی سەرنجی جوانی ئافرەت پەیوەندی بە(عەورەت)ەوە نییە. مەگەر نازانرێ, كە كەسی واهەیە (عەورەت) ی بڕاوە, یان لەبەر پیری, یان هەر هۆیەكی تر عەورەتی ڕەق نابێت, كەچی سەرنجی بۆ لای ئافرەت دەچێت, بەڕاستی ئەم جۆرە ڕاڤەیە تەنها لە كەسێكی زۆر سێكسییەوە وا ڕاڤە دەكرێ, دەنا تا ئێستا ڕاڤەی وا كەس نەیكردووە[٤].

مەریوان, گلەیی لەو كەسانە دەكات كە بەویستی خۆیان و لەسەر بنەمای بۆچوونی سەقەت واتای شتەكان دەكەن, دەڵێ: "لەلایەكی دیكەشەوە وەرگێڕێكی عەمامە بەسەر بەناوی ئایین و شارەزایانەوە لەسەر ویست و ئارەزووی خۆیان

[٤] بۆ تەواوی دەقە عەرەبییەكە بڕوانە: صحيح مسلم: كتاب النكاح، باب: ٢ رقم الحديث (١٤٠٣)و ابو داود رقم (٢١٥١) و الترمذي رقم (١١٥٨).

تەفسیرو تەرجەمەمان بۆ دەکەن کە یەك لەبەری ماناکانیان لەسەر خورافەو ڕیوایەتێکی نالۆژیکیو بۆچونی سەقەت وەستاوە".

ئەمە جگە لەوەی بوختانێکی زۆر گەورەیە, ڕێكو تەواو بەسەر خۆیدا شکاوەتەوە, کە شتی زۆر ئەنتیکەی لێدەبینرێ!.

٢–لە لاپەڕە (١٦و١٩٥) ئایەتی (١٤)ی سورەتی (ال عمران), کە دەفەرموێ: ﴿ زين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة والخيل المسومة والأنعام والحرث ذلك متاع الحياة الدنيا والله عنده حسن المآب﴾.

ئەم ئایەتەی کردۆتە بەڵگە بۆ ئەوەی, کە ژن پیسە لەلای ئیسلام, وەك لە لاپەڕە (١٦)دا دەڵێ: "لێرەوە ئاژەڵ گەمژەو نەزان و ژنیش گەڕو پیس و نانی دەستی حەرامە".

پاشان لە پەراوێزەکەدا نووسیویەتی: بۆ نمونە لە ئایەتی چواردەی (ال عمران)دا ژن لەڕیزی ئەسپ دانراوە.

لەلاپەڕە (١٩٥) دەڵێ: "چونکە لەلای ئیسلام ژن وەك ئەسپو ئاڵتونو شتی تر بۆ خۆشییەکانی پیاو دروست بووە...".

دەڵێین:

با بێین بزانین زانایانی تەفسیر چۆن باسی ڕاڤەی ئەم ئایەتە دەکەن, بۆ نمونە: (ابن کثیر)* دەڵێ: "خوای گەورە هەواڵ دەدات لەوەی کە ئەم ژیانی دونیایە ڕازێنراوەتەوە بۆ خەڵکی بە جۆرەهای چێژەکان لە ئافرەت و منداڵ, سەرەتا باسی لە ئافرەت کردووە, چونکە توشبوون بە ئافرەت گەورەیە, وەك لە فەرمودەدا هاتووە. پاشان فەرموودەکە باس دەکاتو دەڵێ: "بەڵام ئەگەر مەبەست لە ئافرەت ئەوە بێت کە داوێنپاکیی و زۆر بوونی منداڵی تیا بێت, ئەمە کارێکی داواکراوەو هاندراوە.....وەخۆش ویستنی منداڵ (بەتایبەت کوڕ) جاری وایە بۆ خۆدەرخستن و ڕازاوەییە, کە ئەمە ئایەتەکە لەخۆی دەگرێو جاری واش هەیە بۆ ئەوەیە, کە وەچە زۆر بێت و نەتەوەی موحەممەد ﷺ زۆر بێت....ئەمەیان سوپاس کراوەو.... پاشان باس لە تەواوی شتەکانی تر دەکات...."[٥].

کەواتە, مەبەست لەئایەتەکە گەڕو پیسی و حەرامی خواردنی دەستی ئافرەت نییە, هەروەها من بە دڵنیاییەوە دەڵێم و تەحەددای (مەریوان) دەکەم, بتوانێ ئەوە بسەلمێنێ کە خواردنی دەستی ئافرەت, جا لەسوڕی مانگانەدا بێت, یان نا, لە ئیسلامدا حەرام بێت, گەڕ بێت.

من لێرەدا نامەوێت لەسەر ئەم بابەتە بدوێم و دڵسۆزانی پەیامی خوا لەم بارەوە گەلێك نوسراویان هەیە.

بەڵام, زۆر حەیف, مەریوان دەڵێ: "زۆر لەوە دڵنیا تریشم ئەگەر ئیسلام وەك ئەوەی هەیە, بێ لابردن و خستنە سەری, خۆی چۆنە هەرئاوا وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی کاریگەرە ئیجابییەکەی زۆر لەوە گەورەتر دەبێت کە چاوەڕێی دەکەین".**

بەڵام, تۆ لەمەدا خاوەنی بۆچوونی خۆت نیت و نەبوویت و ناشبیت, وەك لەمەودوا زیاتر پێچەوانەی قسەکانت دەردەکەوێت!.

٣. هەر لە لاپەڕە(١٦و١٩٥) ئەم فەرموودەیەشی هێناوەتەوە, کە فەرموودەکە ئاوەهایە (الشؤم فی المرأة و الدار و الفرس).

---

* مەریوان (ابن کثیر) بە سەرچاوە موعتەبەرەکان نەزانێ و بۆ دەمکوت کردنی بەرامبەرەکانیشی دەیکاتە سەرچاوە, چونکە لە لای ئەوانیش زۆر موعتەبەرە.

**مەریوان هەڵەبجەیی: سێکسو شەرعو ژن لە مێژووی ئیسلامدا, ل٦.

[٥] (ابن کثیر) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە.

مەریوان هەڵەبجەیی: هەمان سەرچاوەی پێشوو, ل٦٧.

مەریوان نوسیویەتی: "نەگبەتی لە سێ شت دایە: ژن, خانوو, ئەسپ".

دەڵێین:

مەریوان مەبەستی لەوەیە, کە گوایە ئیسلام ئافرەت بە مایەی نەگبەتی دەزانێت, ئەم جۆرە بۆچوون و ڕاڤە سەرپێیانە وا لە زۆرێك لە خەڵکی دەکات کە بەهەڵەدا بچن, چونکە ئایەت و فەرموودە زۆر کات دەبێ ڕێکبخرێن لە رووی واتاوە, کە ئەمەش نەریتی زانایانە, دەنا هەرکەس بێت و ئایەتێك, یان فەرمودەیەك بهێنێت و بە تەنها ڕاڤەی بکات, ئەمە کارێکی نادروستە. پاشان ئەگەر ژن مایەی نەگبەتی بێت, وەك مەریوان دەیخاتە مێشکی خەڵکییەوە لە ڕوانگەی ئەم فەرموودەیەوە, دەبێت (خانوو, ئەسپ)یش هەروا بن, کە ئەمەش وەها نییە.

کەواتە دەمێنێتەوە سەر ڕاڤە ڕاستەکە ئەویش ئەوەیە, ئەگەر (ئافرەتەکە ئافرەتێکی خراپ بێت بۆ مێردەکەی, خانووەکە خانوویەکی ناساز بێت, ئەسپەکەش ئەسپێکی بێ سوود بێت). ئەمەش لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ: "من سعادة ابن آدم ثلاثة: المرأة الصالحة, والمسكن الصالح, والمركب الصالح"[٦].

واتە: "سێ شت لە خۆشبەختی نەوەکانی ئادەمە: یەکەم, ئافرەتێکی باش. دووەم, خانوو و جێگەیەکی باش. سێهەم, سوارییەکی باش".

ئەمە جگە لەوەی کە شت بەشوم دانان (شرك)ە, وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: "الطيرة من الشرك". هەر بۆیە دەبێت ئەم فەرموودەیە ئاوەها ڕاڤە بکرێ کە کردمان.

٤-لە لاپەڕە (٢٠)دا دەڵێ: "ئەم پیرۆزی و باوەڕە قوڵە ئەو ژنانەمان بیردەخاتەوە کە بەناوی خواو ئیسلامەتی و باوەڕو هەڵوێستی پیرۆزەوە خۆیان پێشکەش بە پەیامبەری ئیسلام دەکردو ئەویش بەبێ هیچ ڕێو ڕەسمێکی مارە برین لەگەڵیان جووت دەبوو". دوایی لە پەراوێزەکەدا ئایەتی (٥٠ الاحزاب)دێنێ و خەتێك دەکێشێ بەو جێگەیەدا, کە ئاماژە بەوە دەکات "ئەگەر ئافرەتێکی باوەڕدار خۆی بەخشییە پێغەمبەر".

دەڵێین:

ئەمە وا دەردەخات کە پێغەمبەر ﷺ شتی وەهای کردووە, بەڵام ئەمە وانییە:

١-ئایەتەکە مەرجی داناوە دەفەرموێ: ﴿إن أراد النبي أن يستنكحها﴾الاحزاب/٥٠.

ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ویستی بێت کە بیخوازێت.

٢-تەحەددای مەریوان دەکەم, تەنها یەك گێڕانەوەی ساغ و دروست بهێنێ کە ئافرەت لەو جۆرە هاتبێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و(جووتبوونی لەگەڵدا) کردبێت, بێگومانیشم کە مەریوان ناتوانێ شتی وا بکات, چونکە بوونی نییە.

ڕاستە ئافرەت هەبووە, کە هاتووە خۆی ببەخشێتە پێغەمبەر ﷺ ,بەڵام قبوڵی نەکردووە, ئایەتەکەش پێغەمبەری سەرپشك کردووە, هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ شتی وەهای لەو جۆرەی کە (مەریوان) دەڵێ نەیکردووەو ئەنجامی نەداوە.

٥- لە بارەی (منارە)ی مزگەوتەوە, مەریوان لە لاپەڕە (٢٢)دا, دەڵێ: "ئەم جۆرە پەرستگایانەش ئەو ڕەخنەگرانەمان بیردەخەنەوە کە مزگەوتەکانی ئیسلامی پێ دەشوبهێنن و دەڵێن: ئیسلامییەکان بەوێنەی عەورەتێك و جووتێك گون منارەیەکیان بەرزکردۆتەوە ......".

دەڵێین:

یەکەم: (منارە) لە ئیسلامدا کارێکی داهێنراو (بدعة)ە, لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ و جێنشینە بەڕێزەکانیدا شتی وا نەبووە, تا ئەم شوبهاندنە ڕاست بێت.

دووەم: کام ڕەخنەگر؟, باوەڕ ناکەم ئەوەی تۆزێك ڕێزی تیا بێت, بۆچوونی وا دەربڕێت, ئەم بۆچوونە تەنها لە کەسێکەوە دەردەچێت, کە هەموو شتێ هەر بە (سێکس) بزانێ و مێشك و چاوو دڵی بەردەوام لای ئەو شتانە بێت.

---

[٦] رواه احمد وصححه ابن حبان والحاكم. فتح الباري: ج٦, ص٧٣، ج٩, ص١٥٨.

بەسەرهاتێك:

(برادەرێك هەبوو زۆر حەزی لە ژن بوو چەند جار ئەیوت: وەڵڵاهی ئەوەندە حەزم لە ژنە (عەلاگە)ش بەتەنافی سەربانەوە ببینم وائەزانم ئافرەتە).

ئەم برادەرە لەو کەسانەی کە مەریوان باسیان دەکات زۆر باشترە, بەس نییە وەك "مەریوان و برادەرە ڕەخنە گرەکانی!" نەیشوبهاندووە بە شتێکی سەیر.

٦– لە لاپەڕە (٢١) لە بارەی ئەو ئافرەتانەی خۆیان پێشکەش کرد بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: "جوانەکانی هەڵبژاردو ناشرینەکانی پێشکەش بەو پیاوانە دەکرد کە لە تەکیەکەیدا دانیشتبوون".

پاشان بەسەرهاتێك دەهێنێ, کە پێمخۆشە ئێوەش شاهیدبن, بزانن, تاچەند ئەو قسەیەی لەگەڵ ئەم بەسەرهاتە یەکدەگرێتەوە, ئەمەش دەقەکەیە:

" أن امرأة جاءت رسول الله (صلى الله عليه وسلم), فقالت: يا رسول الله جئت لأهب لك نفسي, فنظر اليها رسول الله (صلى الله عليه وسلم), فصعد النظر اليها و صوبه, ثم طأطأ رأسه, فلما رأت المرأة أنه لم يقض فيها شيئا جلست..."[٧].

واتە: ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و پێی وت: "ئەی پێغەمبەر هاتووم تا خۆمت پێشکەش بکەم, پێغەمبەریش ﷺ چەند جارێك سەیری سەرو خواروی باڵای ئافرەتەکەی کرد, پاشان سەری نەوی کردو هیچی نەوت, ئیتر کاتێ کە ئافرەتەکە زانی هیچ بڕیارێك لەو بارەیەوە نادات دانیشت".پاشان وەك لە درێژەی باسەکەدا هەیە دوایی لەهاوەڵێکی مارە دەکات.

جا ئەمە شتێکی تێدایە, کە ئایا ئافرەتەکە جوان بووە یا ناشرین, کێ لەوێبوو؟, یان بە قەولی چ ڕاڤەکارێك مەریوان ئەم ئەنجامە گرنگەی بۆ دەرکەوت؟, جگە لەوەش وەك لە پێشەوە باسمان کرد, پێغەمبەر ﷺ هیچ ئافرەتێکی لەم جۆرە قبوڵ نەکردووە, چ جای جوانی و ناشرینی!!!

ئاخر مەریوان خۆی دەڵێ: "ئەوەندە بەسە کە ئیسلام وەك خۆی وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی و ئەم کتێبەو کتێبەکانی دیکەشم چەند دانەیەکن لەو هەوڵانە".

بەڕاستی وانییە و دەیان جاریش نەت پێکاوە.

٧–لە لاپەڕە(٢٧) دەڵێ: "ئەگەر بەناو دەقەکانی ئیسلام, قورئان و فەرمودە ڕۆبچین, دەبینین دیاردەیەکی لەو شێوەی کە ئەوروپاو یانەو باڕەکانی شارەکان هەیانەو بە سۆزانییەت و لەشفرۆشی بەناوبانگە, لەناو ئیسلامیشدا هەیەو بەناوی ئیسلام و شەرعەوە, بەو پەڕی باوەڕەوە, بە کردەوە پیادە دەکرێ...".

دەڵێین ئەمەش یەکێکی ترە لە شێواندن و ناشرین کردنی دەقەکان, لەوانەیە لە ڕوانگەی (مەریوان)ەوە وا بێت, چونکە لەلای ئەو, هەرچی لە دوور, یان نزیك بە لای سێکس و ئافرەتدا....تاد, بڕوات وا لێکی دەداتەوە, ئەمەش لە نوسینەکانی ئەو کتێبەیدا بە ڕوونی دیارە.

٨– لە لاپەڕە (٤٧)دا, دەڵێ: "ئەگەر چی جیاوازی و ناکۆکی لە نێوان تەورات و قورئاندا لە هەندێ شوێنی لاوەکیدا هەیە, بەڵام هەردوولا لە سەر ئەوە هاوڕاو کۆکن کە ئیسماعیل بە نایاسایی لە دایك بووە.....".

دەڵێین:

کام دەقی قورئانی هەیە باس لەوە بکات, کە (ئیسماعیل) زۆڵ و نایاسایی بێت, لە قورئاندا ئەوەی ئەندازەیەك عەقڵی هەبێت, شتی وای بەرچاو ناکەوێت, خوا هیچ کات کاری وا ناکات کەسێ زۆڵ بێت, لە بارەیەوە بفەرموێ: (واذكر في الكتاب اسماعيل انه كان صادق الوعد وكان رسولاً نبياً) مريم/٥٤.

---

[٧] رواه البخاري, كتاب النكاح, رقم (٥١٢٦).

واتە: ئەی موحەممەد ﷺ لەم قورئانەدا باسی (ئیسماعیل) بۆ خەڵکی بکە, کە لە بەڵێنەکاندا ڕاستگۆ بووەو پێغەمبەرو نێردراویش بووە.

خۆ ئەگەر قورئان تەنها (مصحف)ێك بوایەو لای تەنها مەریوان بووایە, دەگونجا ئەم قسەیە ڕاست بوایەو باوەڕی پێبکرایە, بەڵام ئێستا کە بە هەزاران نوسخە بوونی هەیەوخوێندەواری باش و چاکیش هەیە, دەزانرێ ئەم قسەیە دوورە لە ڕاستیو تەنها مەبەست ناشرین کردنی کەسە پاکەکانە. ئەگەرنا با نیو ئایەت, یان عیبارەتێکی قورئانی لەسەر ئیسماعیل بهێنێ, کە بە نایاسایی لەدایکبووە, ئەمە جگە لەوەی کە لە بەشێکی سەربەخۆدا لەسەر پێغەمبەران و خێزانەکانیان بە درێژی لەو باسە دەدوێین.

٩-لە هەمووی سەیرترو پێکەنیناویتر ئەوەیە, کە لە لاپەڕە(٥٠)دا, لە بە کوردی کردنی دەقی قسەی هاوەڵێکدا کردویەتی, لە پەراوێزەکەشدا دەقە عەرەبییەکەی هێناوە, مەریوان هاتووە بەم جۆرە کردویەتی بە کوردی و نوسیویەتی: "(أبی جحیفة وهب السوائی) باسی ڕوخساری پەیامبەر دەکاو دەڵێ: کە پەیامبەرم بینی مووی سەری سپی بوو بوو, لە چەناگەشیدا سپێتیم بینی, ئەوەی گوێبیستی ئەم قسەیە بوو گومانی لە ڕاستییەکەی هەبووە, چونکە لە تەمەندا نەبوو, بۆیە پرسیاری لێکرد: ئەو ڕۆژە تەمەنت چەند بوو؟ ئەویش لە وەڵامیدا پێیان دەڵێت: تیرم ئەتاشی و ئەمکرد بە پەڕدا". واتا: (سەری کێرم ڕەق ئەکردو ئەمکرد بە قوزدا).

دەڵێین:

خەڵکینە وەرن با دەقە عەرەبییەکە سەیر بکەین و بیخوێنینەوە:

(أبی جحیفة) دەڵێ: "رأیت رسول الله هذه منه بیضاء, (ووضع زوهیر أصابعه علی عنفقته), قیل له: مثل من أنت یومئذ؟ قال: (أبري النبل و أریشها)"[٨].

واتە: پێغەمبەرم بینی ئا ئەمەی لێی سپی بووبوو, (زوهەیر) کە یەکێکە لە ڕاوی نێو ڕشتەکە (پەنجەکانی خستە ژێر لێوی خوارەوەی), بە (أبي جحیفة) وترا: تۆ ئەو ڕۆژە وەك کێ دەبووی؟ ئەویش وتی: "تیرم چاك دەکردو ئەمسەرو ئەوسەری تیرەکەم سازدەکرد".

-پێشەوا (نەوەوی), کە بەناوبانگترین ڕاڤەکارەکانی (صحیح مسلم)ە, ئاوها پێناسەی (أبری النبل وأریشها) دەکات و دەڵێ: (أبری النبل و أریشها)واتە: پەڕم بۆ تیرەکان دادەنا[٩].

-(ابن أثیر), کە یەکێکی ترە لە ڕاڤەکارانی فەرمووده, بە تایبەت ئەو وتانەی کە نامۆن لەڕاڤەی ئەم قسەیەدا دەڵێ: (أبری النبل وأریشها) أي: أنحتها وأعمل لها أریشها, واتە: تیرم دەتاشی و پەڕم بۆ دادەنا[١٠].

لەبارەی (النبل) دەڵێ: والنبل: السهام العربیة[١١]. واتە: تیری عەرەبییە.

کەواتە مەبەستەکەی (أبی جحیفة) ڕوونە, کە ئەو کاتەی پێغەمبەری بینیوە لە تەمەنێکی وادابووە, کە بتوانێ (تیر) دروست بکات و پەڕیشی بۆ دابنێ.

جا تۆ بڵێی مەریوان لە (نەوەوی) و (ابن أثیر) زاناتر بێت بە زمانی عەرەبی؟ تا بەو جۆرە باس لە "کێرو قوز" بکات و ئەوان نەیان زانیبێت و ئەو دەرکی بەو واتا گرنگە کردبێ؟!, نەخێر, کارەکە لەمە زۆر بەدەرە, بەڵکو مەریوان هەوای (سێکس و ئافرەت و...) لێیداوە, هەموو شتێ بەو ڕەنگە دەبینێ و هەر واش تێیدەگات, لای ئەو هەموو "سمێڵ سور"ێك (هەمزە ئاغا)یە, ئەم قسەو ڕاڤەیە سادەترین کەس کە بە زمانی عەرەبی ئاشنا بێت, هیچ کات وا نە ڕاڤەی

---

[٨] رواه مسلم رقم (٦٠٣٣)، والبخاري رقم (٣٥٤٥).

[٩] بڕوانە: شرح صحیح مسلم للنووي, رقم الحدیث (٦٠٣٣).

[١٠] النهایة فی غریب الحدیث والاثر, ج٢, ص٢٨٩ مادة: ریش.

[١١] هەمان سەرچاوە, ج٥, ص١٠.

دەکات و نە ئاوەهاش لێکی دەداتەوە، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە هەر لەناو دەقی قسەکەی (أبی جحیفة)دا چەندین هەڵەی زەقی کردووە.

١-باسەکە باسی سپی بوونی مووی ژێر لێوی خوارەوەیە، کە بە عەرەبی پێی دەوترێت (عنفقة)[11]، بەڵام مەریوان باسی (مووی سەر) دەکات!!.

٢-لەو دەقەدا باس لەوە نەکراوە، کە ئەم قسەیە ڕاستە، یان ناڕاست، کەچی ئەو هاتووە ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: "ئەوەی گوێ بیستی...". ئەمەت لە کوێ هێنا؟ یان باسەکە ڕق و تووڕە بوونە لە شوێنکەوتوانی پەیامی ڕاستی و ڕووناکی!، بۆیە ئاوەها لێکدانەوەی سەقەت بۆ قسەو وتەی شوێنکەوتوانی ئیسلام دەکەی.

٣-خۆزگە لە لێکدانەوەی قسەکانی کۆتایدا، ئاماژەی بە وتەی کەسێکی شارەزا لە زمانی عەرەبی بکردایە.

بڕوابکەن، تەنانەت زۆر هەوڵمدا لەسەرچاوەکاندا، تا بزانم ئەو وشانە بۆ ئەو جۆرە کارانە بەکارهاتوون، بەڵام بەرچاوم نەکەوت و هەر بەلاشیاندا نەچوو.

دەڵێن: "ئەگەر بزن نەگبەتی گرتی نانی شوان دەخوات".

منیش دەڵێم: بەڕاستی کەسێ نەگبەتی بیگرێ، هەر شتێکی تر بکات، لەوانەیە بۆی بچێتە سەر، بەڵام کەسێ بە ئیسلامەوە بیگرێ، بەڕاستی زۆر شتی سەیری لێ ڕوودەدات، لەوانە: "بزرکان" و "خەڵەفاویی". جا مەریوان لەم کتێبەی و تەواوی نوسینەکانی پێشووتریشیدا، ئەم دوو دیاردەیەی زۆر بەئاشکرا پێوە دیارە، بەردەوام بن لەگەڵمدا تا شتی سەیرتر ببینن.

١٠-لە لاپەڕە (٥٨) ئاوەها ڕاڤەی ئەم بەشە لە ئایەتی(٣٦)ی سورەتی (البقرة) ﴿فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا﴾ دەکات.

مەریوان دەڵێ: "بەهۆی لەخشتەبردنی حەواوە بەخواردنی سێوێك ئادەمیش لەخشتەبرا".

دەڵێین:

(ابن كثير) دەڵێ: "دروستە ئەو زەمیرەی لە (عنها)دایە بگەڕێتەوە بۆ (الجنة)، ئەو کات واتاکەی وا دەبێ: "شەیتان ئادەم و حەوای دوورخستەوە"، وەك (عاصم) خوێندوێتییەوە (فأزالهما)، دروستیشە زەمیرەکە بگەڕێتەوە بۆ نزیکترین باسکراو کە (الشجرة)یە، ئەوکات واتاکەی وەك (حسن) و(قتادة) دەڵێن: لە ڕووی هەڵەوە."[13]

جا وەرن ببینن:

١- لە دوورو نزیك ڕاڤەکەی مەریوان پەیوەندی بە واتای ئەو بەشە ئایەتەوە نییە.

٢- سێو خواردن، یان پرتەقاڵ خواردن، ئەمە هیچ بنەمایەکی دروست و ساغی لەسەر نییەو خوای گەورە نە لە قورئانداو نە لە فەرموودەی ساغدا، بەڵگەی بۆ بەندەکانی دیاری نەکردووە، کە ئەو دارە چ دارێك بووە، وەك (طبری) دەڵێ و(ابن كثير) ئەم وتەیەی باس دەکات[14].

١١-لەلاپەڕە (٦٢)دا، لە باسی (یوسف) پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەربێت)، ئایەتی (٢٣و٢٤)ی سورەتی (یوسف) دەهێنێ و ڕاڤەی دەکات و لە سەر بڕگەی "ولقد همت به وهم بها" خەتێکی بەژێردا هێناوە، پاشان لە ڕاڤە کردنەکەیدا نوسیویەتی: "....ژنەکە زیاتر لێی نزیك دەبێتەوەو خۆی لە یوسف هەڵدەسوێ، بەمەش هەوەس و ئارەزوی سێکسییانەی ژنەکە بۆ یوسف (همت بە) و یوسف بۆ ژنەکە (هم بها) دەجوڵێ (لەوەدا دەبن کە جووت بن.....".

دەڵێین:

١-لە هیچ کون و کەلەبەرێکی ئایەتەکەدا باسی "تێ هەڵسواندن" نەکراوە، ئەمە تەنها تێچنینی مەریوانە و بەس!.

---

[12] بڕوانە: فتح الباری، ج٦، ص ٦٣٧.

[13] ج١ فی تفسیر هذه الآیة.

[14] تفسیر ابن كثير، ئایەتی (٥٣).

٢ -خوای گەورە تەنها لەبارەی (یوسف) سەلامی خوای لەسەر بێت, هەر ئەوەندە باس دەكات (وهم بها)واتە (یوسف)یش ختورەی لە دڵدا دروست بوو بۆ لای ئافرەتەكە, ئیتر "لەوەدا دەبن كە جووت بن" ئەمە شێواندنە بێ سەروبەرەكانی مەریوانەو هیچی تر.

١٢ -لەلاپەڕە (٦٣)دا, لەبارەی (ئیبراهیم) سەلامی خوای لەسەر بێت و ساراو هاجەری خێزانی, مەریوان باس لە بەسەرهاتی (ئیبراهیم)و هەردوو هاوسەرەكەی دەكات. پاشان لەلاپەڕە (٦٤) لە پەراوێزەكەدا, وەك سەرچاوە نوسیویەتی: "صحیح البخاری: باب یزفون النسلان فی المشی".

مەریوان دەڵێ: "سوێند دەخوات (واتە سارە سوێند دەخوات) سێ ئەندام لە لەشی هاجەر ببڕێ.....". "خۆی دەشارێتەوە لە دوایدا ئیبراهیم و هاجەر یەك دەگرنەوە تا منداڵەكەی دەبێ‌و ناوی دەنێن ئیسماعیل".

دەڵێین:

لەسەر ئەو دوو دێڕ نوسینە دەڵێم: ئەوە (صحیح البخاری) ژمارەی فەرموودەكە (٣٣٦٤)ە, با مەریوان و خەڵكی تریش سەیر بكەن, بزانن لە كوێی ئەو فەرموودەیەدا باس لە:

أ-سوێند خواردنی (سارە) دەكات؟.

ب-بڕینی سێ ئەندام لە لاشەی (هاجەر) لەكوێدا باسی هاتووە لە نێو فەرموودەكەدا؟.

ج-خۆشاردنەوەو یەكگرتنەوەی (ئیبراهیم و هاجەر) دەكات؟.

د-ناونانی منداڵەكەیان كوا باس كراوە؟.

١٣ -هەر لەسەر ئەم باسە لەلاپەڕە (٦٤) نوسیویەتی: "لە بیابانی كاكی بە كاكی و وشك و (بێ نان و ئاو)و بێ سێبەر جێیان دەهێڵێ".

دەڵێین:

خەڵكینە لە فەرموودەكە هاتووە "..ووضع عندهما جرابا فیه تمر و سقاء فیه ماء...". (ئیبراهیم) جەوەنەیەك كە خورمای تێدا بوو, كوندەیەك كە ئاوی تێدا بوو لەلای (هاجەرو ئیسماعیل) داینا.

ئەمەی كە مەریوان دەیكات لە شێواندن و فێڵكردن لە دەقەكاندا, ئێوە ناوی چی لێ دەنێن؟! خۆ هەر خۆی ناوی سەرچاوەكەی نوسیوە, ئەی بۆ وەك خۆی باسەكە ناهێنێ؟.

مەبەستی ئەوەیە تا بڵێن: سەیری (ئیبراهیم) بكەن چەندە بێ ویژدانە, ئاخر ئافرەت و منداڵێك, بەبێ خواردن و خواردنەوە, چۆن لەو بیابانەدا دادەنرێن!.

بەڵام, مەریوان خەیاڵ پڵاوی لەم جۆرە زوو ئاشكرا دەبێت و خەڵكی هەروا جارێكی تر بەئاسانی خۆڵ ناكرێتە چاویان, لەبەرئەوەی ئەو فەرمودەیەی كە باسی (ئیبراهیم و هەردوو هاوسەرەكەی) دەكات, دوورو درێژ بوو, بۆیە نەمهێناو تەنها بە ئاماژە بە جێگەو ژمارەكەی وازم هێنا.

تێبینی:

لەلاپەڕە (٦٤)دا, دەڵێ: "بیرمان نەچێت لەسەرەتادا باسمان كرد ئیبراهیم دووجار (لایشپان)ی سارای ژنی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەكارهێناوە".

پشت بەخوا ئەم باسەو تەواوی ئەو باسانەی لە لاپەڕە (٣٥تا٤٧) نوسیویەتی, هەر لەم كتێبەدا باسێكی تایبەتی بۆ تەرخان دەكەین, چونكە سەرچاوەكانی غەیری سەرچاوەی ئیسلامەو ئیسلامیش قسەی خۆی لە سەر ئەو سەرچاوانە هەیە.

١٤-خوای گەورە بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَعْجَبْ فَعَجَبٌ قَوْلُهُمْ أَئِذَا كُنَّا تُرَابًا أَئِنَّا لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْ وَأُوْلَئِكَ الأَغْلاَلُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ الرعد/٥.

واتە: ئەی موحەممەد ﷺ ئەگەر تۆ سەرسامی لەوەی ئەو بێباوەڕانە لەگەڵ ئەوەی ئەو هەموو بەڵگانە بە چاو دەبینن, بەڵام باوەڕ ناهێنن. لەمە سەیرتر ئەوەیە کە دەڵێن: ئەگەر ئێمە بووینەوە بە خۆڵ ئایا جارێکی تر سەر لەنوێ دروست دەکرێینەوە!؟.

مەریوان, لە لاپەڕە (٦٥)دا, لە باسی ئەو فریشتانەی کە دەچنە ماڵەکەی (لوط) پێغەمبەر سەلامی خوای لێ بێ, لە ڕاڤەی ئایەتی (٧٧و٧٨) سورەتی (هود)دا, شتێکی زۆر سەیر دەنوسێ و دەڵێ: "...لووت زۆر دڵتەنگ بوو, نەیزانی فریشتەن, وای زانی ئەم لاوە جوان و لوسکەلانە بۆ کاری سێکسی هاتوون بۆ لای".

دەڵێین:

ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ ولما جاءتْ رسلنا لُوطًا سِيءَ بِهِمْ وضاق بِهِمْ ذَرْعا وقَالَ هذَا يوْم عصِيب﴾ هود/٧٧.

(ابن كثير) دەڵێ: "هاتن بۆ لای (لوط) سەلامی خوای لەسەر بێت, وەك هەندێ دەڵێن: (لوط) ئەو کاتە لەسەر پارچە زەوییەکەی خۆی بوو, هەندێکی تر دەڵێن: لە ماڵی خۆی بوو, فریشتەکان هاتنە لای لەسەر جوانترین وێنە, لەسەر شێوەی کۆمەڵە گەنجێکی دەم و چاو جوان....(لوط) بەهۆیانەوە ناڕەحەت و دڵتەنگ بوو, ترسا (ئەگەر ئەم میواندارییان نەکات و نەیان باتەوە بۆ ماڵەوە, ئەوا کەسێکی تر لە هۆزەکەی دەیان باتەوەو توشی خراپەیەکیان دەکات"[١٥].

(قورتوبی) لە سەر ئەو ترسەی (لوط) دەڵێ: "بۆیە (لوط) ترسی لێ نیشت و دڵتەنگ بوو, چونکە ئەوانی بینی کە چەند جوانن و هەروەها خراپەی نەتەوەکەشی دەزانی کە چەندە خراپن"[١٦].

لە تەفسیری (الجلالين)دا دەڵێ: "دڵتەنگ بوو بەهۆی ئەوانەوە, چونکە ئەوان جوان بوون لە وێنەو سەرو سیمادا, کە لە شێوەی میواندا هاتبوون, بۆیە ترسا کە نەتەوەکەی بەرامبەریان کاری بکەن"[١٧].

مەریوان, لەو کاتانەی خۆی دەیەوێ و مەبەستێتی دەگەڕێتەوە سەر سەرچاوەیەکی وەك (ابن كثير)و تەفسیری (قورتوبی)و (جلالين), کەچی لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەو چەندین جێگەی تر کە لەمەودوا باسیان دەکەین, هیچ گوێی بەم سەرچاوەی ڕاڤانە نەداوە!.

پرسیار ئەوەیە, ئایا ئەوەی مەریوان نوسیویەتی لەبارەی ترسی (لوط) لەگەڵ ئەوەی کە ئەو کەڵە زانا موفەسیرانە لە بارەی ترسی (لوط)ەوە نوسیویانە یەکدەگرێتەوە؟ مەریوان, بەو عەرەبییە تەمو مژاوییەی کە هەیەتی, تۆ بڵێی لەو کەڵە زانایانە, کە مێژوو و نوسینەکانیان شایەتییان بۆ دەدەن لەسەر شارەزابوونییان بەتەواوی زمانی عەرەبی, لەوانە زاناتر بێت؟!.

بێگومان نەخێر, هەستی لەسنور دەرچووی سێکسیی مەریوان وای کردووە, وەك کابرای (کوێر) تەنهاو تەنها ڕەشایی ببینێت, ئاخر ئەگەر کەسێك لەناو زەلکاوی سێکسیدا نوقم نەبووبێت, ئاوەها ڕاڤەی ئەم جۆرە باسانە دەکات؟!.

١٥–لەلاپەڕە (٦٠) لەبارەی خێزانەکەی (لوط)ەوە لە ڕاڤەی ئایەتی (٨١) سورەتی (هود), ئاوەها ڕاڤەی ئەم ڕستەیەی کردووە "...انه مصيبها ما أصابهم...." دەڵێ: "ژنەکەت نەبێت, چونکە ژنەکەت وەك ئەوان توشی هەمان شێوە جنس (گاندان لە کونی دواوە) بووە...".

دەڵێین:

بەکام وتەی زانایان و چ ڕاڤەکارێك, ئەم ڕاڤەیەت کردووە؟ تا ئەوەندە لەخۆت ڕازی بیت, ئاوها ڕاڤەی وتەی کەسێك بکەیت, کە پیرۆزترین شتە بەلای باوەڕدارانەوە, تۆ نەخاوەنی پەیمانی خۆتی, نە خاوەنی قسەی خۆتی, نە خاوەنی

[١٥] بڕوانە: (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.

[١٦] القرطبي, ج٩, ص٧٤ .

[١٧] تفسير الجلالين, ص٣٠٢.

هەستی خۆشتی نەك (دووفاقی)، بەڵکو زیاد لەوەش بە بەرگت هێشتا کەمە، چونکە وەك خۆت بانگەشەی بۆ دەکەی شتەکانی کە دەیهێنیت پشت بەسەرچاوە ئیسلامییەکان دەبەستێت، بەڵام ئەم بانگەشەیە، جگە لە ناڕاستی هیچی تری تێدا بەدی ناکرێ. کامەتا سەرچاوەی ئەم ڕاڤەو لێکدانەوەیەت؟ بۆ نەگەڕایتەوە سەر (تەفسیری قورتوبی)، کە ئەو چۆن ڕاڤەی کردووە، وەك لەهەندێ باسی تردا ئەو سەرچاوەیەت کردووە بەسەرچاوە دیارەکانی خۆت.

بزانە (قورتوبی) لە ڕاڤەی ئەو بەشەدا ئاوا دەڵێ: "(انه مصيبها) أي من العذاب"[١٨].

واتە: تەنها ژنەکەت نەبێ، چونکە ئەویش ئەو سزایەی کە خوا بۆ نەتەوەکەت دەینێرێ ئەویش دەگرێتەوە.

مەریوان، یەکێك لە سەرساماترین بێئاگایی، کە تووشی براکانی (یوسف) بوو ئەوە بوو، کاتێ کە خستییانە نێو بیرەکەوەو کراسەکەیان خوێناوی کرد بە باوکییان وت: گورگ خواردویەتی (أكله الذئب)، بەڵام نەیانزانی کراسەکە بدڕێنن.

تۆش کەوتویتە هەڵەی گەورەی وەهاوە، ناتوانی چۆن خۆت قوتار بکەیت، ئاخر ئەگەر ویستت چاوبەست بکەیت!، هیچ نەبێت ڕێگەیەك بگرە کە یەکسەر لە ڕێگەوە کارەکانت (ئاوەڕووت) نەکرێت، ئەوەی بیەوێت لاسایی وشتر مەل (نەعامە) بکاتەوە، وەك ئەو چۆن هەڵدەخەڵتێ، ئەویش ئاوەها هەڵدەخەڵتێ، ئەگەر تۆ سەریشت نوقمی زەوی کەیت، زۆرت بەدەرەوەیە تا بەرامبەرەکەت بتبینێ!!!.

١٦–لەلاپەڕە (٦٧) دەڵێ: "بەهەمان شێوە لە سورەتەکانی (النمل)، ئایەتەکانی ٥٤و٥٨، (التحريم) ئایەتەکانی ٩و١٠ لە هەموو ئایەتەکانیشدا زۆر بە ڕوونی ئەوە دەرکەوتووە، کە ژنەکەی (لووت) لە کونی دواوەی سێکسبازی کردووە".

دەڵێین:

ئایەتی(٥٤)ی سورەتی (النمل) ئەمەیە: ﴿ ولُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَتأتونَ الْفَاحِشةَ وأَنتمْ تُبصِرونَ﴾.

(ابن كثير) دەڵێ: "خوای گەورە لەبارەی بەندەو ڕەوانە کراوی خۆی (لوط) سەلامی خوای لێ بێ، هەواڵ دەدا کە ئاگاداری نەتەوەکەی خۆی دەکات، کە سزای خوایان توش دەبێت بەهۆی ئەو کارە نەشیاوەی کە پێش ئەوان هیچ کەسێ ئەمەی نەکردووە، ئەویش بریتییە لە چونە لای نێرینە، ئەمەش خراپەیەکی زۆر گەورەیە، .... ( أتأتونَ الْفَاحِشةَ وأَنتمْ تُبصِرونَ). واتە: ئێوە لە پێش چاوی یەکدا کاری ناڕەوا دەکەن[١٩].

–ئەوە ئایەتەکەو ئەوەش وتەی بەناوبانگترین موفەسیری قورئان، جا قسەکەی (مەریوان) بۆ خۆی، وەك دەڵێن:ماڵی قەڵب سەر خاوەنەکەیەتی.

–لە هەمووی سەیرتر مەریوان ئایەتی (٥٤) سورەتی (النمل) دەکاتە بەڵگە، بەڵام هەر دوا ئەم ئایەتەو لە ئایەتی (٥٥) سورەتی (النمل) زۆر بە ڕوونی ئەوە دەرکەوتووە، کە ئەوان ناچنە لای ئافرەت، ئەویش ئەوەیە: ﴿أَئِنكُمْ لَتَـأتونَ الرجالَ شَهْوةً من دون النساء بلْ أَنتمْ قَوْم تجْهلُونَ﴾.

واتە: ئێوە وەك ئارەزوو دەچنە لای پیاوان و ناچنە لای ئافرەتان بەڕاستی ئێوە گەلێکی نەزانن.

مەریوان، ئەمەی نەبینی؟ یان لە واتای "من دون النساء" تێناگات؟!.

ئایەتی (٥٨) هەمان سورەت ئەمەیە: ﴿ وأَمطَرْنا علَيهم مطَرا فَساء مطَر الْمنذَرِين﴾.

واتە: وە ئێمە بارانمان بە سەریاندا باران بارانێك (واتە بەرد) بە ڕاستی بارینێکی خراپ بوو بۆ ئاگادار کراوەکان[٢٠].

لەبارەی ئایەتەکانی(٩و١٠) سورەتی (التحریم)، کە دەفەرموێت: "ئەی پێغەمبەر بجەنگە لەگەڵ بێباوەڕان و دووڕووەکانداو توند بە لە سەریان ئەوان جێگەیان دۆزەخە، بەڕاستی دۆزەخ خراپترین داهاتوو سەرئەنجامە".

ئایەتی(٩) ئەمەیە: ﴿ يا أَيها النبِي جاهِدِ الْكُفَّار والْمنافِقِين واغْلُظْ علَيهِمْ ومأْواهمْ جهنم وبِئْس الْمصِير ﴾.

---

[١٨] تفسير القرطبي، اية (٨١) سورەتی هود.

[١٩] ابن كثير، تفسيری ئایەتی (٥٤) سورەتی النمل.

[٢٠] بڕوانە: ابن كثير، مختصر تفسير الطبري، ئایەتی (٥٨) سورەتی (النمل).

ئەمە هەموو لایەك دەزانێ كە بە هیچ جۆرێ دەست نادات بۆ بەڵگەسازییەكەی مەریوان لەسەر بوختانەكەی.

-ئایەتی (١٠) ئەمەیە: ﴿ ضرب الله مثلًا للذين كفروا امرأة نوح وامرأة لوط كانتا تحت عبدين من عبادنا صالحين فخانتاهما فلم يغنيا عنهما من الله شيئًا وقيل ادخلا النار مع الداخلين ﴾.

(ابن كثير) دەڵێ: "خوای گەورە نموونە بۆ بێباوەڕان دێنێتەوە، واتە لە تێكەڵاو بوونی بێباوەڕان بە موسڵمانان و هەڵسوكەوت كردن لەگەڵیاندا، ئەمە هیچ سودێك بە بێباوەڕان ناگەیەنێت لەلای خوای گەورە، پاشان دێتە سەر نموونەكە (امرأة نوح و امرأة لوط...) كە ئەم دوو ئافرەتە لەگەڵ دوو پێغەمبەری خوادا ژیانییان بردە سەر و شەوو ڕۆژ هاوەڵێتیان دەكردن...(فخانتاهما) بەڵام ئەوان لەباوەڕو ئیماندا ناپاكییان كردو باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتییەكەیان نەهێنا"[21].

-(راغب ئەسفەهانی) دەڵێ: "الخيانة" و"النفاق" یەكێكن، بەڵام ئەوەندە هەیە كە "الخيانة" بۆ پەیمان و ئەمانەت دەوترێ و"نیفاق"یش بۆ دین بەكاردێ، پاشان تێكەڵ دەكرێن و (بۆ واتای یەكتر بەكاردێن)، كەواتە (خیانەت) سەرپێچی ڕاستییە بە هەڵوەشاندنەوەی پەیمان بەنهێنی....پاشان چەند ئایەتێك دێنێت، یەكێ لەو ئایەتانە كە دەیهێنێت ئایەتی(١٠)ی سورەتی (التحريم).ە[22] كەواتە: "زۆر بە ڕوونی"یەكەی مەریوان بە با چوو.

١٧ -لە لاپەڕە (٦٧و٦٨)دا چەند ئایەتێك لە سورەتەكانی (الواقعة١٧-٢٤)، (الانسان١٢و١٩) و(الطور٢٤)، دەهێنێ و ڕاڤەیان دەكات، دوایی وەك پیشەی هەمیشەیی بۆچونێكی سەقەت بە زمان و واقیع دەردەبڕێت و وادەردەخات، كە لە بەهەشتیشدا كاری نێربازیی لەگەڵ منداڵی لوسكەدا هەبێت، پاشان لە لاپەڕە (٦٩)دا، باسی چەمكی "خزمەتكار" دەكات و دەڵێ: "چەمكی خزمەتكردنیش ماناو واتاو دەلالەتی خۆی هەیە، خزمەت تەنها بە مانا ڕوكەشەكەیەوە ناوەستێ (لەش بەشێكە لە خزمەت پێكردن)".

دەڵێین:

ئەمە بوختان و درۆو دەستوەردانە لە دەقێكی پیرۆز.

١ -ئەگەر ڕاستە مەریوان شت دەزانێ و ئاگادارە بەسەرچاوە ئیسلامییەكان، بۆ تەنها یەك (قيل)یشی نەهێنا لە تەفسیرە موعتەبەرەكان!!!.

٢ - دیارە خزمەتكردن بەلای (مەریوان)ەوە وایە، واتە گەر كەسێ بووە خزمەتكارو بەردەستی كەسێ دەبێ كاری جووتبوونیشی لەگەڵدا بكرێ، ئەمەش پێچەوانەی واقیع و ئەوەیە كە ڕۆژانە خەڵك دەیبینن، خەڵكینە چ كەسێ، چ ژیرو فامیدەیەك ئەم بۆچونەی هەیە، جگە لە كەسێك كە سەراپای لە(سێكس)دا نغرۆ بووە؟!.

١٨ -كە باسی واتای (حجاب) دەكات لەلاپەڕە (٧٤)دا، چوار ئایەت دێنێت و ڕاڤەیان دەكات كە واتای (حجاب)ی تێدایە، بەڵام ئەوەندە داماوە ویستویەتی "فەلسەفە!" لێبدا، بەڵام پێی هەڵخلیسكاوە، بۆ نموونە:

ئایەتی(٤٥)ی سورەتی (الاسراء) ﴿وإذا قرأت القرآن جعلنا بينك وبين الذين لا يؤمنون بالآخرة حجابا مستورا﴾.

مەریوان، وا ڕاڤەی دەكات: "ئەوكاتەی كە قورئان دەخوێنیتەوە پەردەپۆشێكی (حجابا) نادیارو شاراوەمان خستۆتە نێوان تۆو ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە.

دەڵێین:

"پەردەپۆش" قسەی مەریوانە، دەنا (ابن كثير) دەڵێ: "واتە بەربەست". جا خۆت بڕیار بدە، قسەكەی مەریوان كە فری بە سەر زمانی عەرەبییەوە نییە، یان قسەكەی (ابن كثير)ی شارەزاو دانا بە زمانی عەرەبی هەڵدەبژێری!.

-لە ئایەتی(١٧) سورەتی (مريم) كە دەفەرموێ: ﴿فاتخذت من دونهم حجابا فأرسلنا إليها روحنا فتمثل لها بشرا سويا﴾.

[21] تفسير ابن كثير.

[22] مفردات الفاظ القرآن، ص٣٠٥.

هەر لە هەمان لاپەڕەدا, مەریوان دەڵێ: "جا لەنێوان خۆی و(پەیامبەر)و ئەواندا پەردەپۆشێکمان (حجابا) ڕایەڵ کردو...".

دەڵێین:

واتای ئایەتەکە لە ڕاستیدا ئاوەهایە: "مەریەم خۆی لە خەڵکەکە شاردەوەو ئێمەش (جبریل)مان نارده لای[٢٣]....".

کەواتە (حجاب) لێرەدا بەواتای (شاردنەوە)یە, نەك وتەکەی مەریوان.

جاوەرن باپێکەوە (بزڕکان)ەکانی مەریوان دیاری بکەین.

١-(فاتخذت) فعلی (ماضی)یەو ڕاناو(ضمیر)ی (مؤنث)ی پێیەوە لکاوە, واتە: مەریەم, مەریوان هاتووە دەڵێ: "جا....پەردەپۆشێکمان...".

ئەگەر قسەکەی مەریوان بێت, دەبوایە ئاوەها بوایە (فاتخذنا).

٢-وشەی (پەیامبەر) لە چ جێگەیەکی تەفسیردا هێناوتە؟ خۆ ئەگەر مەبەستی لە(عیسی) بێت. ئەوا (عیسی) ئەو کاتە لەدایك نەبووبوو, پاشانیش هیچ پێغەمبەرێك لەو کاتەدا لەگەڵ مەریەمدا لەو جێگەیەدا بوونی نەبووە!.

چەند شورەییە درۆو بوختان بەدەم شتێکەوە بکرێ, کە کەسی زۆر شارەزا قسەی لەسەر کردووە, بەمە مەریوان دەریخست کە نە (گەڕاوەتەوە سەر تەفسیرەکان) نە سادەترین ئاگاداریشی هەیە بە جیاکردنەوەی ڕاناو(ضمیر)ەکانی (مذکرومؤنث).

١٩-لەلاپەڕە (٧٨) دەڵێ: "بەپێی پەندێکی کۆنی عەرەب: باشترین عەتری پیاو لەوەدایە بۆنی هەبێ‌و ڕەنگی نەبێت, باشترین عەتری ژنانیش لەوەدایە ڕەنگی هەبێ‌و بۆنی نەبێت".

دەڵێین:

ئەمە پەندی کۆنی عەرەب نییە, بەڵکو فەرموودەی پێغەمبەرە کە دەفەرموێ: "طيب الرجال ما ظهر ريحه وخفي لونه, وطيب النساء ما ظهر لونه وخفي ريحه"[٢٤]

واتە: بۆنی خۆشی پیاو ئەوەیە کە بۆنی هەبێ‌و ڕەنگی نەبێت, بۆنی خۆشی ئافرەتیش ئەوەیە کە ڕەنگی هەبێت و بۆنی نەبێت.

لەسەر ئەمە تەنها ئەوە دەڵێم کە نە شارەزاییش بەو ئەندازەیە شتێکی باش نییە.

٢٠- لە لاپەڕە (٨٠) لە باسی (جلباب)دا دەڵێ: "بەڵام بەداخەوە لە نەزانینی خۆیان ڕاڤەکاران و فیقهییەکان وا ئەم ئایەتەیان وەرگرتووە کە فەرمان بە داپۆشینی دەم و چاو دەکات.....".

دەڵێین:

١- کە "دەڵێ ڕاڤەکاران و فیقهییەکان"....ئەمە هەم بوختانە, هەم درۆیە, چونکە تەنها ئەو قسەیەی مەریوان خەیاڵە, بەڵکو بە پێچەوانەوە (بۆچونی زۆربەی هەرە زۆری زانایان) لەسەر ئەوەیە کە (دەم و چاو) عەورەت نییەو داپۆشینی پێویست نییە, وەك:

-ابن رشد لە (بداية المجتهد)دا, دەڵێ: لەوانە: (أبو حنيفة, مالك, شافعی).[٢٥]

- گێڕانەوەیەکیش لە پێشەوا (ئەحمەد) هەیە لەم بارەوە[٢٦].

-هەروەها پێشەوا(طحاوی) لە هەردوو قوتابییەکەی (ابوحنيفة) (أبو يوسف و محمد) دەگێڕێتەوە, کە ئەوانیش هەمان بۆچوونییان هەیە[٢٧].

---

[٢٣] بڕوانە: (ابن كثير, قورتوبی) لە سەر ئەم ئایەتە.

[٢٤] رواه الترمذي في (الادب), رقم (٢٧٨٨), وابو داود رقم (٢١٧٤).

[٢٥] بداية المجتهد, ج١, ص٨٩.

[٢٦] المجموع للنووی, ج١, ص١٦٩.

–شێخی (شیربینی)یش ئەمە بە پەسەند دەزانێ[٢٨].

وە(ابن حزم) ئەو بۆچونەی هەیە, کە دەم و چاو داناپۆشرێ و پێویست نییە و لە چەندین جێگەدا لە کتێبە بەناوبانگ و نایابەکەیدا بەرگری لەم بۆچونە دەکات[٢٩].

وە(ابو عبدالله, دیمەشقی شافعی) لە کتێبەکەیدا بۆچوونی زۆرینە لەسەر ئەم بۆچوونە دەهێنێ[٣٠].

٢ –پاشان ئەو قسەیەی مەریوان پێچەوانەی ئایەتە, پاش ئەمە دێینە سەری, هەروەها پێچەوانەی چەندین فەرموودەیە لەم بارەوە[٣١].

٢١ –لەمە سەیرتر ئەوەیە مەریوان لە لاپەڕە (٨٠)دا, دەڵێ: "بەم ڕاڤەیەش ئایەتی ٥٩ی (الاحزاب) دەبێتە ناسخی ئایەتی(٣١)ی (نور), واتە لە جێی ئایەتی(٣١)ی (نور) دەبێ ئایەتی(٥٩)ی (الاحزاب) کاری پێ بکرێ".

هەروەها دەڵێ: "ئەگەر بە ڕاڤەکانیاندا بچینەوە دەبینین لە کاتی ڕاڤەکردنی ئایەتی ٣١ی (نور) باسی دەرخستنی دەم و چاو دەکەن, کاتێکیش باس لە ئایەتی ٥٩ی (ئەحزاب) دەکەن باسی داپۆشینی دەمو چاو دەکەن".

دەڵێین:

١ –لەبارەی نەسخ بوونەوە ئەم قسەیەت وەرناگیرێ, چونکە:

أ –هیچ یەکێ لە زانا بەناوبانگ و متمانە پێکراوەکان شتی وایان نەوتووە.

ب –مەریوان نەزان و کاڵفامە بەسادەترین ئالەتەکانی زمانی عەرەبی, چ جای قسەی وای لێوەرگیرێ!.

٢ –ئایەتەکەی (٣١)ی (نور) باس لەدەرخستنی دەم و چاو و پۆشینی تەواوی جەستەو دەرنەخستنی بۆ نامەحرەمەکان دەکات, وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە, ڕاڤەکارانیش قسەیان لێوە کردووە.

٣ –ئایەتی (٥٩)ی سورەتی (ئەحزاب) باس لەوە دەکات کە باڵاپۆشەکانیان بدەن بەسەریانداو دەمو چاو داپۆشین ناگرێتەوە, وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

قورتوبی, لەبارەی (جلباب)دەڵێ: "ئەوەی لە وتەکان سەبارەت بە(جلباب) ڕاست بێ ئەوەیە کە بریتییە لەو باڵا پۆشەی هەموو جەستە داپۆشێ"[٣٢].

وە(ئەلبانی)یش لەبارەی (جلباب)ەوە دەڵێ: "ئەوەی (جلباب) بەوە تەفسیر بکات کە داپۆشینی دەم و چاوە, ئەوە هیچ بنەمایەك بۆ ئەو وتەیە نییە لە زمانی عەرەبی کە(جلباب) بەمە لێکبداتەوە"[٣٤].

پاشان لە جێگەیەکی تردا, وتەیەکی (ابن حزم) لەبارەی (جلباب)ەوە دێنێ کە (ابن حزم) دەڵێ: " (جلباب) لەو زمانە عەرەبییەی کە پێغەمبەر گفتوگۆی پێکردوە لەگەڵماندا بریتییە لەو پۆشاکەی هەموو جەستەی ئافرەت دەگرێتەوە". پاشان ئەو وتەیەی پێشەوا (قورتوبی)کە لە پێشتر باسمان کرد دەیهێنێ لەگەڵ ئەو وتەیەی (ابن کثیر) لەبارەی (جلباب)ەوە وتویەتی, دوایی دەڵێ: " لەوانەیە ئەو (عەبا)یانەی کە ئەمڕۆ ئافرەتان لە(نەجد)و (عێراق)و وێنەی ئەم وڵاتانە بەکاری دەهێنن ئەم (جلباب)ە, بێت"[٣٥].

---

[٢٧] شرح معانی الاثار, ج٢, ص٩, للطحاوی.

[٢٨] الاقناع, ج٢, ص١١٠.

[٢٩] بڕوانە: المحلی, ج٣, ص١٢٦ –١٢٩ –١٣٠.

[٣٠] بڕوانە: رحمة الامة, ص٩١.

[٣١] بۆ باسی دەم و چاو دانەپۆشین و ئاشنا بوون لە فەرموودەکان بڕوانە: جلباب المراة المسلمة, محمد ناصر الدین الالبانی, ص٣٩ –١٠٨.

[٣٢] تفسیر القرطبی لە سەر ئایەتی (٥٩)ی سورەتی (الاحزاب).

[٣٤] جلباب المراة المسلمة, ص٦.

[٣٥] بڕوانە: جلباب المراة المسلمة, ص٨٣.

٢٢ –لەلاپەڕە (٨٣) ئایەتی (٦٠)ی سورەتی (نور) کە دەفەرموێ ﴿ والْقَوَاعِدُ مِنَ النساء اللاتي لا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْس عَلَيْهِن جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُن غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُن والله سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾.

مەریوان, دەڵێ: "مانای ئایەتەکە ئەوە دەدات بە دەستەوە کە ئەم جۆرە ژنانەش (مەبەست ئەوانەن کە پیر بوون و تەمای شوو کردنیان نەماوە) لە کۆت و بەندی حیجاب ڕزگار دەکات و حوکمی حیجاب نایان گرێتەوە".

دەڵێین:

ئەو ئایەتە باس لەوە دەکات, کە ئەو ژنانەی چونەتە تەمەنەوەو تەمای شوو کردنیان نەماوە, هیچیان لەسەر نییە کە بالاپۆشەکانیان (جلباب) دابنێن, ئەمەش وتەی (ابن مسعود وابن عباس وابن عمرو مجاهدو سعید بن جبیرو کەسانی ترە)[٣٦].

مەریوان, گومانم لەوەدا نییە, کە ئەمانەی بینیوە, بەڵام خۆی لێ هەڵە کردووەو لەوانەیە وتبێتی: خۆ گەر من ئەم شتانەم نوسی کێ دەچێ سەیری سەرچاوەیان بۆ دەکات و ئیتر ئەو کات بڕوام پێ دەکەن!.

بەڵام بەهەڵەدا چووە, چونکە کەسانێك هەن نازانن ماندوو بوون چییە بۆ خزمەتی پەیامی خوا, ئەو کەسانە زۆر ئاگادارن بەو کون و کەلەبەری ئەوجێگەو شوێنانەی کە دوژمنان دەیانەوێ ئیسلامی پێ کرمێ بکەن!.

٢٣ –لەلاپەڕە (٨٤)دا لەسەر ئەو ئایەتانەی کە ڕابورد بۆچونێکی سەقەت دەنوسێ و دەڵێ: "لەم ئایەتەدا ئەوە وەردەگیرێت کە ژنانێك تەمەنیان تێپەڕاندبێت, دەتوانن بە سەری ڕووت و سفورییەوە بچنە دەرەوەو گوناهیشی تێدا نییە".

دەڵێین:

وەك باسمان کردو وتەی ئەو هەموو کەڵە زانایانەمان هێنا, کە مەبەست لە (ثیابهن) بالا پۆشیە واتە: عەبا, نەك دانانی لەچك و سەرپۆش, وە زانایانی ڕاڤەش هەروا لێکیان داوەتەوە, لەوانە: (قورتوبی و ابن کثیرو سیوطی).[٣٧]

باسێك:

دەگێڕنەوە جارێك کابرایەك لەلای (قازی) شایەتی لەسەر کابرایەکی تر دەدا, کابرای شایەت لەسەر دراوەکە دەڵێت: قازی شایەتی قبوڵ مەکە, چونکە ئەو کابرایە بیست هەزار دیناری پێیەو حەجی ماڵی خوای نەکردووە, کابراکە دەڵێ: قوربان حەجم کردووە, کابراکەی تر دەڵێ: دە جەنابی قازی پرسیاری (زەمزەم)ی لێبکە, کابراکە چونکە درۆزنەو درۆی کردووە دەڵێ: قوربان من کاتێ حەجم کردووە کە هێشتا ئاوی (زەمزەم) هەڵنەکەندرابوو, بۆیە من (زەمزەم)م نەبینیوە[٣٨].

مەریوان, لەم کابرایە خراپتریشی لێ بەسەرهاتووە, نازانم بۆ مەریوان لەکاتی نوسینی ئەو کتێبەیدا بیری لەو نەکردۆتەوە, کە کاتێك دێت دەستەکانی بەدەربخرێت, یان بیری کردۆتەوە لێی, بەڵام شتی تر هەبووە لە ئارادا کە هانی نوسینی ئەو کتێبە بدات, کە لە کۆتاییدا بە درێژتر باس لە مەبەستی نوسینەکەی مەریوان دەکەم.

٢٤ –لەلاپەڕە (٨٦)دا قسەیەك بەدەم (ابن کثیر)ەوە هەڵدەبەستێ و پاشانیش دەقەکە دەگۆڕێت, مەریوان دەڵێ: "ابن کثیر دەڵێت: كانت نساء المؤمنين يخرجن بالليل الى حاجتهن وكان المنافقون يتعرضون لهن و يؤذونهن فنزلت هذه الآية, وقال السدي: كانت المدينة ضيقة المنازل و كان النساء اذا كان الليل خرجوا فقضين الحاجة وكان فساق من فساق المدينة يخرجون فاذا رأوا المرأة عليها قناع قالوا هذه حرة فتركوها واذا رأوا المرأة بغير قناع قالوا هذه أمة فكانوا يراودونها فأنزل الله تعالى هذه الاية.

دەڵێن:

---

[٣٦] ابن کثیر, تەفسیری ئەم ئایەتە.

[٣٧] بڕوانە: هەر سێ ڕاڤەکە لەسەر ئەم ئایەتە.

[٣٨] اخبار الحمقى والمغفلين, ص٢٢٦, ابن الجوزي.

١ –(ابن كثير) قسەی وای نەكردووە, بەڵكو (ابن كثير) دەڵێ: "قال السدي....". كەواتە قسەی (سدی)یە, نەك (ابن كثير).

٢ –ئەو دەقەی سەرەوە زۆر گۆڕانی تێدایەو مەریوان ئاماژەی بەوە كردووە, كە لە تەفسیری (ابن كثير) ئەمەی هێناوە, ئێمەش ئێستا ئەو دەقەی نێو تەفسیری (ابن كثير) دێنین و دواتر با خوێنەری خۆی بڕیار بدات, كە چەندە جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو دوو دەقەدا, لە تەفسیری (ابن كثير)دا هاتووە كە (ابن كثير) دەڵێ:

"قال السدي في قوله تعالى( يا ايها النبي...) قال: كان ناس من فساق المدينة يخرجون بالليل حين يختلط الظلام الى طرق المدينة, فيعرضون للنساء وكانت مساكن أهل المدينة ضيقة فاذا كان الليل خرج النساء الى الطرق يقضين حاجتهن, فكان أولئك الفساق يبتغون ذلك منهن, فاذا رأوا المرأة عليها جلباب قالوا هذه حرة فكفوا عنها, واذا رأوا المرأة ليس عليها جلباب قالوا: هذه أمة فوثبوا عليها"[39].

من هیچ ناڵێم ئێوە سەیری ئەم دوو دەقە بكەن, چی باشە بە مەریوان بوترێ؟!!

٢٥ –لەلاپەڕە(٨٩)دا دەڵێ: "ناحەقی كەسێكی وەك عومەری كوڕی خەتتاب ناگرین بەهۆی ئەم ئایەتەوە ناچار دەبێت لە جێبەجێكردنیدا دادپەروەر بێت و بە قامچی لەو كەنیزەكانە بدات, كە حیجابیان دەپۆشی و پێیان بڵێت: ئەوە بۆ خۆتان وەك ئازادەكان دەشوبهێنن؟, ئایا خۆتانتان لە بیر چۆتەوە كە كەنیزەكن؟". دوایی وەك سەرچاوە (تەفسیری قورتوبی) دەهێنێت.

دەڵێین:

ئەوەی لە تەفسیری قورتوبیدایە هەر ئەمەندەیە, كە قورتوبی نوسیویەتی: "وقال عمر (رضي الله عنه) اذا رأى أمة قد تقنعت ضربها بالدرة, محافظة على زي الحرائر"[40].

عومەر دەستوری وابوو, گەر كەنیزەكێكی ببینیایە سەرو مل و گەردنیان داپۆشیایە بە قامچی لێی دەدان, ئەمەش وەك پارێزگارییەك لە پۆشاكی ئازادەكان.

ئیتر "ئەوە بۆ خۆتان...." ئەمە قسەی گیرفانی دڕاوی مەریوان خۆیەتی.

٢٦ – لە لاپەڕە (٩٧)دا, ئایەتی (٤٣)ی سورەتی (النساء) دێنێ و پاش ئەوەی, وەك هەموو جارێ تۆزێ دەبزڕكێنێ, دەڵێ: "ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەگەر موسڵمانێك مەشروب بخواتەوەو سەرخۆش نەبێت و بەئاگا بێت و نوێژەكەی بە ڕێك و پێكی بكات ئەوا حوكمی ئەم ئایەتە نایگرێتەوە".

دەڵێین:

ئایەتی (٤٣)ی سورەتی (النساء) دەفەرموێ: ﴿ يا أيها الذين آمنوا لا تقربوا الصلاةَ وأنتمْ سكارى حتى تعْلمـوا مـا تقُولُونَ ولا جنبا إلا عابِري سبِيلٍ حتى تغْتسِلوا وإن كُنتم مرْضى أوْ على سفَر أوْ جاء أحد منكُم من الغآئِطِ أوْ لامسْتم النساء فَلمْ تجِدوا ماء فَتيمموا صعِيدا طيبا فَامسحوا بِوجوهِكُمْ وأيدِيكُمْ إن اللّه كانَ عفُوا غفُورا ﴾.

ئەو قسەیەی مەریوان كاتێ وایە, كە دواتر حەرام نەكرابایە, بەڵام كە دواتر خوای گەورە بە دەق قەدەغەی كردو ئیتر كەم و زۆر خواردنەوەكەشی قەدەغە وحەرامە, ئەوەتا خوای گەورە بۆ هەتا هەتایی قەدەغەو حەرامی كردووە: ﴿ يا أيها الذين آمنوا إنما الخمْر والمْيسِر والأنصاب والأزْلام رِجْس منْ عمل الشيْطان فَاجْتنِبوه لعلكُمْ تفْلِحونَ﴾ المائدة/٩٠.

پێغەمبەریش دەفەرموێ: "ما أسكر كثيره فقليله حرام".[41]

واتە: هەرچی زۆرییەكەی سەرخۆش بكا ئەوا كەمەكەشی هەر حەرامە.

هەتا كەسێكی زاناو بەناوبانگی وەك (ابن حجر الهيثمي) خواردنەوەی یەك دڵۆپەشی بە گوناهی گەورە داناوە[42].

---

[39] بڕوانە: ابن كثير تفسير اية (٥٩)ی الاحزاب.

[40] تفسير القرطبي, اية (٥٩)ی الاحزاب، المسألة السادسة.

[41] رواه ابو داود رقم (٣٦٨١) والترمذي رقم (١٨٦٥) وصحيح الجامع رقم (٥٥٣٠).

٢٧ – لەلاپەڕە(١١٤)دا، لە باسی هێنانەوەی ژنی باوك دەڵێ: "لە دوای حوکمی ئایەتەکەش هەبووە باوەژنی خۆی بە مارەبڕی هێشتۆتەوەو ئەویش (مەبەستی پێغەمبەرە) قسەی نەکردووەو بە پشت بەستن بە هەمان ئایەت بە حەڵاڵی ماوەتەوە".

دەڵێین:

ئەو ئایەتەی مەریوان قسەی لەسەر دەکات، ئایەتی(٢٢)ی سورەتی (النساء) کەدەفەرموێ: ﴿ولا تنكِحوا ما نكـح آباؤكُم من النساءِ إلا ما قدْ سلفَ إنه كانَ فاحِشةً ومقْتا وساء سبِيلاً﴾.

واتە: ئێوە ئەو ئافرەتانە مارە مەکەنەوە لە خۆتان، کە باوکتان مارەیان کردوون، تەنها ئەوە نەبێ، کە لەوەو پێش ئەمە کرابێت، چونکە ئەم کارە بەڕاستی خراپەو ناڕەواییەو بەڕاستی خراپترین ڕێگەیە.

ئەم ئایەتە حەرامێتی ئەوە دەردەخات، کە ئەگەر باوکێك ژنێکی مارەکرد، ئیتر لەسەر ئەو کوڕە دروست نییە مارەی بکاتەوە، ئەمەش چەند جۆرێکە:

١ –ئەگەر باوکەکە چوو بووە لای ئافرەتەکە، واتە جووتبوون ڕوویدابوو، ئەوا بە کۆڕای زانایان مارەکردنەوەی حەرامە.

٢ –ئەگەر جووتبوون ڕووینەدابوو، ئەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) دەڵێ: "بەهەمان شێوە هەر حەرامە"[43].

ئێمە قسەمان لەسەر ئەو قسەیەی مەریوانە، کە دوو بەهانە بۆ ڕەوایەتی ئەم کردارە دەهێنێتەوە:

١ –گوایە شتی وا کراوەو پێغەمبەر بێدەنگ بووە، ئەمە درۆیە، بوختانە، کاڵفامییە، چونکە ئەوەتا (بەڕڕاء کوڕی عازب) دەڵێ: "حارث کوڕی عمیری مامم بە لامدا تێپەڕی ئاڵایەکی بەدەستەوە بوو کە پێغەمبەر بۆی گرێ دابوو، وە دابویە دەستی پێم وت: ئەی مامە پێغەمبەر بۆ کوێی ناردی؟ ئەویش وتی: ناردمی بۆ لای پیاوێك ژنی باوکی خۆی مارە بڕیبووەوە، فەرمانی پێکردم کە بدەم لە گەردنی پیاوەکە"[44].

٢ –گوایە لە ئایەتەکەدا ڕێ بە شتی وا دراوە، ئەمەش دەمکوتی نەزانە لەم بارەوە، چونکە هەندێ لە زانایان بەم جۆرە واتای ئایەتەکەیان کردووە "ئێوە وەك ئەوەی کە باوکانتان دەیانکرد کە بریتی بوو لە مارە کردنەوەی ژنی باوك، ئێوە وەك ئەوان مەکەن، مەگەر ئەوانە نەبێت کە لە کۆندا شتی وایان کردبێت".

ئەمەش بۆچونی (قورتوبی)و(طبرییە)[45].

کەواتە قسەکەی مەریوان بە درۆو بوختان دەرچووە.

(ابن كثير) دەڵێ: "هەر بۆیە هەرکەس شتی وەها بکات، پاش ئەم ئایەتە بە هەڵگەڕاوە دادەنرێت و دەبێ بکوژرێ و سەروەت و سامانەکەشی دەچێتە گەنجینەی دەوڵەتی ئیسلامەوە واتە: بيت المال"[46].

٢٨ –لەلاپەڕە (١١٤و١١٥)دا دەڵێ: "بەپێی ئەرکە ئایینییەکان لە کاتی ڕۆژوو گرتندا نەدەبوو کەس سێکس بکات، تا ماوەی مانگەکە تەواو دەبوو، بەڵام ئیسلام هات ئەمەی نەهێشت". ئینجا ئایەتی (١٨٧)ی سورەتی (البقرة) دێنێ.

دەڵێین:

ئەو قسەیەی مەریوان سەقەت و ناتەواوە.

(ابن كثير)، لەبارەی ئەو ئایەتەی سورەتی (البقرة) دەڵێ: "ئەم ئایەتە مۆڵەتێك بوو لە خواوە بۆ موسڵمانان و هەڵگرتنی ئەو باوە بوو، کە لە سەرەتای ئیسلامدا هەبوو، چونکە لە سەرەتادا (وابوو گەر کەسێك ڕۆژوی بشکاندایە لە

---

[42] بڕوانە: تفسير (ابن كثير)، قورتوبی، الزواجر عن إقتراف الكبائر، ج٢، ص٢٦٧ –٢٩٢، لە گوناهی٣٧١ تا ٣٨٢.

[43] بڕوانە: ابن كثير تفسير اية (٢٢) النساء.

[44] رواه ابو داود، والنسائي، والترمذي...... هەروەها بڕوانە: ابن كثير تفسير اية (٢٢) النساء.

[45] بڕوانە: تفسير القرطبي، ص١٠٤، ج٥، مختصر تفسير الطبري، ج١، ص١٤٦.

[46] ابن كثير، اية (٢٢)ی النساء.

ئێوارەدا ئەوە (خواردن و خواردنەوەو جووتبوون لەگەڵ خێزاندا) تا نوێژی عیشا بۆی ڕەوا بوو, یان گەر پێش عیشا بخەوتایە, بۆیە گەر کەسێ پێش عیشا بخەوتایە, یان نوێژی عیشای بکردایە, ئەوا (خواردن و خواردنەوەو جووتبوونی خێزان)ی لە سەر حەرام دەبوو, تا شەوی دوایی تر[٤٧]".

جا مەریوان "نەدەبوو کەس سێکس....". لە کون و قوژبنی چ کەلاوەیەکدا ئەمەی هەڵگرتەوە.

٢٩-گەر ئەمەم بۆ گێڕانەوە زۆر پێمەکەنن, باوەڕکەن مەریوان هێشتا دەبێ چەند ساڵێکی تر بچێت لە جێگەیەك سەرەتاکانی زمانی عەرەبی بخوێنێت:

لەلاپەڕە (١١٥و١١٦) فەرموودەیەك دەنوسێ و پاشتر دەیکات بە کوردی و دەڵێ: "ژنانیش پرسیاریان لێ کردووە: ئەی پەیامبەر ژن لەناو ئێمەدا شوو بە یەك و دووان و سیان و چوار دەکات و دوایی هەموویان دەچنە بەهەشتەوە, لەگەڵ کام لەو مێردانەی دەبێت...؟ دەڵێت: ژنەکە بە ئارەزووی خۆی جوانترین کەسیان هەڵدەبژێرێت و لەگەڵ ئەو دەبێت".

دەڵێین:

وەڵامی پێغەمبەر لەو دەقە عەرەبییەدا ئاوهایە "أحسنهم خلقا" واتە: باشترین مێردیان, کە لە هەموویان ڕەوشتی بەرزو جوانتر بێت, واتە ئەگەر سەرو بۆری بۆ بکرێت ئاوهای لێ دێت, (أحْسنُهم خُلُقاً) خُلُق, بە زەممەی (خ)و (ل), بەڵام مەریوان بە جۆرێکی تر تێی گەیشتووەو وایزانیووە (أحْسنُهم خَلْقاً)ە.

ناحەقی مەگرن, چونکە لە(تفسیر ابن کثیر) وەریگرتووە و ئەو تەفسیرانەش واباوە (سەرو بۆر)ی بۆ ناکرێت, هەر بۆیە لە جیاتی رووە زانستییەکە زاڵ بێت بەسەر مەریواندا, لایەنە (سێکس)یەکە زاڵ بووە بەسەریداو ئاوها لێی تێك چووە!.

٣٠-لەلاپەڕە (١١٦)دا فەرموودەیەك دێنێ و بەشێکی تێدایە, کە دەقە عەرەبییەکەی ئاوهایە: "فیدخل الرجل منهم علی ثنتین و سبعین زوجة مما ینشیء الله, وثنتین من ولد آدم لهما فضل علی من أنشأ الله بعبادتهما فی الدنیا...".

مەریوان هاتووە ئاوها کردویەتی بە کوردی: "لە بەهەشتدا هەر پیاوێك دەچێتە لای ٧٢ ژن لەوانەی خوا بەتایبەت دروستی کردوون, هەروەها دوو کوڕی جوان و لوسیش لە کوڕانی ئادەم زۆر لەوانە باشترو جوانترن کە لەم دونیایەدا دروست کراون....".

دەڵێین:

"وثنتین من ولد آدم....", واتا ڕاستەکەی ئاوهایە: "لە سەر ئەو حەفتاو دووەوە دەچێتە لای دوو ئافرەت لە نەوەکانی ئادەم, کە ئەو دووانە ڕێزو پلەیەکیان هەیە بەسەر ئەوانەی کە خوا دروستی کردوون، ئەویش بەهۆی ئەوەیە کە لە دونیادا پەرستشیان کردووە".

مەریوان هەتا لە ژمارەشدا (مذکرو مؤنث) لێك جیا ناکاتەوە, نازانێ (ثنتین) تەثنییەیەو مؤنث وحاڵەتی (جەڕ)یەتی, بەڵام کوا مەریوان ئەم شتانە دەزانێ!.

٣١-لەلاپەڕە(١٢١)دا باسی ئەوە دەکات, کە ژنان (قنگی) ئیمامەکەی خۆیان بینیوەو دواتر وەڵامییان بۆ ناردووە, کە گەڵ و قنگی جوان داپۆشێ, دواتر دێڕێك دەهێنێ بەعەرەبی و لە پەڕاوێزەکەشدا ئاماژەی بە(صحیح البخاری) کردووە وەك سەرچاوە.

دەڵێین:

ئەوەی لە (صحیح البخاری) دایە (عەمری کوڕی سەلەمە) دەیگێڕێتەوەو بەسەر خۆیدا ئەم ڕووداوە ڕوویداوە, ئەو کات ئەو لە تەمەنی منداڵی دابووە, وەك خۆی لەگێڕانەوەیەکی (أبو داود)دا دەڵێ: "وکنت غلاما حافظا...." واتە: ئەو

---

[٤٧] تفسیر (ابن کثیر) ئایەتی (١٧٨) البقرة.

کات من منداڵ بووم و بیرم بۆ لەبەر کردن چاك بوو..., هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو پۆشاکەی کە لە بەریدا بووە دڕاوی تێدا بووە کە چۆتە سەجدە (سمتی) دەرکەوتووە[٤٨].

٣٢-لە باسی دیاردەی (نێرەموك) لەلاپەڕە (١٢٤)دا, شتێکی زۆر سەیر لە مەریوان ڕوودەدات ئەویش ئەوەیە, کە فەرموودەیەك دەهێنێ وشەی (المخنث)ی لێدەبێ بە(نێرەموك)و پێغەمبەر تاوانبار دەکات, کە ئەو نێرەموکی دەرکردووەو نەفرەتی لێکردووە, بە وتەی مەریوان ئەمە نەزانییەو گەر کەسێ خوا بە نێرەموکی دروستی کردبێ دەبێ گوناهی چی بێ؟. پاشان ئاماژە بە فەرموودەیەك دەکات کە لە (صحیح البخاری)دایە.

دەڵێین:

ئەو فەرموودەیەی ئەو ئاماژەی پێداوە بەم جۆرەیە:

ابن عباس دەڵێ: "لعن النبی المخنثین من الرجال والمترجلات من النساء, وقال: أخرجوهم من بیوتكم, فأخرج النبي فلانا", وأخرج عمر فلانة".[٤٩]

واتە: پێغەمبەر نەفرەتی لەو پیاوانە کردووە, کە لە هەڵسوکەوت کردن و قسەکردندا خۆیان دەشوبهێنن بە ئافرەتان, هەروەها ئەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەشوبهێنن بە پیاوان, پێغەمبەر فەرموی: لە ماڵەکانتان دەریان بکەن, پێغەمبەر بۆ خۆی کەسێکی دەرکرد, عومەریش ئافرەتێکی دەرکرد.

وشەی (مُخَنَّثْ) بە فەتحەو کەسرەی نونەکەش دەخوێنرێتەوە, ئەو کەسەیە لە هەڵس و کەوت و قسەدا خۆی دەشوبهێنێ بە ئافرەتان, ئەمە پێناسەی (ابن حجر)ە بۆ(مخنث)[٥٠].

وە (ابن حجر) لە (فتح الباری)دا دەڵێ: "لە هیچ یەکێ لە گێڕانەوەکاندا ناوی ئەو کەسەی کە عومەر دەری دەکات بەرچاوم نەکەوتووە, پاشان دواتر چاوم بە(-کتاب المغربین-ی, أبو الحسن المداینی) کەوت, کە ناوی ئەو کەسە (أبو ذؤیب)ە[٥١].

مەریوان لێرەشدا نەزانی خۆی زیاتر دەرخست.

٣٣-لەلاپەڕە (١٢٦), لە سەر ئایەتی ٣٠ی (الاحزاب)دا کە ڕاڤەی دەکات و دوایی ناوی (ابن کثیر) و(قرطبی) و(طبری) و(جلالین) دەهێنێت و باسێك بە دوورو درێژی باس دەکات, پاشتر لە پەڕەی بەرامبەریدا لە پەڕاوێزێکدا دەقە عەرەبییەکە دێنێ.

دەڵێین:

ئەو ناوانە مەریوان هێناویەتی چاو بەستە, چونکە:

أ-(ابن کثیر) شتی وای تێدا نییە.

ب-(تفسیر الجلالین)یش شتی وای تێدا نییە.

ج-ئەو دەقەی کە هێناویەتی لە تفسیری (قورتوبی)دایە.

د-(طبري) لەو دەقە بێبەرییە.

ئەوەی ئەم سەرچاوانەی هەبێ, بگەڕێ بزانێت ئەو قسەیەی, کە مەریوان هێناویەتی گەر لە (تفسیری قورتوبی) زیاتر لە هیچ یەکێ لەو سەرچاوانەی تردا بینی, ئەوا جێی خۆیەتی بە مەریوان بوترێ شتێك دەزانێ!.

٣٤-لەلاپەڕە (١٢٧)دا دەڵێ: "هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کە وشەی (فاحشة) لە ئایەتەکە مەبەستی سەرەکی لە زینایە".

---

[٤٨] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: فتح الباری, ج٨ باب ٥٣, رقم الحدیث (٤٣٠٢).

[٤٩] رواه البخاري, رقم الحدیث (٥٨٨٦)

[٥٠] فتح الباری, ج٩, ص٣٨٣.

[٥١] بڕوانە: فتح الباری, ج١٠, ص ٣٧٦، وە ج١٢, ص ١٨٢.

دەڵێین:

ئەمە بوختانە, گەر ڕاستی دەکرد با قسەکانیانی بهێنایە, لە هەمووی سەیر تر ئەوەیە کە بۆ پشگیریی قسەکەی ئاماژەی بە تەفسیری (ابن کثیر) کردووە, وەك سەرچاوە.

منیش دەڵێم: ئەوە تەفسیری (ابن کثیر) لە سەر ئایەتی(٣٠)ی سورەتی (الاحزاب), سوێند بەخوا گەر وشەی(ز–ن–ا)هاتبوو پەیمان بێت تا ماوم قەڵەم بە دەستەوە نەگرم.

٣٥– لەلاپەڕە (١٢٨)دا وتەیەکی (عومەر) دێنێ, کە دەقە عەرەبییەکەی ئاوهایە "یا رسول الله لو ضربت علی نسائك الحجاب فإنه یدخل علیهن البر والفاجر, فأنزل الله: وإذا سالمتوهن...". دواتر تفسیری (ابن کثیرو قورتوبی) وەك سەرچاوە دەست نیشان دەکات.

دەڵێین:

ئەو دەقە لە تەفسیری (ابن کثیر)دا نییە, بەڵکو تەنها لە (قورتوبی)دا هاتووە.

٣٦– لەلاپەڕە (١٢٩)دا لەسەر ڕاڤەی ئایەتی (٢٣٥)ی سورەتی (البقرة) لە بڕگەی "ولکن لا تواعدوهن سرا". پاش ئەوەی هەندێ شتی نوسیوە, مەریوان دەڵێ: "(ابن کثیر)یش هەمان بۆچونی هەیەو دەڵێ: لا تقل لها إنی عاشق و عاهدینی أن لا تتزوجی غیری و نحو هذا قال زنا".

دەڵێین:

١– (ابن کثیر) بە هیچ جۆرێ بۆچوونی خۆی دەرنەبڕیوە, بەڵکو قسەی کەسانی تر دەگێڕێتەوە.

٢–ئەو دەقەی کە بەدەم (ابن کثیر)ەوە هەڵیبەستوە, قسەی (إبن عباس)ە.

٣–دەستەواژەی "قال زنا" تەحەددا دەکەم ئەگەر لە تەفسیری (ابن کثیر)دا هاتبێ.

٣٧–لەلاپەڕە (١٣٠), لەبارەی ئایەتی ٢٢٣ی (البقرة)دا دەڵێ: "قورتوبی دەڵێت: عن ابن عمر: فأتوا حرثکم أنی شئتم قال یأتیها. إن ابن عمر والله یغفر له وهم إنما کان هذا الحی من الأنصار وهم أهل وثن مع هذا الحی من زفر وهم أهل الکتاب وکان هذا الحی من قریش یشرحون النساء شرحاً بنو و یتلذذون منهن مقبلات ومدبرات ومستلقیات".

پاشان ئاماژە بە (تەفسیری قورتوبی) دەکات وەك سەرچاوە.

دەڵێین:

ئەوەی لە تەفسیری (قورتوبی)دا هاتووە ئاوهایە: "وعن عبدالصمد قال: حدثنی أبی قال حدثنی أیوب عن نافع عن ابن عمر (فأتوا حرثکم أنی شئتم) قال: یأتیها فی".

پاشان (قورتوبی) دەنوسێ: " (وروی أبو داود عن إبن عباس قال: إن ابن عمرو الله یغفر له وهم, إنما کان هذا الحی من الأنصار, وهم أهل وثن, مع هذا الحی من یهود وهم اهل الکتاب, وکانوا یرون لهم فضلاً علیهم فی العلم, فکانوا یقتدون بکثیر من فعلهم, وکان من أمر أهل الکتاب ألا یأتوا النساء إلا علی حرف, وذلك أستر ما تکون المرأة, فکان هذا الحی من الأنصار قد أخذوا بذلك من فعلهم, وکان هذا الحی من قریش یشرحون النساء شرحاً منکراً, ویتلذذون منهن مقبلات و مدبرات و مستلقیات, فلما قدم المهاجرون المدینة تزوج رجل منهم إمرأة من الأنصار, فذهب یصنع بها ذلك فأنکرته علیه, وقالت: إنما کنا نؤتی علی حرف فاصنع ذلك و إلا فاجتنبنی, حتی شری أمرهما, فبلغ ذلك النبی, فأنزل الله عزوجل (فأتوا حرثکم أنی شئتم) اي مقبلات و مدبرات و مستلقیات, یعنی بذلك موضع الولد".

من هیچ لەسەر ئەمە ناڵێم بۆ خوێنەری جێدێڵم!.

٣٨–پاشان کە هاتووە واتای بکات زۆر بە سەقەتی مانای کردووە, بۆ نمونە دەڵێ: "کاتی خۆی گەڕەکێك هەبوو لە مەککە تێکەڵی گەڕەکێك بووبوون لە مەدینە, لە کونی دواوە دەچونە لای ژنەکانیان و بە هەموو شێوەیەك لەزەتیان لێ دەبینی.....". هەروەها دەڵێ: "کاتێك کە کۆچەرییەکان هاتنە ناو مەدینە, پیاوێکیان ژنی لە ئەنصارەکان هێناو لە کونی دواوە دەچوە لای ژنەکەی, ژنە ئەنصارییەکەش ڕازی نەبووبوو, پیاوەکە پێی دەڵێ: (ئێمە هەر لە دواوە دەیکەین)....".

دەڵێین:

ئەوە دەقە عەرەبییەکەو ئێستاش واتای دەکەین.

إبن عباس دەڵێ: "(إبن عمر) خوا لێی خۆش بێت, بە ڕاستی بە هەڵەدا چووە, ئەو هۆزە لە ئەنصارییەکان کە بت پەرست بوون, لەگەڵ ئەو هۆزە لە جولەکە, کە خاوەننامە بوون, ئەنصارییەکان جولەکەکانیان بە بەڕێز دەزانی لە خۆیان و وایان دادەنا, کە ئەوان فەزڵیان هەیە بە سەریاندا لە ڕووی زانستەوە, هەر بۆیە لە زۆرێك لە کارەکانیاندا چاویان لێدەکردن, وە دەستوری خاوەننامەکان وابوو تەنها لەسەر یەك شێوە دەچونە لای ئافرەت, چونکە ئەمە چاکترە بۆیان, بەڵام ئەم هۆزە لە قوڕەیش, کە دەچونە لای ئافرەت لە سەر شێوەی زۆر خراپ لە پێشەوە دەچونە لایان, لە سەر هەموو بارێك چێژیان لێ وەردەگرت لە پێشەوە (وەك ئافرەتەکە لەسەر پشت بکەوێ), لە دواوەو لەسەر شان (واتە ئەم دوو شێوازەش هەر لە جێگەی پێشەوە دەبوو), جا کاتێ کۆچەرییەکان هاتنە مەدینە, پیاوێك لەوان ئافرەتێکی ئەنصاریی خواست و وەك دەستوری قوڕەیش خۆیان لەگەڵیدا جووت دەبوو, ئافرەتەکەش ئەمەی بەلاوە ناخۆش بوو, وتی: ئێمە هەر لەسەر یەك شێوە دێنە لامان, گەر بەو جۆرە دەیکەیت لەگەڵمدا ئەوا باشە, گەر نا لێم دوور بکەوەرەوە, تا گەیشتە ئەوەی دەنگ و باسەکەیان بڵاوبووەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەر, ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (فأتوا حرثكم أنى شئتم), واتە: لە پێشەوەو لە دواوەو لەسەر شان, واتە: بەو جۆرە لە جێگەی منداڵ بوونەوە.

کەواتە: باسەکە لەوەیە قوڕەیش بە چەند جۆرێك دەچونە لای ئافرەتان, بەڵام لە جێگەی منداڵ بوونەوە جووتبوونەکە دەکرا, بەڵام ئەنصاریی و خاوەننامەکان تەنها یەك شێوەیان بەکارهێناوە, بۆ بەهێزیی ئەم وتەیەش فەرمودەکەی, کە(جابر) دەیگێڕێتەوە, دەڵێ: جولەکەکان دەیان وت: ئەگەر پیاو لە دواوە, بەڵام لە کونی پێشەوە, بچێتە لای خێزانی, ئەوا گەر منداڵیان بوو, منداڵەکەیان خێل دەردەچێ, ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (نساؤكم حرث لكم....) لە گێڕانەوەیەکدا لە ڕێگەی (زوهیر)ەوە دەڵێ: گەر ویستی با بیخات بەسەرداو ئنجا بچێتە لای, گەر ویستیشی با وا نەبێت, گرنگ ئەوەیە لە یەك کونەوە بێت"[٥٢].

٣٩ –ئەوەشی کە لە لاپەڕە (١٣١)دا لەسەر (عومەر) نوسیویەتی و پاشان لە لاپەڕەی (١٣٢) دەڵێ: "ئەوەمان بەسە کە خەلیفە عومەر ئەو شەوە لە کونی دواوە چووەتە لای ژنەکەی".

دەڵێین:

باسەکەی (عومەر) وەك مەریوان خۆشی دوو جار دەیهێنێ (عومەر) دەڵێ: "ئەی پێغەمبەر ئەمشەوی ڕابردوو (کەل و پەلی بارەکەم گواستەوە) مەبەستی ئەوەیە, کە لەگەڵ خێزانەکەیدا لە شوێنی جارانەوە جوتبوونی لەگەڵ نەکردووە، واتە: مەبەستی عومەر ئەوەیە, کە وەك دەستوری ئەو هۆزەی قوڕەیش چۆتە لای خێزانەکەی، نەك وەك ئەوەی مەریوان ئەڵێ، چونکە:

أ– بەخوار بوون دێت لە پاش ڕێکی, (وەك لە یەکێ لە واتاکانی"حول" لە زمانی عەرەبیدا هاتووە[٥٣].

کەواتە پاش ئەوەی, کە بەڕێکی و لەپێشەوە چۆتە لای, ئەو شەوە بە خواری واتە لە ڕێگەی ترەوە, بەڵام لە جێگەی منداڵ بونەوە.

ب– وەڵامەکەی پێغەمبەر, کە لە پاش خوێندنەوەی ئایەتی: (نساءكم حرث لكم...) پێی فەرمووە: (أقبل وأدبر, وأتق الدبر والحيضة) واتە: لە پێشەوەو لە دواشەوە بیکە, بەڵام لە کونی دواوەو لە کاتی سوڕی مانگانەدا خۆت بپارێزە.

کە ئەم وەڵامەی داوەتەوە ئەوە ناگەیەنێت (عومەر) لە کونی دواوە چوبێتە لای خێزانی, هەر وەك چۆن ئەوە ناگەیەنێت, کە (عومەر) لەکاتی سوڕی مانگانەدا چوبێتە لای خێزانی.

---

[٥٢] رواه البخاري و مسلم. هەروەها بڕوانە: فتح الباري, ج٨, ص٢٢٢ رقم الحديث (٤٥٢٨), تفسير القرطبي, ئایەتی ٢٢٣ البقرة المسألة الاولى.

[٥٣] بڕوانە: معجم الوسيط, مادة (حال).

٤٠- لەلاپەڕە(١٣٢و١٣٣)دا, دەڵێ: "وا دەردەکەوێت چونە لای ژن لە کونی دواوە لە قۆناغی مەککەدا ئاسایی بوبێت و خەلیفە عومەریش حەزی لێکردبێت, هەر بۆیە ئەو شەوە لە کونی دواوە چۆتە لای ژنەکەی, لە گوتەیەکیشدا وتویەتی: أنحکوا نساء أهل مكة".

دەڵێین:

١- "..لەقۆناغی مەککە..". ئەمە بوختانە, چونکە سورەتی (البقرة) بە یەکدەنگی زانایان(مەدەنی)یە[٥٤].

ئایەتی (نساءكم....) لە ئایەتەکانی سورەتی (البقرة)یە, ئیتر (قۆناغی مەککە) لە کوێ؟!.

٢- "أنحکوا نساء...". چ پەیوەندی لە دوورو نزیکەوە بەم باسەوە هەیە؟!.

٤١- لەلاپەڕە (١٣٣)دا, وتەیەکی (ابو سعید الخدری) دەکات بە هی (ابن كثير), مەریوان دەڵێ: "ئەوەتا (ابن كثير)یش ئاوا ڕاڤەی ئایەتەکەی کردووە: (أن رجلاً أصاب امرأة فی دبرها....)".

دەڵێین:

خۆ ئەگەر (ابن كثير)یش لە ژیاندا نەما بێت و بەرگری لە خۆی بکات دژ بە "مەریوان"ەکان, ئەوە تەفسیرەکەی با سەیر بکرێت, تاکو دەرکەوێت کە ئەو وای وتووە یان وتەی (أبو سعيد)ە[٥٥]؟.

٤٢-لەهەمان لاپەڕەدا, (حفصة) وەك گێڕەرەوەی بە سەرهاتێك لە قەڵەم دەدات, دوایی وەك سەرچاوە ئاماژە بە (تفسير ابن كثير) دەکات.

دەڵێین:

(حفصة) باسەکەی لە دەمی (أم مسلمة)ی هاوسەری پێغەمبەر دەگێڕێتەوە, نەك بەسەرهاتەکە ببینێت.

٤٣- لەلاپەڕە(١٣٤و١٣٥)دا, دەڵێ: "خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە, کە هیچ یەکێك لە موفەسیرەکان نەچون بەلایداو تا ئێستاش لە نوسینەکانی سەردەمیشدا بەرچاوناکەوێت, ئەویش ئەوەیە کە لە کۆتایی ئایەتەکەدا هاتووە: "وبشر المؤمنین" مژدە بدە ئیمانداران, دوایی هەر خۆی پرسیاری ئەوە دەوروژێنێ کە چ مژەیەك بدرێت بە ئیمانداران....دوایی خۆی پرسیارەکە هەڵدەهێنێت و دەڵێ: کەواتە ئەم ڕووداوەی عومەر ڕاستەو لە دواوە چۆتە لای ژنەکەی بەپشت بەستن بە ئایەتەکە, کە دەڵێت: ژنەکانتان کێڵگەتانن, چۆنتان دەوێت بیانکێڵن, ئەی پەیامبەر ئەم مژدەیەش بدە بە ئیماندارەکان".

دەڵێین:

"وبشر المؤمنین". هەموو موفەسیرەکان چوون بەلایدا و قسەو ڕاڤەشییان لەسەر کردووە:

١- (ابن كثير) دەڵێ: "مژدە بدە بەو باوەڕدارانەی گوێڕایەڵی خوان لەوەی, کە فەرمانی پێکردوون, وە دوور کەوتوونەتەوە لەو شتانەی, کە خوا سەرزەنشتی کردوون".

٢- (قورتوبی) دەڵێ: "ئەمە دڵنەوایییەکە بۆ ئەوەی کاری چاکە دەکات و دەگەڕێ بەشوێن ڕێبازی هیدایەتدا".

٣- (طبری) دەڵێ: "مژدەیان بدەرێ بە بردنەوەی ڕۆژی دوایی و هەتا هەتایی لە بەهەشتدا"[٥٦].

مەریوان, دڵنیابە دڵسۆزان و زانایانی ئەم دینە شتێکی ئەوتۆیان بۆ کەسانی وەك تۆ نەهێشتۆتەوە, تا تۆ بێیت فەلسەفەی سەقەتی بەسەرەوە لێ بدەی!, لە نوسینە کۆنەکاندا ئەوەندە هەیە کە پێویست بەوە نەکات بۆ نوسینەکانی سەردەم بگەڕێیت.

٤٤- لەباسی خێزانەکانی پێغەمبەر لە لاپەڕە (١٤٠)دا, باسی (أسماء بنت النعمان) دەکات و دەڵێ: "وا دەردەکەوێت ئەم ژنەی کەسێکی زۆر هۆشیار بووبێت, چونکە لە پەردەی زاوایەتیدا خۆی تەسلیم بە پەیامبەر نەکردووە و

[٥٤] بڕوانە: عومەر کەمال: پوختەیەکی بەسوود لە زانستەکانی قورئان.

[٥٥] بڕوانە: تفسير ابن كثير, ئایەتی (٢٢٣)ی البقرة.

[٥٦] مختصر تفسير الطبري, ج١, ص٧٠.

هۆکارەکەشی نازانین تەنها ئەوە نەبێت, کە لە هۆزێکی پایەدارو بەهێز بووە, دەنا پەیامبەر بەم کارە ڕازی نەدەبوو".

پاشان باسی (أميمة بنت شراحيل) دەکات و دەڵێ: "ئەم ژنەشی خۆی تەسلیم ناکاو هەر ئەو شەوە تەڵاق دەدرێت".

دەڵێین:

ئەمە سەراپای نەزانی و دەمکوتینە لەکاریێ, کە مەریوان هەر سەریشی لێ دەرنەکردووە, چونکە:

١ – ئەم دوو ناوە هەردووکیان ناوی یەك ئافرەتە, چونکە (أميمة) وەك (هشام بن الكلبي) دەڵێ: ناوی (أسماء بنت النعمان شراحيل)ە, هەروەها (محمدی کوڕی ئیسحاق) و (محمد کوڕی حبیب)و کەسانی تریش بەدەق هەروایان وتووە, (إبن حجر) لە (فتح الباري)دا دەڵێ: "دەشێ ناوی خۆی (أسماء) بووبێت لەقەبەکەشی (أميمة)"[٥٧].

٢ – (أسماء) باسەکەی لە (بوخاری)دایە بەم جۆرە:

(أبي أسيد) دەڵێ: "پێغەمبەر ئافرەتێکی خواست لە خێڵی (الجون) فەرمانی پێکردم بچم بیهێنم, چوم هێنام لە جێگەیەك, کە پێی دەوترا (الشوط) لە پشت کێو (ذوباب) لە قەڵایەك دامنا, پاشان هاتم بۆ لای پێغەمبەر و پێم ڕاگەیاند, ئەویش ڕۆشت و ئێمەش لەگەڵیدا چوین". لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێ: "ئافرەتەکەم لە نێو خێڵی (بنی ساعدة)دانا, ئیتر ئافرەتانی ئەو خێڵە دەچون بۆ لای بۆ بینینی, پاشان پێغەمبەر بە ئێمەی فەرموو: ئێوە لێرەدا دابنیشن, ئێمەش دانیشتین و ئەو چووە ژورەوە, دوایی ئافرەتەکەیان هێناو (دایەن)ەکەشی لەگەڵیدا بوو, پێغەمبەر پێی فەرموو: خۆت ببەخشە, ئەویش دەڵێ: چۆن شاژن خۆی دەبەخشێ بە کەسێکی بازاڕی, جا پێغەمبەر دەست دەبات تا هێوری بکاتەوە". لە گێڕانەوەیەکی تردا: "کە پێغەمبەر دەچێتە ژوورەوە دەبینێ ئافرەتێك سەری داخستووە ئەویش, کە قسەی لەگەڵ دەکات دەڵێ: پەنا دەگرم بەخوا لە تۆ, ئیتر پێغەمبەریش پێی دەفەرموێ: پەنات گرت بە پەنا گرێکی زۆر گەورە, پاشان دێتە دەرەوەو بە (ئوسەید)دەڵێ: دوو پۆشاکی سپی پێ بدەو ڕەوانەی کەرەوە بۆ لای کەس و کاری"[٥٨].

٣ – (إبن المنير) کە ڕاڤەکارێکی تری (صحيح البخاري)یە دەڵێ:

"بۆیە ئەو ئافرەتە وتی: "چۆن شاژن....". ئەمە پاشماوەیەکی سەردەمی نەفامی بووە تیایدا, چونکە ئەو ئافرەتە بەلایەوە دوور بووە کەسێك پادشا بێت شوو بکات بە کەسێك کە پادشا نییە"[٥٩].

کەواتە قسەکەی مەریوان کە دەڵێ: "وا دەردەکەوێ کەسێکی...." نەخێر نە هۆشیار بووەو نە هیچ, بەڵکو هەمان ئەو دەستورەیە, کە لە نێو کۆمەڵگای ئەم سەردەمەدا دونیا پەرستی زاڵبووە بەسەر کەسەکاندا.

پێغەمبەر لە فارس و ڕۆم نەترساوە و حسابی بۆ نەکردوون, تاکو لە خێڵێکی چەند کەسی بترسێ؟!.

٤٥ – لەلاپەڕە (١٣٩)دا, باسی (فاطمة بنت الضحاك) دەکات, دەڵێ: "داوای لێ کردووە پەیامبەر تەڵاقی بدات, ئەویش تەڵاقی داوە".

دەڵێین:

ئەی بۆ لەپاش تەڵاق دانەکەی وتە بەناوبانگەکەی (فاطمة بنت الضحاك)ت نەهێناوە کە دەیوت: "أنا الشقية" واتە: بەڕاستی من سەرگەردانم و سەرلێ شێواوم, دیارە, چونکە شوی بە پێغەمبەر نەکردووە![٦٠].

---

[٥٧] فتح الباري, ج٩, ص٤١٠, رقم الحديث (٥٢٥٥).

[٥٨] ئەمە تەواوی ئەو گێڕانەوانە بوو کە (ابن الحجر) لە (فتح الباري)دا هێناویەتی. بڕوانە: فتح الباري, ج٩, ص٤٠٩–٤١١, رقم الحديث (٥٢٥٥).

[٥٩] فتح الباري, ج٩, ص٤١٠.

[٦٠] بڕوانە: تفسير القرطبي, ج١٤, ص١٦٧.

٤٦ – لەلاپەڕە(١٤٠) لەبارەی (قتیلة)وە دەنوسیٚ: "ئەم ژنە هەرچەندە مارە بڕی بووە, بەڵام وەك سەرچاوەكان باسی دەكەن خۆشەویستێكی گیانی بە گیانی هەبووەو پێش ئەوەی بگوازرێتەوە لەگەڵ خۆشەویستەكەی لە ئیسلام هەڵدەگەڕێتەوەو ڕادەكەن". دوایی تەفسیری (قورتوبی) وەك یەكێك لە سەرچاوەكان ئاماژە پیٚ دەدات.

دەڵێین:

ئەمەش یەكێكی ترە لە هەڵە گەورەكانی مەریوان, كە نەشارەزایی لە وەرگێڕانی دەقەكە بۆ كوردیدا پێوە دیارە, چونكە:

سەرچاوەكان ئاوها لەبارەی ئەم ئافرەتەوە دەنوسن: " (قتیلة بنت قیس) أخت (الأشعث بن قیس) زوجها إیاه الأشعث, ثم أنصرف إلى حضرموت, فحملها إلیه, فبلغه وفاة النبی فردها إلى بلاده, فأرتد وأرتدت معه"[٦١].

واتە: (قتیلة كچی قیس) خوشكی (أشعث كوڕی قیس), (أشعث)ی برای لە پێغەمبەری مارە كرد, (أشعث) چوو بۆ (حضرموت). پاشان پێغەمبەر (قتیلة)ی نارد بۆ لای براكەی, پاش ئەوە (أشعث) وەفاتی پێغەمبەری پیٚ گەیشت, ئەوە بوو (أشعث), (قتیلة)ی ناردەوە بۆ وڵاتی خۆی و لەویٚ (أشعث) لە ئیسلام هەڵگەڕایەوەو (قتیلة)ش لەگەڵیدا هەڵگەڕایەوە.

ئیتر خۆشەویستی گیانی بە گیانی لە كوێدا هاتووە؟ لە كام سەرچاوەی باوەڕپێكراودا؟, ألا لعنة الله على الكاذبین؟!.

٤٧ – لەلاپەڕە(١٤٠)دا, باسی (العالیة بنت ظبیان) دەكات, كە گوایە تەنها لەبەرئەوەی (تووكە بەر)ی سپی بووە تەڵاقی دەدات. پاشان كتێبێكی كەسێكی (شیعە) دەكاتە سەرچاوە.

دەڵێین:

هیچ یەكێك لە سەرچاوە باوەڕپێكراوە بەناوبانگەكانی ئیسلام, ئاماژەی بەم هۆیە نەكردووە, ئەگەر ڕاستی دەكرد, تەنها ناوی یەك سەرچاوەی باوەڕپێكراوی ئاماژە پێبدایە, ئەوەشی ئاماژەی پێداوە تەنها كتێبی نووسەرێكی (شیعە)یەو ئەویش بەبیٚ سەرچاوە ئەو شتەی نووسیوە!.

٤٨ – لەلاپەڕە(١٤١)دا, دەڵیٚ: "قورتوبی دەڵێت: هەندێكی تریش كە داوای كردوون, بەڵام مارەی نەكردوون و وازی لیٚ هێناون, یاخود شویان پیٚ نەكردووە".

دەڵێین:

ئەوەی لە (قورتوبی)دایە, ئەمە دەقە عەرەبییەكەیەتی: "فأمَّا من خطبهن فلم یتم نكاحه فمعهن", بەڵام ئەوانەی داوای كردوون و هاوسەرگیرییەكەی لەگەڵیاندا تەواو نەكردووە"[٦٢].

ئەم دوو دەستەواژەیە نێوانیان چەندە؟؟!!

٤٩ – هەر لە هەمان لاپەڕەدا, دەڵیٚ: "هەروەها ژنێكیش كە لە صەحیحەكەی بوخاری و موسلیمیشدا هەیە, بەڵام ناویان نەنوسیوەو نازانین كێیە". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (بوخاری) دەكات.

دەڵێین:

١ – ئەوەی لە (بوخاری)دایە ناوی ئەو ئافرەتە هاتووەو ئەویش ناوی (خەولەی كچی حەكیم)ە[٦٣].

٢ – ئەی كە دەڵیٚ لە "موسلیمیشدا..." كوا؟ ئەگەر ڕاست دەكەیت بۆ ئاماژەت بە جێگەو شوێنەكەی نەكردووە؟ یان ئەوەتا درۆیەو بوونی نییە.

[٦١] بڕوانە: تفسیر القرطبی, ج١٤, ص١٦٩–١٧٠، رفع الخفا شرح ذات الشفا, ج٢, ص١٦، زاد المعاد, ج١, ص١١٣، البدایة و النهایة, م٣, ج٥, ص٢٩١.

[٦٢] بڕوانە: تفسیر القرطبی, ج١٤, ص١٦٨.

[٦٣] صحیح البخاری, رقم (٥١١٣)

٥٠ – لەلاپەڕە (١٤٤)دا, ئایەتی (ووجدك عائلاً فأغنى) وا ڕاڤەی دەکات "بەهەژاری و نەداری دەبینرایت و دەوڵەمەندی کردیت".

دەڵێین:

ڕاڤەی ڕاست ئەوەیە, کە زانایانی (تەفسیر) کردوویانە, لەوانە: لە (تفسیری جلالین)دا, وا ڕاڤە کراوە "تۆ هەژار بوویت و خوا دەوڵەمەندی کردیت بەوەی, کە قەناعەتی پێدایت بەوەی کە دەستت دەکەوێ لە دەستکەوتی جەنگ و شتی تر"[٦٤].

٥١ – لەلاپەڕە (١٥٠)دا, لە پرسیارێکی (عائیشة) کە پرسیار لە پێغەمبەر دەکات, ئایا گەر لە دۆڵێکدا دوو دار هەبوو, یەکێکیان لێی خورابوو, ئەویتریان لێی نەخورابوو, تۆ لە کامەیان وشترەکەت دەلەوەڕێنی؟ لە وەڵامدا دەفـــــــــەرموێ: لـــــــــەوەی کـــــــــە لێــــــــــی نــــــــــەخوراوە.

مەریوان, لە سەر ئەم وەڵامە, قسە دەکات و دەڵێ: "بەڵکو نەیتوانیوە بەسەر غەریزە سروشتییەکەی خودی خۆشیدا زاڵ بێت, هەر بۆیە چونە لای کچێکی تەمەن نۆ ساڵ جگە لە پەیامبەری ئیسلام دەرونی هیچ ئینسانێك پێی ئاسودە نییە".

دەڵێین:

مەبەستی نە عائیشەو نە پێغەمبەریش ئەوە نەبووە, کە مەریوان بۆی چووە, بەڵکو ئەوەتا (ابن حجر) وەك ئەوەی بیەوێ وەڵامی مەریوان بداتەوە, لەسەر ئەو وەڵامە دەڵێ: "مەبەستی پێی خۆشەویستی بووە و لەوەش وردتر"[٦٥].

واتە: لە نێو خێزانەکانیدا (عائیشە)ی خۆشتر دەوێت, چونکە ئەوانی تر پێشتر مێردیان هەبووە و ئەم نەیبووە.

٥٢ – لەلاپەڕە (١٥٩)دا, لەباسی ڕووداوی هەڵات و بوختانەکەی, کە بۆ عائیشە کرا, شتی زۆر سەیر لە مەریوان ڕوودەدات, کاتێ وەریدەگێڕێتە سەر زمانی کوردی, تادەگاتە سەر ئەوەی کە دەڵێ: "صەفوان کوڕی موعەتتەڵی سەلەمی لە لەشکرەکە بەجێمابوو, ئەویش خەوی لێکەوتبوو, بەشەو(خەو ڕەو)ی کردووە (واتە: لە کاتی خەودا بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ هەڵسابوو ڕۆشتبوو), لە لای جێگەکەی مندا خەوی لێکەوتبۆوەو ڕۆژمان لێببووەوە".

دەڵێین:

ئەو دەقەی مەریوان کردویەتی بە کوردی, ئەمە دەقە عەرەبییەکەیەتی: "وکان صفوان بن المعطل السلمي, من وراء الجيش فأدلج فأصبح عند منزلي فرآى سواد إنسان نائم فعرفني...".

صەفوان, لە بەرەبەیاندا سەر خەوێ دەشکێنێ, لەپاشدا شەو لەناو شەو دەگرێ بەدەمەوەو, دەکەوێتە ڕێ و لەدەمی بەیانیدا گەیشتە لای من, سەفوان (عادەتی وا دەبێت هەموو جارێ لە سوپاکە دوا دەکەوێ تا دەڕۆن, ئەوجا بە شوێنەواری سوپاکەدا تێدەپەڕێ, ئەگەر شتێ لە سوپاکەدا کەوتبێ هەڵیدەگرێتەوەو شوێنیان دەکەوێ, کە نزیك دەبێتەوە ڕەشایی و تارمایی مرۆڤێکی نوستوو دەبینێ, کە دێتە پێشەوەو تەماشام دەکات دەمناسێتەوە[٦٦].

جا بەڕێزان:

١ – سەفوان, بەدەم خەوەوە نەڕۆشتووە, وەك مەریوان لێی تێدەگات, بەڵکو ئەو ئەمە پیشەی بووە لە دوا سوپا دوا کەوتووە, بۆ ئەوەی گەر شتێك بەجێمابێت ئەو هەڵیگرێتەوەو پاشان بگاتەوە بە سوپاکە, ئەمە پلەیەك بووە پێغەمبەر داویەتی بە (صفوان) لە نێو سوپادا ئەوە ئیشی بێت[٦٧].

---

[٦٤] تفسیر الجلالين, ئایەتی ٦ی (الضحى).

[٦٥] فتح الباري, ج٩, ص١٣٩.

[٦٦] بڕوانە: التجريد الصريح, وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان, بە٣, لا٢١٥.

[٦٧] فتح الباري, ج٩, ص٥٣٩ .

٢ – لە لای عائیشە نەنوستووە, بەڵکو کاتێك لەو جێگەیەی کە خۆی لێی نوستووە دێت و پاشان لە دوورەوە عائیشە دەبینیٚ, وەك لە گێڕانەوەکەدا هاتووە.

٣ – (صفوان) کە دەیبینیٚ دەڵیٚ "إنا لله وإنا إليه راجعون" جا عائیشە بەمە خەبەری دەبێتەوە, مەریوان ئەمەی باس نەکردووە, چونکە فێڵەکەی کەشف دەبوو, ئەگەر باسی بکردایە ئەوە دەبووە بەڵگە (صفوان) لە نزیك عائیشە نەخەوتووە, ئەمەش زیان بە پڕۆژەکەی مەریوان دەگەیەنێت! *.

٥٣ – لەلاپەڕە(١٦٦)دا, لەسەر (ريحانة بنت زيد) دەڵیٚ: "هیچ بۆ ئەم ژنە نەمابووەوە ئەوەندە نەبێت ببێتە یەکێك لە ژنەکانی پەیامبەرو دواییش حیجابی بەسەردا سەپاند". دوایی لە خوارەوە دەقە عەرەبییەکەی دەنوسێت.

دەڵێین:

کاتیٚ دەقە عەرەبییەکە دەبینین, تەواو پێچەوانەی دەقە عەرەبییەکەی مەریوانە:

١ – مەریوان, وای نوسیوە کە بەزۆر بوبێتە خێزانی پێغەمبەر, بەلاٚم دەقە عەرەبییەکەی کە هەر مەریوان خۆی هێناویەتی ئاوهایە:

"فقال: إن إخترت الله و رسوله اختارك رسول الله لنفسه, فقلت: فإني اختار الله ورسوله...".

پێغەمبەر پێی فەرموو: ئەگەر خواو پێغەمبەرەکەی هەڵدەبژێریت, ئەوا پێغەمبەری خواش تۆ هەڵدەبژێرێت, منیش وتم: من خواو پێغەمبەرەکەی هەڵدەبژێرم.

کەواتە: شوکردنەکە ئازادانە بووە, نەك زۆرە ملیٚ.

٥٤ – لەلاپەڕە (١٦٨)دا, باسێکی سەبارەت بە (صفية) نوسیوە. پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە دەکات بە (بوخاری)و نوسیویەتی: "صحيح البخاري, كتاب النكاح, باب: ما يذكر في الفخذ".

دەڵێین:

من ئەمەیان دەدەمە دەست خوێنەر, با بچن سەیری ئەو سەرچاوەیە بکەن, کە مەریوان ئاماژەی پیٚ کردووە, بزانن باس و خواسی ئاوەهاو سەرە باسی وا لە (صحيح البخاري)دا هەیە؟ بە ڕاستی ئەو کابرایە زۆر "ئەنتیکە"یە!!!

٥٥ – لەلاپەڕە(١٧٠)دا, لەبارەی (جووەیرییە) دەقێکی عەرەبی دێنیٚ و دواتر دەیکات بە کوردی, شتی زۆر سەیری لیٚ ڕوودەدات,

مەریوان ئاوهای نوسیوە:

عائیشە دەڵیٚ: "لە کاتێکدا کە دەستکەوتەکانی هۆزی (بني المصطلق) یان دابەشکرد, ژنێك بەناوی (جويرية بنت الحارث) بەر (ثابت بن قيس الشماس) دەکەوێت, ....ڕۆژێك هاتە ماڵی ئێمە تا لە دەست (ثابت)پەنا بە پەیامبەر بگرێت".

دەڵێین:

ئەمە دەقە عەرەبییەکەیەتی: "فأتت رسول الله تستعينه على كتابتها".

هات بۆ لای پێغەمبەر کە یارمەتی بدات لەسەر ئەوەی هەندیٚ پارەی بداتیٚ, تا خۆی لە ئاغایەتی (ثابت) دەرباز بکات.

"مكاتبة": ئەوەیە سەر گەورەی کۆیلە, یان کەنیزەك پەیمانێك دەنوسێت, ئەگەر هەر کات کۆیلەکە, یان کەنیزەکەکە ئەوەندە پارەی بۆ بهێنێت, ئەوا ئازاد بێت.

٥٦ –پاشان مەریوان هەر لەو لاپەڕەیەدا دەنوسێت: "پەیامبەر زەوقی دەچێتە سەرو دەیبات بۆ خۆی و لە خۆشیدا کۆمەڵێکی زۆر لە سەبایەکان ئازاد دەکات".

---

*بۆ ئاشنا بوونی زیاتر بڕوانە (صحيح البخاري) ژمارەی فەرمودە(٤٧٥٠).

دەڵێین:

دەقە عەرەبییەکە ئاوهایە: "قال: أقضي كتابتك و أتزوجك, قالت: نعم, قال: قد فعلت, وخرج الخبر في الناس...فقال الناس أصهار رسول الله فأرسلوا ما في أيديهم....".

پێغەمبەر پێی دەفەرموێ: من پارەی ئازاد بونەکەت بۆ دەدەم و پاشان مارەت دەکەم, ئەویش وتی: باشە, فەرموی ئەوا ئەو کارەم کردو ئازادم کردی, هەواڵی مارە کردنەکە بە ناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە...خەڵکەکەش وتیان: خزم و کەس و کاری پێغەمبەر چۆن دەبێت لە ژێر دەستماندا بێت, ئیتر ئەوانەی لە ژێر دەستیاندا بوون لە سەبایاکان هەموویان ئازاد کردن.

٥٧ – لەلاپەڕە(١٧١)دا, لە باسی (هند)دا دەڵێ: "لەبەر جوانی هێنای...خەڵك زۆر باسی جوانیان دەکرد".دوایی تەفسیری (قورتوبی) وەك سەرچاوە ئاماژە پێ دەدات.

دەڵێین:

ئەوە تەفسیری (قورتوبی) باوەڕ بکەن ئەوەی, کە باسی ناکات جوانی و شۆخ و شەنگی ئەو ئافرەتەیە, دیارە مەریوان زۆر حەز لە بەکارهێنانی "سێکس, جوان, لەزەت, زەوق" دەکات, دەنا بۆچی باسێك کە باس نەکراوە ئەو لە خۆیەوە دەینوسێ؟!.

٥٨ – لەلاپەڕە (١٧١و١٧٢)دا, لە بارەی (حفصة)وە دەنوسێ: "چەندین جار کێشە کەوتۆتە نێوانیانەوە بە ڕادەیەك چەند جارێك گەیشتۆتە تەڵاقدان و هێناویەتییەوە".

دەڵێین:

(حفصة)یەك جار مارەکراوەو یەك تەڵاقیش دراوە[68].

٥٩ – لەلاپەڕە (١٧٣)دا, لە باسی(ماریة‌ی قبطی)دا, دەقێکی عەرەبی دێنێت, پاشان دەیکات بە کوردی بەم جۆرە: "ئەم کەنیزەکەی لەگەڵ خوشکێکیدا بەناوی سیرین و کوڕە ئامۆزایەکی بە ناوی مابور بەخشی بە پەیامبەر, ئەویش سیرینی بەخشی بە صەحابەیەك بەناوی (حسان بن ثابت), بەڵام ماریە زۆر جوان و قەشەنگ دەبێ ئەم جوانییەشی وای لێ دەکات پەیامبەر لای خۆی بیهێڵێتەوە".

دەڵێین:

ئەمە ئەو دەقە عەرەبییەیە, کە مەریوان کردویوتی بە کوردی: "وأهدى معها أختها سيرين و خصياً يقاله مابور, فوهب رسول الله سيرين لحسان بن ثابت....".

با بێین ئێمەش ئەو وتەیە بکەین بە کوردی: "ماریە, لەگەڵ خوشکەکەی کە ناوی سیرین بوو, کەسێکیش کە عەورەتی بڕابوو (بۆیە وامان نوسیوە, چونکە دوایی بەبەڵگەوە ڕوونی دەکەینەوە کە عەورەتی بڕاوە) پێیان دەوت (مابور) بەخشییە پێغەمبەر, پێغەمبەریش سیرینی بەخشییە (حسان بن ثابت)".

جا بەڕێزان:

١ – من ئێوە دەکەمە دادوەر لە کوێدا "شۆخ و شەنگی" ماریە باس کراوە؟؟!!.

٢ – بۆ نەهاتووە وشەی "خصياً" بکات بە کوردی؟.

٦٠ – لەمە سەیر تر ئەوەیە, لە هەمان لاپەڕەدا, دەقێکی عەرەبی دێنێ, پاشان لە لاپەڕەی ئەودیودا دەیکات بە کوردی, وەك پیشەی هەمیشەیی, چەند جارێك دەکەوێتە چاڵی نەزانینەوە, بۆ نمونە دەڵێ:

"پەیامبەریش لەگەڵ ماریە جووت بوو تا دووگیانی کرد, ئەو کاتە کوڕە مامەکەی لێی دوور کەوتبوەوەو لەگەڵی جووت نەدەبوو...".

دەڵێین:

[68] بڕوانە: زاد المعاد, ج١, ص١٠٦، ابو داود, رقم (٢٢٨٣) باب المراجعة، ابن ماجه, رقم (٢٠١٦)، تفسير القرطبي,ج١٤, ص١٦٥.

فەرموون ئەمە ئەو بەشەی دەقە عەرەبییەکەیە, کە مەریوان تەرجەمەی کردووە: "فوقع عليها وقعة فاستمرت حاملاً, فعزلها إبن عمها...".

پێغەمبەر جارێك چووە لای و ئیتر ماریە بەمە دوو گیان دەبێت, پاشان ئامۆزاکەی لێی دووردەکەوێتەوە.

جا بەڕێزان: بڕواننە ئەوەی کە مەریوان نوسیویەتی: "...ئەو کات کوڕە مامەکەی..." بزانن چەندە واتاکەی جیاوازە لەگەڵ دەقە عەرەبییەکە.

٦١– هەر لە درێژەی ئەو دەقە عەرەبییەو بە کوردی کردنیدا, مەریوان, دەنوسێ: "ڕۆژێك منداڵەکەی هێناو پەیامبەر لە منی پرسی, چۆنی دەبینی, ئایا لە من دەکات؟ منیش (واتە عائیشە دەڵێ) کە سەیرم کرد, ئێستێکی ژنانەم کردوتم: شێوەتان لە یەك ناچێت".

دەڵێین:

دەقە عەرەبییەکە ئاوهایە: "فدخل به على النبي ذات يوم, فقال كيف ترين؟ فحملني ما يحمل النساء من الغيرة, قلت: ما ارى شبها....".

پاشان ڕۆژێکیان منداڵەکەیان هێنا (واتە منداڵەکەی ماریە) بۆ لای پێغەمبەر, فەرموی: عائیشە چۆنی دەبینی؟ (وەك بڵێی ئایا لە من دەچێت؟) عائیشە دەڵێ: (منیش ئەوەی کە ئافرەتان لە بارەی (غیرة)وە توشی دێن بەسەر منیشدا هاتو ئەو غیرەیە وای لێ کردم کە بڵێم: لێك چونی تێدا نابینم.

٦٢– لەلاپەڕە (١٧٤)دا, مەریوان باوەڕی وایە کە ماریە لەگەڵ کوڕە مامە عەورەت بڕاوەکەیدا داوێن پیسی کردبێت, دەڵێ:

"لە ڕاستیدا پێم وایە کە مەسەلەی ڕابواردنی ماریە لەگەڵ مابووری ئامۆزای ڕووداوێکی ڕاستەقینە بێت, ئەویش لەبەر دوو هۆ:

یەکەمیان: بەپێی ڕیوایەتەکە ئەو منداڵەی لە دایك دەبێ شێوەی نەچۆتەوە سەر پەیامبەر.

دووهەمیان: (بەگوتەی مەریوان) لە بەرئەوەی پێغەمبەر کاری جووت بوونی زۆر کردووە شەهوەتەکەی خەست نەبووەو ئەمەش وا دەکات کە چانسی منداڵ دروست بوون کەم بکاتەوە".

دەڵێین:

یەکەم بەهانە (خودی عائیشە) هۆکاری ئەو قسەیەی کە کردوویەتی (گوایە کە منداڵەکە لە پێغەمبەر ناچێت) هۆکارو پاڵنەرەکەی ڕوون کردۆتەوە, کە ئەویش (تووڕەبوون و ئەو غیرەو ئێرەییە)یە کە لە نێوان سەر بە هەوێدا ڕوودەدات.

دووەم بەهانە (شەهوەت ڕوون بوون)ەوە, شتێکی نیسبییەو مەرج نییە ئیتر ئەو کەسە چانسی منداڵ دروست کردنی نەبێت, بەتایبەت کە هەموو سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان باس لەوە دەکەن (ئیبراهیم) کوڕی پێغەمبەرەو لە (مارییە) بووە.

وەڵامێکی بەهێز:

بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو بوختانەی, کە مەریوان کردوویەتی, فەرمودەیەك هەیە لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا باس لەو ئامۆزایەی (ماریە) دەکات, کە (عەورەتی بڕابوو), ئەویش ئەمەیە:

(أنس) دەڵێ: "أن ابن عم مارية كان يتهم بها، فقال النبي (صلى الله عليه وسلم) لعلي بن أبي طالب (رضي الله عنه) اذهب فان وجدته عند مارية فاضرب عنقه، فأتاه علي فاذا هوفي ركيّ يتبرد فيها، فقال له علي: أخرج فنا وله يده، فأخرجه، فأذا هو مجبوب ليس له ذكر، فكف عنه علي، ثم أتى النبي (صلى الله عليه وسلم) فقال يا رسول الله: انه مجبوب ما له ذكر".[٦٩]

---

[٦٩] رواه مسلم في كتاب (التوبة) رقم الحديث(٢٧٧١), وأحمد في المسند (٢٨١/٣) والحاكم(٤٠/٤).

واتە: ماموٚزاکەی (ماریە) توٚمەتبار کرا بەوەی, کە لەگەڵ ماریەدا کاری خراپی کردووە، پێغەمبەریش (صلی اللە علیە وسلم) بە عەلی فەرموو: برۆ ئەگەر بینیت لە لای ماریە, بدە لە گەردنی، عەلی رۆیی کە دەبینێ ئاموٚزاکەی مارییە لەناو بیرێکدا خوٚی فێنك دەکاتەوە، عەلی پێی دەڵێ: وەرە دەرەوە، ئەویش دەستی دەداتێ و دەیهێنێتە دەرەوە، کاتێك کە عەلی دەبینێ سەیر دەکات ئاموٚزاکەی مارییە (کێر)ی براوەو نییەتی، ئیتر عەلی وازی لێدێنێ، پاشان دەچێت بوٚ لای پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کابرایە (کێر)ی نییە.

کەواتە:

١ –هەرچییەك دەربارەی مارییەو ئاموٚزاکەی بوترێ, جگە لە ناماقوڵی هیچی تر نییەو مەریوان شەرم نایگرێ, کە ئەم راستییە باش دەزانێ, بەلاٚم خوٚی لێ گێل دەکات وادەزانێ خەڵکی زوٚر بێئاگان, تا بەم جوٚرە قسە سەقەتانە فریویان بدات، بەلاٚم زوٚر هەڵەیەو با ئەوەستە بخاتە نێو گیرفانی, کە پێی وابێ دەتوانێ فێڵ و چاو بەست لە خەڵکی بکات.

٢ – ئەم فەرموودەیە روونکەرەوەی ئەو وشەیەیە, کە لە ریوایەتەکەی (حاکم)دا مەریوان هێناویەتی بە لەفزی خەساو (خصیاً).

٦٣ –شتێکی زوٚر سەیرتر, کە لە مەریوان روویداوە ئەوەیە کە لە بە کوردی کردنی ئەو دەقەی باس لە گفتوگوٚکەی عائیشەو پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) دەکات دەربارەی منداڵەکەی (مارییە), مەریوان لە لاپەرە (١٧٤)دا, لە زمانی عائشەوە دەنوسێ: "دەستەیەك لە بوختانچییەکان بوختانی ئەوەیان کرد کە کورە مامەکەی (مابور) لەگەڵی جووت بووە و ئەو منداڵەی سکی هی مابورە، من ئەم قسەیەم بیستبوو, بەلاٚم نەم درکاندبوو, تا مارییە منداڵاکەی بوو....".

دەڵێین:

بابێین ئەو دەقەی مەریوان کردوویەتی بە کوردی, لە لاپەرە (١٧٤)ی کتێبەکەی مەریوانەوە بهێنین, تا هەموو لایەك بزانن مەریوان چەندە کەودەنە بەکاری وەرگێران، دەقەکە ئاوەهایە: "فقال أهل الافك و الزور: من حاجته الی الولد، أدعی ولد غیره".

واتە "بوختانچی و هەلاٚتبازەکان وتیان: موحەممەد لەبەر پێویستی بە منداڵی کوڕ، لە تاوا بانگەشەی کوڕی خەڵکی تر دەکات و دەیکات بەهی خوٚی".

بروانن, مەریوان, نەك هەر نەیزانیوە واتاکەشی بکات، بەڵکو شتی واشی بوٚ زیادکردووە, تەنها مەگەر لە قاموسە ناموٚکەی خوٚیدا هەبێت!.

٦٤ –لەلاپەرە (١٧٧)دا, هاتوە راڤەی پێنج ئایەتی سەرەتای سورەتی (التحریم)ی کردووە, کەچی کەوتووە بە سەر بارێك بەردی گەورەوە لەو بەشە ئایەتەی کە دەفەرموێ: "ان تتوبا الی اللە فقد صغت قلوبکما...". مەریوان نوسیویەتی: "ئەگەر ئێوە تەوبە بکەن ئەوە باشە, چونکە دڵەکانتان رەش بووە".

دەڵێین:

(راغیب ئەسفەهانی) لە راڤەی وشەی "صغا"دا دەڵێ: واتە لادان[٧٠].

(قورتوبی) دەڵێ: "فقد صغت قلوبکما" واتە: "زاغت ومالت عن الحق"[٧١].

واتە: لادان لە راستی.

(سیوطی) دەڵێ: "مالت"[٧٢].

جا بەرێزان, مەریوان کە دەڵێ: "دڵەکانتان رەش بووە". لە کوێی زمانی عەرەبی و لە چ راڤەیەکی زانایانی تەفسیر ئەو راڤە سەقەتەی هێناوە؟.

---

[٧٠] مفردات الفاظ القرآن، ص٤٨٥.

[٧١] القرطبی, ج١٨, ص١٨٨.

[٧٢] تفسیر الجلالین, تفسیر هذه الایة.

٦٥ –لەلاپەرە (١٧٧)دا, لەبارەی دوو ژن بە ناوەکانی (أسماء بنت النعمان) و(سناء بنت الصلت السلمية)وە دەڵێ: "لە بەر جوانی هێنانی, بەڵام هەریەك لەوانە چیرۆکی مارەکردن و تەڵاق دانیان دیار نییە". پاشان دوو گێڕانەوەی (حاکم) لە بارەیانەوە دەنوسێ.

دەڵێین:

١–سەبارەت بە (أسماء) لە باسی (أسما)دا باسمان لێوە کرد.

(بڕوانە بڕگەی ٤٤).

٢–نەزانینی (مەریوان) لەوەدایە, کە لە لاپەرەی (١٤٠)دا, باسی ئەم ئافرەتەی کردووە و لە (١٧٧) جارێکی تر دووبارەی کردوەتەوە، وای زانیوە دوو ناوی جیان، ئەمەش یەکێکی تریەتی لە داماوییەکانی, کە خۆشی بۆی چارەسەر ناکرێت.

٣ – لە باسی (أسماء)دا, چیرۆکی مارەکردن و تەڵاقدانی بە درێژی باسمان کرد، دەتوانن بگەڕێنەوە سەری.

٤ – مەریوان, گەر بچوکترین هەستی زانستی هەبوایە, دەیزانی هەر لەو گێڕانەوەی کە خۆی نوسیویەتی چیرۆکەکەیانی تێدایە.

أ– لە بارەی (أسماء) دەڵێ: "فلما دخل بها دعاها فقالت: تعال أنت فطلقها، کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەچێتە ژوورەوە بۆلایو بانگی دەکات، ئەویش دەڵێ: خۆت وەرە، ئیتر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تەڵاقی دەدات*".

ب– لەبارەی (سناء) یشەوە دەڵێ: "پێش ئەوەی پێغەمبەر بچێتە لای ئافرەتەکە دەمرێت".

جا دیارە مەریوان ئەمانەی بە چیرۆکی تەڵاقدان نەزانیوە، چونکە لای ئەو وەك تەواوی بۆچونەکانی تری دەبێ هەرایەکی گەورە دروست ببێت, ئینجا مەریوان بە هەند وەریدەگرێ.

٦٦ – لەلاپەرە (١٧٩)دا, دەقێکی عەرەبی دێنێ بەم جۆرە: "فکان يقول أول من أسلم من الرجال أبوبكر، ومن النساء خديجة، ومن الصغار علي، ومن الموالى زيد بن حارثة ومن العبيد بلال". پاشان لە پەراوێزەکەدا تەفسیری (قورطبي) وەك سەرچاوە ئاماژە پێدەدات و دەنوسێ[٧٣].

دەڵێین:

١ – لە تەفسیری (قورتوبی) ئایەتی (١٠٠)ەوە هێناویەتی, کە بە ئایەتی "السابقون الاولون" دەست پێدەکات.

٢ –پێموایە نەیزانیوە راڤەی "فکان يقول" بکات, گەر نا بۆ نەیکردووە، چونکە خەڵکانێك لەوانەیە ئەو دەقە بخوێننەوەو دواتر نەزانن چ باسە.

٣ – ئێمە لێرەدا ئەوە راست دەکەینەوە, هەم بۆ مەریوان تا تۆزێك چاوی بکرێتەوەو هەم بۆ خوێنەرانیش تا بزانن واتای چی:

"فکان يقول" واتە: ئەو دەیوت، مەبەست لە (أسحاق بن ابراهيم بن راهويه الحنظلي)یە، ئەمە وتەی ئەوە.

٤ – لە دەقی (تفسير القرطبي) دەڵێ: "ومن الصبيان علي"[٧٤].

مەریوان, لەوانەیە لە دڵی خۆیدا وتبێتی جیاوازی "الصبيان" و "الصغير" هیچ نییە، بۆ نەیەم ئیبداع بکەم، بەڵام نازانێت ئەوە خیانەتە لە (نقل)دا و متمانەی لەکەدار دەکات، وەك لە زۆربەی نوسینەکانیدا ئەمە پیشەیەتی!.

* ئەم ڕوایەتە لاوازە، دواتر لە بەشی وتە لاوازەکاندا قسەی لە سەر دەکەین.

[٧٣] تفسير القرطبي, تفسير أية التوبة ٩٩ ومن الاعراب.

[٧٤] بڕوانە: تفسير القرطبي أية ١٠٠ التوبة / المسألة الرابعة.

٦٧ – لەلاپەرە (١٧٩)دا, لەبارەی (زید)ەوە دەنوسێ: "لە بنەڕەتدا ئەم منداڵە لە کاروانێك جێ دەمێنێ و کەسێك بە ناوی (حکیم بن حزام بن خویلد) هەڵیدەگرێتەوە". پاشان لەلاپەرە (١٨٠) لەگەڵ ئەو دەقە عەرەبییەی لە ژمارە (٦٦)دا رابورد تێکەڵی دەکات و وەك سەرچاوە ئاماژە بە (تفسیر القرطبی) ئایەتی (٩٩)ی (التوبە) دەدات.

دەڵێین:

١ – ژیانی (زید) لە وێدا باسی نەهاتووە, ئەوە (تفسیری القرطبي)و ئەو جێگەیە, گەر شتی وای تێدا بوو, داندەنێم بەوەی کە مەریوان شتێك دەزانێ!!!

٢ – (زید) لە شامەوە وەك (کۆیلە) دەهێنرێ، دەستەیەك سوار لە خەڵکی (توهامە) لە شەردا گرتویانە. پاشان (حکیم بن حزام بن خویلد) لەو دەستەیە دەیکرێتەوە [٧٥].

(ابن الجوزی) دەڵێ: "دایکی ناوی (سعدی کچی ثعلبة)یە لەگەڵ (زید)دا سەردانی هۆزەکەی دەکات، دەستەیەك لە سواری خێڵی (بنی القین) لە سەردەمی نەفامیدا هێرش دەبەنە سەر چەندماڵێك لە خێڵی (بنی معن) و (زید) لەگەڵ خۆیاندا دەبەن, ئەو کات (زید) کوڕێك بوو, خەریك بوو پێدەگەیشت، پاشان هێنایان بۆ بازاڕی (عکاظ) حکیم بن حزام, کە مامی (خدیجة) بوو بە (٤٠٠) درهەم دەیکڕێ" [٧٦].

جا بەرێزان, ئەوەی مەریوان نووسیویەتی: "لە بنەرەتدا..". پێتان وا نییە نەزانییە، درۆیە، بوختانە، سەقەتییە لە زانیاریی وەرگرتن و بڵاو کردنەوەدا؟!.

٦٨ – لە لاپەرە (١٨٠)دا, دەقێکی عەرەبی دێنێ بەم جۆرە: "أم کلثوم بنت عقبة بن أبی معیط (رضی الله عنه) کانت أول من هاجر من النساء یعنی بعد صلح الحدیبیة،....". لە پەراوێزەکەدا بە ژمارە ١٠٧ دەڵێ: "بڕوانە هەموو راڤەکان لە راڤەی ئایەتی الاحزاب ٤".

دەڵێین:

١–"رضی الله عنه" بۆ پیاوو نێرینە بەکار دێت، نەك بۆ مێینە، جا نازانم هەڵەی چاپە ؟ کە ئەمە زۆر دوورە، باوەڕم وایە هەڵە نەبێ و مەریوان زۆر بە ئاگاییەوە نووسیویەتی!، چونکە پێی وایە لە (راناو)یشدا دەبێ نێرو مێ یەکسان بن, تا چینایەتی نەمێنێ!.

٢ – باوەڕ بکەن خەڵکینە, کە مەریوان دەڵێ: "بروانە هەموو راڤەکان.....". من دەڵێم: گەڕامەوە سەر دیارترین ئەو سەرچاوەی راڤانەی کە مەریوان بۆ ئیشی خۆی بەکاریان دێنێ، لەو جێگەو شوێنەی مەریوان ئاماژەی بۆ کردووە شتی وای هەر تێدا نییە، نموونە ئەوە تەفسیرەکانی (القرطبي، ابن کثیر و تفسیر الجلالین).

خۆزگە ئەو کەسەی بوختانی دەکرد، دوایی تۆزێك لە دوورەوە سەر زەنشتی ویژدانیخۆی دەکرد، دەبا مەریوان لە جیاتی بنوسێ "هەموو راڤەکان"، سەرچاوەیەکی بنوسیایە, کە کەس نەیدیبێ و نەی بیستبێ، بۆ ئەوەی تا ئەندازەیەك بڕوا بە قسەکەی بکەن، چونکە ئەوەتا سێ راڤەی جیامان سەیر کردووە, لەو جێگەیەی ئەو ئاماژەی پێداوە نەمان بینیوە!.

٦٩ – لەلاپەڕە (١٨٤)دا, ئایەتی (٣٧)ی سورەتی (الاحزاب) راڤە دەکات لەسەر ئەو بەشە ئایەتەی, کە دەفەرموێت: "واتق الله" وا راڤەی کردووە: "ئەی پەیامبەر لە خوا بترسە".

دەڵێین:

---

[٧٥] تفسیر القرطبی, أیة ٤ الاحزاب, ج ١٤, ص ١١٨.

[٧٦] صفة الصفوة, م ١ ج ١, ص ١٤٦.

وشەی "اتق الله". ئەمە بەشێکە لەو وتانەی, کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئامۆژگاری (زیدی) پێدەکات، واتە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە (زید) دەفەرموێت: "ئەی زید لە خوا بترسە و زەینەب تەڵاق مەدە"[٧٧].

دەپرسم باشە بۆچی بۆ ڕاڤەی ئەم ئایەتە, هیچ سەرچاوەیەکی نەنووسیووە، وەڵامەکەی ئاشکرایە، چونکە مەریوان دەیەوێ خەڵکی چەواشە بکات, جا ئیتر بەهەر جۆر و شێوەیەك بێت، تەحەددای مەریوان دەکەم لە هیچ یەکێ لە ڕاڤەکانی قورئان "اتق الله"ی بەو جۆرە ڕاڤە کردبێ, وەك ئەوەی مەریوان کردویوتی نییە، قسەو ڕاڤەی مەریوانیش هیچ بایەخێکی زانستی و مێژوویی نییە!.

٧٠ –لەلاپەرە (١٨٥)دا, نەفامییەکی بێوێنەی مەریوانی تێدایە، کە نوسیویەتی: "موفەسیرێکی وەك (ابن کثیر) زۆری پێناخۆش دەبێ, کە ئایەتێکی لەم چەشنە لە قورئاندا ببینێت، بۆیە دەڵێت: ئەگەر پەیامبەر شتێکی بە شاراوەیی لە دڵی خۆیدا بهێشتایەتەوە, ئەوا ئەم ئایەتەی بە نهێنی دەهێڵایەوە". پاشان دەقێك لەم بارەیەوە بە عەرەبی دەنوسێت.

دەڵێین:

١– چۆن زانیت (ابن کثیر) پێی ناخۆشە!، لە کوێدا بینیوتە شتی وای نوسیبێ کە پێی ناخۆشە؟.

٢– ئەوە قسەی (ابن کثیر) نییە، بەڵکو وتەی عائیشەیەو (ابن جریر) دەیگێڕێتەوە, (ابن کثیر) تەنها نەقڵی کردووە[٧٨].

٧١– لەشێواندن و چەواشەکارییەکانی تری مەریوان لە لاپەڕە (١٨٥)دا, وەك بوختانی کردووە بەدەم (ابن کثیر)ەوە, دەستکاری دەقەکەشی کردووە!.

مەریوان, نووسیوویەتی: "أن هذه آلایة نزلت فی شأن زینب بنت جحش و زید بن حارثة، لو کان رسول الله (صلی الله علیه وسلم) کاتما شیئا من الوحي لکتم هذه الایة". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژەی بە تەفسیری (ابن کثیر) داوە.

دەڵێین:

١– "ان هذه ...". ئەمە بەم جۆرە نییە، بەڵکو ئەوەی لە (ابن کثیر)دا هاتووە بەم جۆرەیە: "عن أنس بن مالك (رضی الله عنه) قال: ان هذه الایة (وتخفی في نفسك ما الله مبدیه) نزلت في شأن زینب بنت جحش و زید بن حارثه (رضي الله عنهما)"[٧٩].

٢–"لو کان.....". بەم جۆرە نییە، ئەوەی لە (ابن کثیر)دایە, بەم شێوەیەیە: "وقال ابن جریر: حدثنی اسحاق بن شاهین، حدثنی خالد عن داود عن عامر عن عائشة (رضي الله عنها) انها قالت: لو کتم محمد (صلی الله علیه وسلم) شیئاً مما أحي الیه من کتاب الله تعالی، لکتم وتخفی في نفسك ما الله مبدیه و تخشی الناس والله أحق أن تخشاه".[٨٠]

٧٢–وەرن بە چاوی خۆتان بوختانی تری مەریوان ببینن، مەریوان لە لاپەڕە (١٨٥ –١٨٦ )دا, لە باسی "خۆبەخشین"و لە باسی ژنێك بە ناوی (خولة بنت حکیم)دا, دەڵێ: "بوخاری دەڵێت: یەکێك لەو ژنانەی کە خۆیان پێشکەش بە پەیامبەر کردووە خەولەی کچی حکیم بووە لە دوای وەفاتی مێردەکەی (عثمان بن مظمون) دەچێتە لای پەیامبەرو خۆی پێشکەش (هبة) بە پەیامبەر دەکات, پەیامبەریش لەبەر جوانییەکەی لەلای خۆی هێشتویەتییەوە". پاشان مەریوان وەك سەرچاوەی ئەم قسانەی ئاماژەی بە صحیح البخاري: کتاب النکاح، باب (هل للمرأة تهب نفسها لاحد) دەکات .

---

[٧٧] بروانە: تفسیری (القرطبی) و (ابن کثیر) ئایەتی ٣٧ الاحزاب.

[٧٨] بروانە: ابن کثیر, تفسیر ایة ٣٧ الاحزاب.

[٧٩] ابن کثیر, تفسیر آیة (٣٧) الاحزاب.

[٨٠] ابن کثیر, تفسیر ئایەتی ٣٧ الاحزاب .

دەڵێین:

١-ئەوە قسەی (بوخاری) نییە، بەڵکو بوخاری بە رشتەکەی خۆی تا دەگاتەوە باوکی (هشام) دەیگێڕێتەوە، واتە: قسەکە, قسەی باوکی (هشام)ە, نەك بوخاری, (هشام )یش لە (عائشة)ی وەرگرتووە .

٢-ئەوەی لە (صحیح البخاري)دایە, بەم جۆرەیە "حدثنا محمد بن سلام حدثنا أبن فضیل حدثنا هشام عن أبیه قال: کانت خولة بنت حکیم من اللائي وهبن أنفسهن للنبي (صلی‌الله علیه وسلم) ....."[٨١].

واتە: لەوێوە کە دەڵێ: "لە دوای وەفاتی .....تاد". لە بوخاریدا بوونی نییە, بوختانی مەریوان خۆیەتی.

٣-مەریوان کە دەڵێ: "لە دوای وەفاتی مێردەکەی دەچێتە لای پەیامبەر و خۆی پێشکەش دەکات...". ئەمە وەها نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوەیە.

خەولەی کچی حەکیم, خۆی دەبەخشێتە پێغەمبەر (صلی‌الله علیه وسلم) بەلاّم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) رەتی دەکاتەوەو نایەوێ, پاشان (عثمان بن مظعون) مارەی دەکات. وەك (قورتوبی) ئاماژەی بۆ کردووە[٨٢].

ئەمە دەقە عەرەبییەکەیە کە (قرطبی) هێناویەتی: "خولة بنت حکیم بن أمیة، وهبت نفسها للنبي (صلی‌الله علیه وسلم) فأرجأها فتزوجها عثمان بن مظعون"[٨٣].

مەریوان نوسیویەتی: "لەبەر جوانییەکەی .....". ئەمەش چەند رەخنەیەك هەڵدەگرێ:

أ -ئەو قسەیە بێبنەمایە، چونکە لە (بوخاری)دا شتی وای تێدا نییە، تەنها خەیاڵی سێکسیی مەریوان خۆیەتی, کە ئەمەی بۆ دروست بووە، دەنا هیچ بنەمایەکی زانستی راست لە پشتییەوە نییە .

٢- پێغەمەر (صلی‌الله علیه وسلم) هیچ یەکێك لەو ئافرەتانەی خۆیان پێبەخشیوە قبوڵی نەکردون و نەچووەتە لایان.

(ابن عباس) دەڵێ: "لم یکن عند رسول الله امراة وهبت نفسها له"[٨٤]

هیچ یەکێك لەو ئافرەتانەی خۆیان بەخشیوە بە پێغەمبەر ﷺ لەلای پێغەمبەر ﷺ نەبووە, چونکە پێغەمبەر ﷺ سەر پشك کراوە لەوەی, کە دەتوانێ قبوڵیان بکات یان نا، بۆیە ئەویش کەس لەو جۆرە ئافرەتانەی قبوڵ نەکردووە.

ئایەتەکەش بە روونی ئەم سەرپشکییەی باس کردووە, کە دەفەرموێت (ان اراد النبي ان یستنکحها.......) الاحزاب/٥٠[٨٥].

جا ئایا مەریوان هەست بە عارەقی شەرمەزاری ناکات, کەوا بەم جۆرە شت دەنوسێ و بلاّوی دەکاتەوە؟!.

٧٣- لە لاپەڕە (١٨٦)دا, ئایەتی (٥٠)ی سورەتی (الاحزاب) دێنێ و راڤەی دەکات, باس لە مارەکردنی ئەو ژنانە دەکات, کە خۆیان بە پێغەمبەر ﷺ دەبەخشن, دەڵێت: "داهێنانێك کە لەلایەن پەیامبەرەوە داهێنرابێت, کەچی نەیهێشتوە ئیماندارەکانی تر سودی لێ ببینن".

دەڵێین:

---

[٨١] صحیح البخاري, رقم (٥١١٣) وە بروانە: فتح الباري, ج٩, ص ١٨٨ - ١٨٩, هەمان ژمارەی فەرموودەکە.

[٨٢] بروانە: تفسیر القرطبی, ج١٤, ص١٦٥ تفسیر أیة ٢٩ الاحزاب .

[٨٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[٨٤] رواه الطبراني واسناده حسن, فتح الباري, ج ٨, ص٦١٦, لە باسی فەرموودەی ژمارە (٤٧٨٨) .

[٨٥] بروانە: فتح الباري,ج ٨, کتاب التفسیر, ص٦١٦ لە سەر ژمارە فەرموودەی (٤٧٨٨) .

هەرچی لەبابەتی خۆبەخشین وتویانە بوختان و شێواندنە, چونکە وەك پێشتریش باسمان کرد, پێغەمبەر ﷺ گەرچی ئافرەت هەبووە خۆی پێشکەش بکات, بەڵام کەسیانی نەویستوە, لەگەڵ کەسیشیان جوت نەبووە, ئەوەی مەریوان دەیەوێ بیخاتە مێشکی خوێنەرەوە "تەنها ئاسنی سارد کوتینە!".

٧٤ – لە لاپەڕە (١٨٦)دا, لە ڕاڤەکردنی ئایەتی (٥٠)ی سورەتی (الاحزاب)دا, مەریوان وشەی "أجورهن" دێنێ و بە "کرێ" لێکی دەداتەوە, دەڵێ: "کە کرێکەت داونەتێ".

دەڵێین:

مەریوان, وا دەزانێ هەر "سەردەمی مەلیکە!" هەرچی عەقڵی ئەو بڕی کرد, هەر ئەوەیە, تا ئێستاش و لەمەودواشی لەگەڵ دابێ, مەریوان هەر بەو سەقەتییە شت مانا دەکات, جیاوازی "صریح" و"کنایە" نازانێ!.

(راغب اصفهانی) دەڵێ: کۆی الاجر (أجور)ە, لە بارەی وتەی خوای گورە کە دەفەرموێت "وأتوهن أجورهن" مەبەست کنایەیە, کە (مارەیی)ە[86].

کەواتە "أجورهن" مەبەست مارەییە, نەك کرێ.

٧٥ – لە لاپەڕە (١٨٨)دا, لە باسی ئەو ئافرەتەی, کە دێت خۆی پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺ بکات, دەنوسێت: "پەیامبەریش هەر لە نوکی پەنجەیەوە تا تەوقی سەری تەماشای دەکات. بۆی دەردەکەوێ بە دڵی نابێ, سەری رادەوەشێنێ بەشێوەیەك کە بڵێ نامەوێ". پاشان ئاماژە بە (صحیح البخاری و مسلم) دەکات وەك سەرچاوە.

دەڵێین:

باپێکەوە سەیری ئەو دەقە عەرەبییە بکەین و واتاشی بکەین بزانین وایە, وەك مەریوان واتای کردووە, ئەمە دەقە عەرەبییەکەیەتی: "...فنظر الیها رسول الله ﷺ فصعد النظر فیها و صوبه, ثم طأطأ رسول الله ﷺ رأسه..."[87].

واتە: پێغەمبەریش ﷺ سەیرێکی سەرەوە و خوارەوەی دەکات و پاشان سەر دادەنەوێنێ.

(ابن حجر), لە سەر ئەم فەرموودەیە, کە (بخاری) لە بابەتێکی تریشدا هێناویەتی بە ژمارە(٥١٤٩), لە وێدا (ابن حجر) بەم شێوەیە واتای ئەم ڕستەیە دەکات: "(فصعد النظر و صوبه) دەڵێ: "صعد" بە تشدیدی (عەینەکە) لەصعد– داو (واوەکە) لە وشەی (صوب)دا, مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا سەیری سەرو خوارەوەی ئافرەتەکەی کرد"[88].

جا بەڕێزان:

"بۆی دەردەکەوێ ..." و "سەری رادەوەشێنێ... ". لەکوێی گێڕانەوەکەدا هاتووە, انا لله وانا الیه راجعون.

٧٦ – لەمە سەیر تر ئەوەیە, شتێك لە کۆتایی فەرموودەکەی پێشوودا زیاد دەکات, تەنها وتەنها ئەم نەفامییە هەر لە نوسەری ئەم بابەتە دەوەشێتەوە, کە لە هەمان لاپەڕەدا دەنوسێت:

"ژنەکەش لە شوێنی خۆی نە جولاَبوو تا پیاوەکە دەستی گرت و لەگەڵ خۆی بردی".

دەڵێین:

١ – "ژنەکەش ...دەستی گرت ...". ئەمە تێچەنی مەریوان خۆیەتی, گەر نا لە هیچ گێڕانەوەیەکی ئەم بەسەرهاتەدا شتی وای تێدا نییە.

٢ – لە گێڕانەوەیەکی پێشەوا (أحمد)دا هاتووە, کە ڕاویەکە دەڵێ: "(من کابراکەم بینی ڕۆیی و ژنەکەش شوێنی کەوت) (فرأیته یمضي و هي تتبعه)"[89].

---

[86] مفردات ألفاظ القرآن, ص٦٤ مادة أجر.

[87] صحیح البخاری, رقم (٥٠٨٧).

[88] فتح الباری, ج ٩, ص٢٣٧, ژمارەی فەرمووده (٥٤١٩).

[89] بروانە: فتح الباری, ج ٩, ص٢٤١, ژمارەی فەرموده (٥٤١٩).

٧٧ –لە لاپەڕە (١٨٩)دا, دەڵێ: "هەروەها لە کاتی مانگانەیشدا لەگەڵی جوت بووە، پاشان ئاماژە بە فەرموودەکەی عائیشە دەکات کە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ بەڕۆژوو بووە ماچی دەکردم ولە گەڵیشمدا ڕایدەبوارد".

دەڵێین:

مەریوان کە باسی "جووتبوون" دەکات لەو دەقەی (عائشە)وە وەریگرتوە کە دەڵێت: "ویباشر وهو صائم".

بەڵام مەریوان, نازانێت "مباشرة" واتای جووتبوون ناگەیەنێت، چونکە مەبەستی مەریوان ئەوەیە کە بڵێت: "هینەکەی خستۆتە ناو هینەکەیەوە!" کە ئەمەش وانییە.

بوخاری, لە صەحیحەکەیدا, سەر باسێك دەنوسێ بەناونیشانی: "مباشرة الحائض"، پاشان (إبن حجر) دەڵێت: "والمراد بالمباشرة هنا إلتقاء البشرتين لا الجماع"[٩٠].

مەبەست لە (مباشرة) لێرەدا بەرکەوتنی پێست و جەستەیە, نەك جووتبوون.

وە (سیوطي) لە باسی "مباشرة الحائض"دا, "مباشرة" بە لەزەت وەرگرتن, جگە لە هینی ئافرەتەکە لێکدەداتەوە[٩١].

(إبن حجر) لە جێگەیەکی تر لە باسی "مباشرة الصائم"دا, دەڵێ: "لە بنەڕەتدا "مباشرة" بریتییە لە بەرکەوتنی هەردوو پێست و جەستە، وە بۆ جووتبوونیش بەکاردێت, جا بیکاتە ناو هینەکەی یان نا، بەڵام لێرەدا جووتبون مەبەست نییە، پاشان فەرموودەکەی (عائشە) باس دەکات"[٩٢].

٧٨ – مەریوان, لە لاپەڕە (١٨٩–١٩٠)دا, دەڵێ: "بەڵام ئەوەندەی لە ڕیوایەتەکەدا دەرکەوتووە پەیامبەر شەهوەتەکەی نەڕژاندۆتە ناو هینەکەی عائشە". پاشان دەقە عەرەبییەکە دێنێ, کە پێغەمبەر: "يأمرني فأتزر فيباشرني وأنا حائض".

دەڵێین:

١ – لەبارەی (مباشرة) لە پێشەوە قسەمان لەسەر کرد.

٢ – لە ڕیوایەتەکەدا نەهاتووە کە "شەهوەتەکە .....". ئەمە تەنها قسەو بۆچوونی سەقەتی مەریوانە، چونکە ئاشکرایە دەکرێ پیاو لەگەڵ ئافرەتدا ڕابوێرێ وماچی بکات و لەزەتی لێوەربگرێ لە هەمان کاتیشدا شەهوەتی نەیەتە خوارەوە .

٧٩ – لە لاپەڕە (١٩٠)دا, بەسەرهاتی ئەو کابرایە باس دەکات, کە لە کاتی بەڕۆژوو بووندا, لەگەڵ خێزانەکەیدا جوتبوونی کردووە، دەڵێ: "ڕەنگە بۆ خۆی بە ڕەوای ببینێت کە لەگەڵ ژنەکەیداولە کاتی دەستنوێژ, یان بەڕۆژوو بوونی, یان لە کاتی مانگانەیاندا جووت بوویێت, بەڵام بۆ کەسی دیکەی بەڕەوا نەبینیوە". لە دوایدا بەسەرهاتی پیاوەکە باس دەکات, کە پێغەمبەر فەرمانی پێدەکات, یان کۆیلەیەك ئازاد بکات, یان دوو مانگ بە ڕۆژوو بێت, یان خواردنی (٦٠) هەژار بدات, چونکە جووتبوونی کردووە لە کاتی بەڕۆژوو بووندا.

دەڵێین:

ئەوەی لە گێڕانەوەکەدا هاتووە باس لەوە دەکات, کە پیاوەکە جووتبوونی کردووە, واتە بە زمانی مەریوان "هینەکەی خستۆتە ناو هینەکەیەوە", بۆیە ئەم جۆرە تۆڵەیەی بۆ دانراوە, ئەوەتا (بخاري و مسلم), کاتێ سەر باسەکە دەنوسن بە جووتبوون (جماع) باسی دەکەن:

(بخاری) دەنوسێ: "باب: أذا جامع في رمضان".

(مسلم) دەنوسێ: "باب: تغليظ تحريم الجماع".

---

[٩٠] فتح الباري, ج١ باب/مباشرة الحائض.

[٩١] بڕوانە: سنن النسائی, بشرح السيوطي وحاشية السندی, م١, ج١, ص١٨١ .

[٩٢] فتح الباري, ج٤, ص١٧٥ باب/ المباشرة للصائم .

کەواتە, جیاوازییان هەیە, ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانی خۆیدا کردوویەتی بریتی بووە لە چێژ وەرگرتن بەبێ جووتبوون و هاتنە خوارەوەی "شەهوەت", بەڵام ئەوەی ئەو کابرایە کردوویەتی جووتبوون بووە.

زیادە روونکردنەوەیەك: لە یەکێك لە گێڕانەوەکانی بە سەرهاتی ئەو پیاوەدا, هاتووە کە بە ڕاشکاویی باس لە جووتبوونی تەواوی دەکات و دەڵێ: "وطئت أمرأتي" [٩٣].

هەروەها زانایان یەکدەنگن لە سەر ئەوەی, گەر کەسێك بە ئەنقەست جووتبوونی ڕاستەقینەی کرد, ڕۆژووەکەی بەتاڵەو کەفارەتی گەورەی دەکەوێتە سەر کە بریتییە لە: ئازادکردنی کۆیلەیەك, یان دوو مانگ بە ڕۆژوو بێت, یان خواردنی (٦٠) هەژار بدات[٩٤].

٨٠ – مەریوان, لە لاپەڕە (١٩٠)دا, بە جاریێ نەزانێتی و بوختانچێتیی خۆی دەردەخات, دەنوسیێ و دەڵێ: "ڕۆژێك ژنی صەحابیەك بەناوی (صفية) کە هێشتا نەبووبوو بە ژنی, زیارەتی دەکاو لە گەڕانەوەی دا بۆ ماڵەوە پەیامبەر بە تەنها لەگەڵی دەچێت, گوایە تەنیایەو دەیگەیێنێتە ماڵەوە ...". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (صحيح البخاري) دەکات.

دەڵێین:

سەراپای ئەم بابەتە پڕە لە درۆو بوختان و چەواشەکاریی لە خوێنەر, چونکە:

١ـ زۆر روون و ئاشکرایە کە (صفية) لە جەنگی (خيبر)دا دەگیرێ و دوا بە دوای ئەو جەنگەش, پێغەمبەر دەیکاتە هاوسەری خۆی.

(أنس) دەڵێ: "پێغەمبەر سێ ڕۆژ لە نێوان (خیبر)و (مەدینە)دا مایەوە, چووە لای (صفية بنت حيي), منیش چووم بانگی موسوڵمانانم کرد بۆ خواردنی گواستنەوەکەی, خواردنی گواستنەوەکە نان و گۆشت نەبوو, بەڵکو فەرمانی کرد پێستەیەکیان ڕاخست و ئیتر خورماو کەشك و ڕۆن دانرا, ئەمە خواردنی گواستنەوەکەی (صفية) بوو, جا موسوڵمانان وتیان: دەبێ (صفية) یەکێك بێت لە دایکانی باوەڕداران, یان وەك کەنیزەکێك لای خۆی دەیهێڵتەوە؟ وتیان ئەگەر پێغەمبەر پەردەی بۆ گێڕا, ئەوە مانای وایە یەکێکە لە دایکانی باوەڕداران، ئەگەر پەردەشی بۆ نەگێڕا ئەوە کەنیزەکییەتی، کاتێك پێغەمبەر بە ڕێکەوت (صفية)ی لە پاش خۆیەوە سوار کردو پەردەی بۆ گێڕا لە نێوان (صفية)و خەڵکەکەدا" [٩٥].

هەموو ریوایەتەکان ئەوە بە روونی دەردەخەن, کە (صفية) دوا بەدوای غەزای خەیبەر, پێغەمبەر دەیکاتە هاوسەری خۆی و پاشان بەرەو مەدینە دەگەڕێنەوە[٩٦].

هەتا مارەییەکەی (صفية) ئەو ڕۆژە بریتی بوو لە ئازاد کردنی[٩٧].

ئەگەر ئەمە زانرا کە (صفية) هەموو ژیانی لە خەیبەر بردۆتە سەرو تا ساڵی حەوتەمی کۆچی, کە جەنگی خەیبەر ڕوودەدات و دەستگیر دەکرێت, لە دوا جەنگەکە مسوڵمانێتیی خۆی ڕادەگەیەنێت و پێغەمبەریش ﷺ پێش چوونەوەیان بۆ مەدینە دەیکاتە هاوسەری، کەواتە:

أ – (صفية) ڕۆژێك لە ڕۆژانی پێش جەنگی خەیبەر مەدینەی نەبینیوە.

ب – ئەو ساتەی مسوڵمان دەبێ پێغەمبەر (ﷺ) دەیخوازێ.

---

[٩٣] بۆ زیاتر ئاشنابوون لەم بابەتە بڕوانە: فتح الباري, ج٤, ص(١٩١-٢٠٢) باب: أذا جامع في رمضان ولم يكن له شيء .....

[٩٤] رحمة الامة, ص ١٩٦.

[٩٥] رواه البخاري, كتاب النكاح, باب/ البناء في السفر رقم(٥١٥٩).

[٩٦] بڕوانە: صحيح البخاري, الكتاب المغازي, رقم (٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٣١٣) .

[٩٧] صحيح البخاري, كتاب النكاح, باب/ من جعل عتق الأمة صداقها, رقم (٥٠٨٦)، هەروەها بڕوانە: زاد المعاد, ج٣, ص٣٢٧-٣٢٨، رفع الخفا شرح ذات الشفا, ج١, ص٢٦٥، و ج٢, ص١٢، وصفة الصفوة, م١ ج٢, ص٢٤-٢٥ .

ج – بە هاوسەریی پێغەمبەر ﷺ دەچێتە نێو شاری مەدینە.

جا بەڕێزان:

بەمەی باسمان کرد هەموو تارماییەکانی گێرفانی مەریوان ڕەوینەوەو زانرا, کە ئەوە تەنها هەوڵێکی نەفامانەی دیکەی مەریوانە!.

٢ – مەریوان, وا دەزانێ خەڵکیش وەك خۆی گێلن!, هاتووە یەکێك لە گێڕانەوەکانی (بوخاری) هێناوەو بینای بوختانەکەی خۆی لەسەر کردووە، هەر لە (عەلیی کوڕی حوسەین)ەوە, دوو فەرموودە, پاش ئەو فەرموودەیەی کە مەریوان هێناویەتی لە (صحیحی بوخاری)دا, بە ڕوونتر باسی ئەو بەسەرهاتە دەکات بەم جۆرە:

"پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دەبێ و هاوسەرەکانیشی لەگەڵدا دەبن، پاشان هاوسەرەکانی دەڕۆن، پێغەمبەر ﷺ بە (صفیة بنت حي) دەڵێت تۆ پەلە مەکە تا خۆم لە گەڵتا دێم، ماڵی (صفیة) لە ماڵی (أسامة)دا دەبێت، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا دەچێتە دەرەوە, دوو پیاوی (أنصاری) پێدەگات، سەیری پێغەمبەر ﷺ دەکەن و تێدەپەڕن، پێغەمبەر ﷺ پێیان دەفەرموێ: وەرن ئەوە (صفیة) یە ....."[98]

ئەمەش قسەکەی مەریوان پووچ دەکاتەوە بە:

أ – بە ئاشکرا لە ڕیوایەتەکەدا هاتووە: "هاوسەرەکانیشی لەلا بوون ...". باس لەوەیە (صفیة) ئەوکات خێزانی بووە.

ب – هەتا پێشەوا (بوخاری) ئەم فەرموودەیە دەهێنێت و سەرباسێکی بۆ دادەنێت بە ناونیشانی "زيارة المرأة زوجها في إعتكافه"، سەردانی ئافرەت بۆ لای هاوسەری خۆی کاتێ هاوسەرەکەی لە خەڵوەدا بێت[99].

ئێستاش با بێینەوە سەر ئەو دەقەی مەریوان نوسیویەتی:

١ – مەریوان دەڵێت: "دوو صەحابە بەناوی .....".

منیش دەڵێم: ناوی ئەو دوو صەحابەیە لە هیچ یەکێ لە گێڕانەوەکانی (بوخاری)دا نەهاتووە، بەڵکو تەنها ئەوەندە هاتووە کە ئەنصاریی بوون.

هەروەها (إبن حجر) دەڵێت: "ناوی ئەو دوو هاوەڵەم لە هیچ کتێبێکدا نەبینیوە، تەنها ئەوە نەبێ کە (إبن العطار) لە (شرح العمدة)دا, گومان دەبات کە (أسید بن حضیر) و (عباد بن بشیر) بن، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی بۆ ئەو گومانەی باس نەکردووە"[100].

٢ – مەریوان, لە لاپەڕە(١٩١)دا, لە سەر ڕاڤەی "ئەوە فلانی کچی فلانە" دەڵێت واتە: "لە بنەماڵەیەك نییە ئێوە گومانی لێ بکەن".

دەڵێین:

ئەمە وتەیەکی سەقەتە، پێغەمبەر ﷺ ناوی خێزانەکەی دەبات و دەفەرموێت: ئەوە (صفیة)یە، بۆیە ناوەکەشی وتووە, چونکە ئەوان دەزانن کە (صفیة) هاوسەریەتی، هەروەها لە ڕیوایەتەکەدا ناوی (صفیة بنت حي) هاتووە, کەچی مەریوان کردوویەتی بە ئەوە "فلانة بنت فلان".

نازانم مەریوان, چۆن شەرم تەنگی پێ هاڵناچنێ, کە ئەوەندە لاسارەو بەدەستی ئەنقەست خۆی گێل دەکات وچاو لە ڕاستییەکان دەنوقێنێت!.

٨١ – یەکێکی تر لە سەقەتییەکانی مەریوان هەر لە لاپەڕە (١٩١)دا, هاتووە ئەم دەقە عەرەبییەی "إن الشيطان يبلغ من ابن آدم مبلغ الدم ...". ئاوەها ڕاڤەی کردووە: "شەیتان شتی وا دەخاتە دڵی ئینسانەوە کە بگاتە خوێن ڕژان".

---

[98] رواه البخاري, رقم٢٠٣٨.

[99] صحيح البخاري, كتاب الإعتكاف.

[100] فتح الباري, ج٤, ص٣٢٤, لە سەر فەرموودەی ژمارە (٢٠٣٥).

دەڵێین:

ڕاڤەی تەواوو دروست بەم جۆرەیە: "بە ڕاستی شەیتان لە ناو جەستەی مرۆڤدا وەکو خوێن هاتوچۆ دەکات"[١٠١].

٨٢- لە لاپەڕە (١٩١)دا, دەقێکی تر دەهێنێت, دەیکات بە کوردیو ئەوەی خۆی مەبەستی بێت دەینوسێت, ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەوەیە, کە لە بارەی (أسماء)ی خوشکی (عائشة)ەوە نوسیویەتی, دەڵێت: "ڕۆژێك بەرچنێك خورمای بەسەرەوە بووەو بە هیلاکی دەڕۆی بەڕێوە. پەیامبەر دەیبینێ و بانگی دەکات کە لە گەڵیدا سواری وشترەکەی بێت، (أسماء)یش ژنێکی مێرداری دنیادیدە دەبێ و دیارە, پەیامبەریش باش دەناسێت، بۆیە (أسماء) لە ترسی قسەی خەڵك گوایە دوایی (زوبەیر)ی مێردی دەیبیستێتەوە لە گەڵی سوار نابێ". پاشان (صحيح البخاري) وەك سەرچاوە دەهێنێ و لەخوارەوەش دەقە عەرەبییەکە دەنوسێت، ئەوەندەی خۆی بیەوێ و تەواوی ناکات!.

دەڵێین:

ئەمەش زیاتر نەفامیی مەریوان دەردەخات، چونکە:

١- "بەرچنێ خورما". ئەمە هەر زۆر سەقەتە، بەڵکو ناوکی خورمای دەگواستەوە، وەك کەمێکی تر باسی دەکەین.

٢- "بۆیە أسماء لە ترسی...". ئەمە قسەی مەریوان خۆیەتی، چونکە هەر (أسماء) خۆی باسەکە بۆ مێردەکەی دەگێڕێتەوە، وەك چۆن پاشتر لە سەری دەدوێین.

٣- مەریوان, لە کۆتاییەکەدا باسی ئەوەی نەکردووە, کە دوایی (أسماء) خۆی باسەکە بۆ مێردەکەی دەگێڕێتەوە, مێردەکەشی چی بە (أسماء) دەڵێت، چونکە ڕیسەکەی مەریوان دەبووەوە بە خوری.

بەڕێزان فەرموون لەگەڵ بەسەرهاتەکەو دەقە عەرەبییەکەی:

(أسماء), دەڵێت کە (زبیر) منی هێنا, هیچ شتێکی نەبوو, نە زەوی نەماڵ نە خزمەتکار، جگە لە وشترو ئەسپێك, من ئالفم دەدا بە ئەسپەکەو ئاویشم دەدا، کوندە وجەوەندەکەیشیم بۆ دەدوریو هەویریشم بۆ دەشێلا، گەرچی من باش نەمدەزانی نان بکەم، چەند ئافرەتێکی ئەنصاریی دراوسێمان بوون, کە بەڕاستی ئافرەتی چاكو ڕاستگۆ بوون, ئەوان نانیان بۆ دەکردم، وەمن لەو پارچە زەوییەی[١٠٢] , کە پێغەمبەر دابوی بە (زوبەیر) ناوکی خورمام بەسەر سەرم دەگواستەوە، ئەو زەوییە لە ماڵەکەوە دوو لە سێی فرسەخێك دووربوو، ئەوەبوو تا ڕۆژێکیان بەم جۆرە ناوکە خورماکان لەسەر سەرم بوون، گەیشتم بە پێغەمبەر ﷺ کە چەند کەسێکی ئەنصاریی لەگەڵدا بوو, ئەویش بانگی کردم و وشترەکەی بۆم (یخ)دا, تا لە دوای خۆیەوە هەڵم گرێت، منیش شەرمم کرد لەگەڵ پیاواندا بڕۆم بە ڕێگەداو بیری زوبەیر وغیرەکەیم کەوتەوە، بەڕاستی زوبەیر لە خەڵکی زیاتر غیرەی هەبوو، جا کە پێغەمبەر زانیی من شەرم دەکەم ڕۆیی، منیش چوم بۆ لای زوبەیرو پێم وت: کاتێ ناوکە خورماکانم لەسەر سەر بوو, پێغەمبەرم پێگەیشت, کە چەند هاوەڵێکی لەگەڵدا بوون، وشترەکەی بۆ (یخ) دام تا سەرکەوم، بەڵام شەرمم لە پێغەمبەر کرد و(غیرة)کەی تۆشم دەزانی، (زوبەیر) یش وتی: سوێند بەخوا هەڵگرتنی ناوکی خورماکانم لەلا ناخۆشترە وەك لە سواربوونت لە گەڵ ئەودا، " تزوجني الزبير وماله في الأرض من مال ولا مملوك ولا شيئ غير ناضح، وغير فرسه فكنت أعلف فرسه و أستقى الماء وأخرز غربه وأعجن، ولم أكن أحسن أخبز وكان يخبز جارات لي من الأنصار، وكن نسوة صدق، وكنت أنقل النوى من أرض الزبير التي أقطعه رسول الله على رأسي, هي مني على ثلثي فرسخ، فجئت يوما والنوى على رأسي فلقيت رسول الله ومعه نفر من الأنصار، فدعاني، ثم قال: إخ إخ، ليحملني خلفه، فاستحييت أن أسير مع الرجال وذكرت الزبير وغيرته، وكان أغير الناس، فعرف رسول الله أني قد إستحييت فمضى، فجئت الزبير فقلت: لقيني رسول الله ﷺ وعلى

---

[١٠١] بڕوانە: التجريد الصريح, وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان, بەرگی دووەم, لا٣٠٩ .

[١٠٢] ئەم پارچە زەوییە ئەو دەسکەوتە بوو, کە لە ماڵی (بنى النظير) دەست مسوڵمانان کەوتو پێغەمبەریش ﷺ پارچەیەکی لێدا بە زوبەیر. فتح الباري, ج٩, ص٣٦٩.

رأسي النوى ومعه نفر من أصحابه, فأناخ لأركب فاستحييت منه وعرفت غيرتك، فقال: والله لحملك النوى كان أشد علي من ركوبك معه" [١٠٣].

وشەی "النوى" كۆی "نواة" ناوكی خورمایە [١٠٤].

ئێوە خۆتان بڕیار بدەن (مەریوان) شیاوی چ شتێكە پێی بوترێ لە بەرامبەر ئەم هەموو چەواشەكارییانەدا؟!.

٨٣- بەسەر هاتێك دێنێ, كە لە نێوان پێغەمبەر ﷺو (عائیشە)دا ڕوویداوە, لە لاپەڕە (١٩٢)دا, هەندێكی بە سەقەتی واتا كردووەو هەندێكیشی بەئەنقەست لێ قرتاندووە, نووسیویەتی: "منیش (واتا عائیشە) كراسەكەمدا بەسەر شانمداو پارچەی عەباكەمدا بە سەر شانمداو دوای كەوتم ....". پاشان "صحيح مسلم" وەك سەرچاوە دێنێ و كەمێكیش لەدەقە عەرەبییەكە لە خوارەوە دەنوسێت.

دەڵێین:

ئەو واتا كردنەی مەریوان بۆ ئەو دەقەی كردووە, زۆر زۆر سەقەتە, دەقە عەرەبییەكە ئاوهایە: "... فجعلت درعي في رأسي و اختمرت وتقنعت أزاري...".

واتە: " كراسەكەم لەبەر كرد, وە سەرم داپۆشی, وە ئیزارەكەم پۆشی".

"درع " بۆ ئافرەت, كراسە [١٠٥].

"أختمرت" واتا سەرم داپۆشی, "ئیزار" ئەو پۆشاكەیە, كە لە ناوەڕاستی جەستەوە بەر دەدرێتەوە بۆ خوارەوە, وەك پەشتەماڵ, "تقنعت" بە واتای پۆشین دێت, وەك (نەوەوی) دەڵێت [١٠٦].

٨٤- لە هەمان لاپەڕەو هەمان باسدا دەنوسێت: "... تاهێزی تیا بوو مستە كوڵەیەكی كێشا بە سنگم دا..".

دەڵێین:

"تاهێزی تیا بوو". قسەی مەریوان خۆیەتی, چونكە دەقە عەرەبییەكە وەهایە: "فلهدني في صدري لهدة" .

واتە: مشتە كوڵەیەكی لێدام .

٨٥- لە لاپەڕە (١٩٣)دا, دەنوسێ: "خودی خۆشی دڵی لە ژنەكانی پیس بووە". پاشان فەرموودەیەك دێنێ كە باس لە چۆنێتی بوون بە برا دەكات بە هۆی شیر خواردنەوە.

دەڵێین:

"خودی خۆشی...". مەریوان, بەمە دەیەوێ بڵێ, كە گومانی لە خێزانەكانی هەبووە, ئەمە چەواشەكارییە, چونكە گەر گومانی لە خێزانەكانی هەبوایە, زۆر ڕێگە هەبوو بیگرێتە بەر, پاشان (غیرة) سروشتی هەموو كەسێكی خاوەن ڕەوشتە, چ لە مێدا, چ لە نێردا, بەڵام هەریەكە و بەئەندازەیەك, من دەپرسم گەر هەر پیاوێك بێتەوە بۆ ماڵ, ببینێت پیاوێك لەگەڵ خێزانەكەی دانیشتووە, لە هەمان كاتیشدا نەی ناسێت, شت لە دڵی دروست نابێ؟. مەگەر مەریوان تۆ (غیرە)ت نییە ؟!!

٨٦- لە لاپەڕە (١٩٤)دا, دەنوسێت: "گەر جوانێكیشی دیبێت خۆی پێ نەگیراوە داوای لێ كردووە بە حەڵاڵی لەگەڵی جووت بێت, لە باخێكدا بەژنێك (ئومەیمەی كچی نوعمان ... )دەڵێ: خۆتم پێشكەش بكە... پەیامبەریش دەستی بۆ دەبات, بەڵام ئومەیمە دەچێتە دواوە...". پاشان وەك پیشەی هەمیشەیی بەشێكی كەم لە دەقەكە لە (صحيح البخاري)دا دەهێنێ.

دەڵێین:

---

[١٠٣] رواه البخاري, كتاب النكاح, باب: الغيرة رقم الحديث (٥٢٢٤).

[١٠٤] مختار الصحاح, ص٦٨٧ مادة ن. و. ي.

[١٠٥] مختار الصحاح, مادة (درع).

[١٠٦] بڕوانە: شرح مسلم (كتاب الجنائز), رقم الحديث ٢٢٥٣, مختصر صحيح مسلم للمنذري تحقيق: د. مصطفى الديب البغا, رقم ٤٩٧.

مەریوان, هەموو شتەكان لە هەمبانە سێكسییەكانی خۆیەوە دەژمێرێ, چونكە دەستەواژەی "گەر جوانێكی..." واتە ئەمە سروشتی بووە, ئەوەش بوختانێكی قێزەونی ترە, پاشان بۆ هەموو گێڕانەوەكەی باس نەكردووە, تا دەركەوێت دەست بۆ بردنەكە بۆ كوێ بووە و چۆن بووە؟.

لە ژمارە (٤٤)دا, لە باسی (اسماء)دا, باسێكمان لەبارەیەوە نووسیوە, دەتوانرێ سەرنجێك لەو جێگەیە بدرێ .

دەست بۆ بردنەكە:

دەست بۆ بردنەكەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوە بووە كە:

أ–هێوری دڵنیای بكاتەوە .

ب– بۆ سەری بووە, نەك جێگەیەكی تر.

دەقە عەرەبییەكە ئاوهایە: "فأهوى بيده يضع عليها لتسكن" [107].

جا بەڕێزان:

كام دەستدرێژی خراپەیە, كە مەریوان بانگەشەی بۆ دەكات, پەنا گرتنەكەشی فێڵی لێكرا, چونكە وەك گێڕانەوەكان باسی دەكەن هەندێ لە ئافرەتان ئێرەییان پێدەبرد, كە ببێتە خێزانی پێغەمبەر (ﷺ), بۆیە پێش چوونە ژوورەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ لای, چەند ئافرەتێك دەچنە لای و پێی دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) زۆر حەزی لە وتنی وشەی ئەوەیە پێی بڵێی: "أعوذ بالله منك", جا گەر دەتەوێ ببیتە خێزانی, ئەگەر هات ئەو وشەیەی پێ بڵێ, ئەویش وای كرد [108].

٨٧– لە لاپەڕە (٢٠١–٢٠٢)دا, فەرموودەیەك دەهێنێت, كە سەرەتاكەی ئەمەیە: " لە ئەبو هورێرەوە دەگێڕنەوە: ڕۆژێك ژنێك .....تاد". پاشان لە خوارەوە بە ژمارە ١٢و١٣ دەنوسێت, كە گوایە لە (تفسير إبن كثير)دا هەیە، پێشتریش لە لاپەڕە (٧٥)دا, هەمان فەرموودە دەهێنێ و ئاماژە بۆ (إبن كثير) دەكات.

دەڵێین:

ئەو فەرموودەیە, جگە لەوەی فەرموودەیەكی لاوازە, كە دواتر لە بەشێكی سەربەخۆدا قسەی لە سەردەكەین، لە هەمانكاتدا ئەو فەرموودەیە لە تەفسیری (إبن كثير)دا نییە، من بەش بە حاڵی خۆم زۆری بۆ گەڕام, بەرچاوم نەكەوت، ئەوەیش كە (إبن كثير)ی هەیە با چاو بگێڕێ, بزانێ ئاخۆ مەریوان ئەم جارە ڕاست دەكات !!!.

٨٨– لە لاپەڕە (٢٠٣)دا, فەرموودەیەك دەهێنێ, كە لە (صحيح البخاري)دا ئەمە دەقەكەیەتی: "ليكونن من امتي أقوام يستحلون الحر, والحرير, والخمر, والمعازف ...". مەریوان بەم جۆرە ڕاڤەی كردووە:

"بەشێك لە نەتەوەكەم عەورەتی ژنە ئازادەكان و قوماشی ...". پاشان دەڵێ: "كە دەڵێت: (يستحلون الحر) واتە ژنانی ئازاد بۆ خۆیان حەڵاڵ دەكەن, بەڵام نەك هەموو ژنێك...".

دەڵێین:

ئەوەی مەبەستمان بێت لێرەدا, وشەی "الحر" كە زۆر بەسەقەتی واتای كردووە, واتا ڕاستەقینەكەی ئاوەهایە:

"الحر" بە كەسرەی (حاء)ەكە, بە واتای "هێنی" ئافرەت دێ, واتە: زینا حەڵاڵ دەكەن, ئەوەی زیاتر ئەم بۆ چوونەش بە هێز دەكات, ئەو گێڕانەوەیە, كە بە لەفزێكی تر هاتووە بەم جۆرە: "يوشك أن تستحل أمتي فروج النساء..." نزیكە ئوممەتەكەم "هێنی" ئافرەتان بەرەواو حەڵاڵ بگێڕن [109].

بەڕێزان:

ئەوەی ئێمە هێنامان قسەی كەسێكی زۆر ناودارو پایەبەرزی ئیسلامە, كە (أبن حجر)ە, وا ڕاڤەو قسەی لەسەر ئەو وشەیە كردووە, ئەی (مەریوان) ئەو ڕاڤەیەی لە كوێ هێناوە؟!.

---

[107] صحيح البخاري, رقم ٥٢٥٥.

[108] بڕوانە: فتح الباري, ج٩, ص٤١١, لە سەر ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥٢٥٥).

[109] بڕوانە: فتح الباري, ج١٠, ص ٦٤, لە سەر ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥٥٩٠).

کەواتە فەرموودەکە باس لەوە دەکات، کە بەگشتی داوێن پیسیی حەڵاڵ دەکرێ، بەبێ جیاوازیی لە ئافرەتێکەوە بۆ ئافرەتێکی تر.

٨٩ – لە لاپەڕە (٢٠٣)دا، ئەم فەرموودەیە دێنێت، کە پێغەمبەر فەرموویەتی: "لن يفلح قوم ولوا أمرهم أمرأة" واتە: هیچ نەتەوەیەك سەرکەوتوو نابێت، ئەگەر کارو بارەکانییان بدەنە دەست ئافرەتێك، پاشان دەڵێ: "ئەمە لە کاتێکدایە کە قورئان باسی دانایی ژنێك دەکات، کە ناوی (بەڵقیس) بووەو شاژنیش بووە، بەمەش دژایەتی لەنێوان دەق و سوننەت دا دەبینین".

دەڵێین:

" بەمەش دژایەتی...". تەنها بۆ چوونی مەریوانە، هیچ دژایەتییەك لە نێوانیاندا نییە، چونکە:

١ – فەرموودەکە دەفەرموێ: "أمرأة" یەك ئافرەت، واتە: تەنها ئافرەتێك، بە تەنها کارەکانییان بەڕێوە ببات، وەك لە بەسەرهاتی ئەو ڕووداوەشدا هاتووە: "کاتێ کە (فارسەکان)ەکان ئەو ئافرەتەیان کردە پادشا لە ترسی ئەوە بوو، کە دەسەلات لە نێو ئەو بنەماڵەیەدا بمێنێتەوە"[١١٠].

٢ – ئەو ئافرەتەش کە لە سورەتی (النمل)دا، باسی هاتووە، وەك زانایان دەڵێن (٣١٢) پیاو دەستەی ڕاوێژکاریی بوون و هەر پیاوێکیش لەوان (١٠) هەزار پیاوی لە ژێر دەست دا بووە[١١١].

٣ –هەتا قورئان باس لەوە دەکات، کە ڕاوێژیی کردووە: ﴿ قالت يا أيها الملأ أفتوني في امري ماكنت قاطعة أمرا حتى تشهدون ﴾النمل/٣٢.

٤ – پاشان ئافرەتەکە ملکەچ دەبێت بۆ خوا و دەچێتە ژێر فەرمانداریی (سليمان) سەلامی خوای لە سەر بێت. بڕوانە سورەتی النمل (٣٢–٤٤).

٥ – مەرج نییە هەر کات باسی دانایی کەسێك کرا، هەموو شتەکانی تری هەروا بن، مەگەر نابینی پێغەمبەر ﷺ لە بارەی "شيطان " ەوە بە (أبو هريرە)ی فەرموو "ڕاستی لەگەڵ وتیی، بەلاّم خۆی درۆزنە". ﴿صدقك وهو كذوب﴾، چونکە "أية الكرسي"ی فێری (أبو هريرة) کرد[١١٢].

٩٠ – لەلاپەڕە (٢٠٤)دا، ئەم فەرمودەیە دەهێنێ: "تنكح المرأه لاربع: لمالها ولحسبها وجمالهاو لدينها". مەریوان دەڵێ: "پەیامبەر ئەو چوار بنەمایەی بۆ دیاری کردووین نێری مسوڵمان لەسەر چ بنەمایەك ژن بهێنێت، پاش مانا کردنی دەڵێ: "لەم ڕیوایەتەشدا مافی ژن دیار نییە لەوەی، کە شووی کرد بە پیاوێك مەرجی ئەوەی هەبێت، کە دەبێ پیاویش سامانی هەبێ و کەس و کاری زۆریشی هەبێت وجوانیش بێتو ئیمانداریش بێت".

دەڵێین:

ئەمەش دەم کوتینە لە باس و خواستێك، پێموایە مەریوان ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك پەی بە فەرموودەکە نەبردووە، چونکە:

١ – پێغەمبەر ﷺ ئەو چوار بنەمایەی دیاری نەکردوە، بەڵکو باسی لە واقعی ژن هێنانی خەڵکی کردووە، مەگەر نازانرێ شێوەی داڕشتنی دەقەکە بە (مبنى للمجهول) هاتووە "تنكح" واتە: ئافرەت دەهێنرێت لە بەر چوار هۆ، واتە: خەڵکی وا سەیری ژن هێنان دەکەن، وەك لە "لاربع"دا دیارە، کە ئەو لامە لامی سەبەبیەتە، وەك (ابن حجر) ڕاڤەی کردووە[١١٣].

---

[١١٠] بڕوانە: فتح الباري, ج٨, ص ١٤٩, لە سەر ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٤٤٢٥).

[١١١] بڕوانە: ابن كثير, تفسير ئايەتی (١٢٣)ی سورەتی النمل.

[١١٢] بڕوانە: صحيح البخاري, فەرموودەی ژمارە (٢٣١١) و (٣٢٧٥) و(٥٠١٠).

[١١٣] بڕوانە: فتح الباري, ج٩, ص ١٥٥, لە سەر ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥٠٩٠).

٢ – تەنها بنەمایەك, كە پێغەمبەر ﷺ دیاری كردبێت و خەڵكی لە سەر هاندابێت, دینداربییە, وەك لە كۆتایی فەرموودەكەدا هاتووەو مەریوان بە ئەنقەست نەی هێناوە, ئەمەش دەقی فەرمودەكەیە "تنكح المرأة لاربع: لمالها ولحسبها وجمالها و لدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك"[١١٤].

واتە: ژن لەبەر چوار شت خەڵكی مارەی دەكات: لە بەر ماڵ ودارایییەكەی، یان لەبەر خانەدانیی و بنەماڵەكەی، یان لەبەر جوانییەكەی، یان لەبەر دینەكەی، جا تۆ فرسەت بهێنە لەوەیان كە خاوەنی (دین)ە, ئەوا دەستت دەچێت بە خێرێكی گەورەدا.

"فاظفر بذات الدين". ئامۆژگاریی پێغەمبەرە ﷺ نەك شتی تر، چونكە بە ڕاستی ئەوەی شیاوی كەسی دیندارو كەسایەتی بەرز بێت, دەبێت دین جێگە تەمای بێت لە هەمووشتێكدا، بە تایبەت لە كارێكی وەك هاوسەرگیریدا, كە پێكەوە بوونێكی درێژخایەن ڕوودەدات لە نێوان پیاوو ئافرەتەكەدا.

٩١ – لە لاپەڕە (٢٠٦)دا, دەقێك دێنێت و واتای دەكات بەم جۆرە: "ئەگەر پیاوێك پاش هەموو پاك بوونەوەیەكی مانگانەی ژنەكەی یەك جار چووە لای ژنەكەی، ئەوە هەقی خۆی پێداوە، "إن الرجل إذا أتى إمرأته في كل طهر فقد أدى حقها".

دەڵێین:

"یەك جار" ئەمە ڕاڤەو مانا كردنێكی تا بڵێی سەقەتە, چونكە بە ڕوونیی لە دەقەكەدا هاتووە, وەك دیارە باسی "یەك جار"ی نەكردووە، واتە: ڕاستییەكەی ئاوهایە: "ئەگەر پیاو لە هەموو پاك بوونەوەیەكی مانگانەی خێزانەكەیدا چووە لای ئەوە مافی خێزانەكەی داوە". بێ دیاریكردنی جار ودوو جار.

ئەگەر وەك واتاكەی مەریوان بووایە, دەبوو دەقەكە بەم جۆرە بێت "في كل طهر مرة" یان "إذا أتى إمرأته مرة في كل طهر".

كەواتە هەر فەلسەفە لێدانێك لەسەر ئەم دەقە, كە مەریوان كردوویەتی بەتاڵە!.

٩٢ – لە لاپەڕە (٢٠٧)دا, نوسیویەتی پیاوێك هاتە خزمەتی و پێی وت: "ژنەكەم كوڕێكی بووە بە هی خۆمی نازانم... پەیامبەریش پێی دەڵێت: وشترت هەیە؟ دەڵێ: بەڵێ، پێی دەڵێت: ڕەنگاو ڕەنگیان تێدایە؟ پیاوەكە دەڵێ: بەڵێ، پەیامبەر پرسیاری لێدەكات: ڕەنگە بۆزەكەیان لە چییەوە هاتووە؟ پیاوەكە دەڵێت: ڕەنگە دەمارێك كشابێت، پەیامبەریش دەڵێت: كوڕەكەی تۆش ڕەنگە دەمارێك كشابێت". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (بخاری ومسلم) دەكات.

دەڵێین:

قوڕ بەسەر ئەو نەتەوەو هۆزەی, كە مەریوان و وەرگێڕو واتاكاریان بێت، با بێین دەقە عەرەبییەكە بهێنین: "أن رجلا أتى النبي ﷺ فقال: يا رسول الله ولد لي غلام أسود، فقال: هل لك من إبل؟ قال: نعم، قال: ما ألوانها؟ قال: حمر، قال: هل فيها من أورق؟ قال: نعم، قال: فأنى ذلك؟ قال: لعله نزعه عرق، قال: فلعل إبنك هذا نزعه"[١١٥]. واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پاشان وتی: ئەی پێغەمبەر خێزانەكەم منداڵێكی ڕەشی بووە، فەرمووی: وشترت هەیە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟ وتی: سورە، فەرمووی: خۆڵەمێشیی تێدایە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەو جۆرە لە كوێوە پەیدا بووە؟ وتی: بێگومان لەوانەیە لە بنەچەی ئەو وشترەدا, وشترێك هەبوبێت خۆڵەمێشی بوبێت و ئەم وشترەش ئەو ڕەنگەی لەوەوە پچڕی بێ بۆ خۆی، فەرمووی: دەی منداڵەكەی تۆش, بێگومان لەوانەیە یەكێك لە بنەچەكەی ڕەنگی ڕەش بووبێ و ئێستا ئەو منداڵە ئەو ڕەنگەی لەو پشتەوەی پچڕی بێ و وەك ئەو ڕەش دەرچووبێ.

---

[١١٤] رواه البخاري, رقم (٥٠٩٠).

[١١٥] رواه البخاري, رقم(٥٣٠٥ و ٦٨٤٧ و ٧٣١٤).

"أورق" ئەم جۆرە ڕەنگە لە وشتردا, بەو ڕەنگە دەوترێت کە دەچێت بە لای "ڕەنگی خۆڵەمێشی"دا. وەك (إبن حجر) دەڵێ[116].

لە هەندێ گێڕانەوەدا پیاوەکە دەڵێ:

"ڕەنگی ڕەشە, دڕدۆنگم لێی" (إبن حجر) دەڵێ: واتە: مەبەست ئەوە بووە کە لە دڵەوە دڕدۆنگ بووە, نەك بە زمان نکۆڵی لە کوڕەکەی بکات[117].

"نزعە عرق" واتە: یەکێك لە بنەچەکە لەو ڕەنگە بووە، ئەویش ئەو ڕەنگەی بۆ لای خۆی کێشاوەو چۆتە سەر ڕەنگی ئەو[118].

کەواتە: "بەهی خۆمی نازانم" , "ڕەنگاوڕەنگیان تێدایە"و "ڕەنگە دەمارێك کشا بێت". تێچەنی مەریوان و سەقەتیی ماناکردنی دەقەکەیەو شێواندنی ڕەوانبێژیی زمانەوانییە.

٩٣- ئەگەر دەتەوێت تا سەر ئێسقان کەودەنی زانستیی مەریوان بزانی, سەرنج لە تێگەیشتنە سەقەت و شێواندنی ئەو دەق و شانە بدە, کە چەند ستەمیان لێکراوە, وەك کورد دەڵێ"فیکە بە برای بێ لێو لێدەدەن"، لە لاپەڕە (٢١٠)دا, لە بارەی"بەردباران کردن" دەڵێ: "وەك هەندێ کەس بۆی دەچن ڕەجم ڕەجم داهێنانێکی ئیسلامی نییە، پێش دەرکەوتنی ئیسلام ئەم دیاردەیە پەیڕەو کراوە، أکان یرمي في الجاهلیة؟ قال: نعم، الرجم کان قبل المبعث، لە (إبن عباس)یان پرسیوە لە سەردەمی جاهیلیدا بەردباران هەبووە؟ لە وەڵامدا وتویەتی: بەڵێ, ڕەجم پێش پەیامی ئیسلام هەبووە". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (ج١٩, تفسیر قرطبي)دەدات.

دەڵێین:

ئەمە سەراپای وەها نییە, دۆو دۆشاوی بە سەر یەکدا کردووە:

١- پێش بوون بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرﷺ, جنۆکەکان دەچوون لە نزیك ئاسمان گوێیان هەڵدەخست, تا هەواڵی ئاسمان بزانن, پاشان هەندێکیان ئەو هەواڵانەیان دەهێنایەوە بۆ ئەوانەی فاڵچی و قاوەگرەوەییان دەکرد, بەڵام کاتێ پێغەمبەرﷺبوو بە پێغەمبەرﷺ, جنۆکەکان لەمە قەدەغەکران, هەر جنۆکەیەك لە ئاسمان بۆ ئەو مەبەستە نزیك بکەوتایە "نەیزەکی ئاگراوی" تێدەگیرا, وەك خوای گەورە لەسەر زاری جنۆکەکان خۆیان لە سورەتی "الجن" باسی هەندێك کاریان دەکا, لەوانە ئەم گوێ هەڵخستنەیان بوو لە ئاسمان.

جا (قورتوبی) لە ڕاڤەی ئایەتی ﴿و أنا کنا نقعد منها مقاعد للسمع...﴾ (الجن) ٩, ڕاجیاییەك لە نێوان زانایاندا باس دەکات, کە ئایا پێش پێغەمبەرایەتی جنۆکەکان ڕێگرییان لێدەکرا لە گوێ هەڵخستن یان نا؟ پاش هێنانی چەند فەرموودەو وتەیەك, دێتە سەر ئەوەی کە وتەی ڕاستتر ئەوەیە, کە جنۆکەکان پێشتریش ڕێگرییان لێکراوە, بەڵام بە هاتنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر, ئەم ڕێگرییە زیادی کردووە, پاشان فەرمودەیەك لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە, کە باس لە شێوەی هاویشتنی ئەستێرە دەکات و چۆن دەگیرێتە جنۆکە, کە (ابن عباس)یش باسەکە لە کۆڕ و دانیشتنێکی پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە, لە پاش ئەمە (قورتوبی) بە دەق دەڵێ: " وهذا یدل علی ان الرجم کان قبل المبعث"[119].

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەێنێت, کە "رجم" واتە: هاویشتنی پارچەی ئاگرین, کە پێی دەوترێ "شُهُب" بۆ جنۆکە گوێ هەڵخەرەکان لە پێش پێغەمبەرایەتیدا هەبووە, پاشان (قورتوبی) دەڵێ: "ورواه الزهري نحوه عن علي ابن حسین بن علي بن أبي طالب عن ابن عباس". واتە: وە (زوهری) هاوشێوەی ئەمە لە عەلی کوڕی حسەین کوڕی عەلی کوڕی

---

[116] مقدمة فتح الباری, فصل (ور).

[117] بڕوانە: فتح الباری, ج٩, ص ٥٠٧, ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥٣٠٥).

[118] بڕوانە: فتح الباری, ج٩, ص ٥٠٨.

[119] تفسیر القرطبی, ج١٩, ص١٣.

ئەبو تالب لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە, (قورتوبی) دەڵێ: "وفي أخره قيل للزهري: أكان يرمي في الجاهلية؟ قال: نعم"[١٢٠].

لە کۆتایی گێڕانەوەکەدا بە (زوهری) وترا: ئایا پێش پێغەمبەرایەتی (لەنەفامیدا) جنۆکە نەیزەکییان تێدەگیرا؟ وتی: بەڵێ.

٢ – کەواتە, باسەکە باسی "نەیزەك" هاویشتنە بۆ ئەو جنۆکانەی گوێ هەڵدەخەن, نەك زیناکاران.

٣ –قسەکە لە وتەیەکی (قورتوبی) کە دەڵێ: "وهذا يدل على أن الرجم كان قبل المبعث"و وتەیەکی (زوهری) کە لێی دەپرسن: " أكان يرمي ..."پێکدێت, بەڵام مەریوان هەردووکی لێکداوەو کردوویەتی بە قسەی (ابن عباس)!.

٤ – (ابن عباس) فەرموودەیەك دەگێڕێتەوە, کە لە خزمەتی پێغەمبەر بیستوویەتی[١٢١].

٩٤ – لە لاپەڕە (٢١١)دا, دەقێك لە تەفسیری (قورتوبی)دا ڕاگوێز دەکات, کە باس لەوەیە (عەلی بن أبي طالب) ڕەجم و شەلاقە لێدانی, هەردووکی لە بەرامبەر (شراحة الهمداني)دا جێبەجێ کردووە, پێش ئەم دەقە دەڵێت: "زۆر جاریش زیادەی خستۆتە سەرو جەڵدو ڕەجمی پێکەوە بۆ یەك کەس پیادە کردووە" ئینجا دەقەکە دەهێنێت.

دەڵێین:

مەریوان, هەرکات لە دوور, یان نزیك, بزانێت شتێك هەیە تۆزێ بە لای مەبەستەکانیدا دەچێت, دێ بەڵگەسازیی پێدەکات, وەك ئەو بەسەر هاتەی (عەلی) کە لە یەککاتدا ڕەجم و جەڵدی بۆ کەسێك بەکار هێناوە, بەڵام بێئاگایە, چاکتر بڵێین خۆگێل کردن هەستی پێدەکرێت لەوەدا, کە جەماوەری زانایان لەسەرین, پێچەوانەی ئەم کارەی (علی)یە.

(إبن كثير) دەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە ڕەجم کردنی ئەو ژنەی, کە لەگەڵ کوڕە کرێکارەکەدا زینای کردبوو، وە (ماعز)و(غامدية)ی ڕەجم کرد، لە هیچ یەکێ لەمانەدا ئەوە ڕاگوێز نەکراوە, کە پێغەمبەر ﷺ لە پێش ڕەجم کردنەکەدا جەڵدی لێدابن، بەڵکو بە پێچەوانەوە فەرموودەگەلێکی ساغ ودروست بە چەندین ڕێگەو لەفز هاتون, کە لە ناو خۆیاندا پشتگیریی و بەهێزی یەکتر دەکەن, کە تەنها ڕەجم لەسەریانەو باسی جەڵد نەهاتووە تیایاندا، لەبەر ئەمەشە, کە جەماوەری زانایان و ئەبو حەنیفەو مالیك و شافیعی لەسەر ئەم بۆچوونەن" [١٢٢].

ئەم بۆچوونەش گێڕدراوەتەوە لە (عمر)ە وە, هەروەها وتەی (زوهری, نەخەعی, ثەوری, ئەوزاعی, ئەحمەدو ابو ثور)ە[١٢٣].

٩٥ – لەسەر ئەو باسەی پێشووتر, لە پەراوێزەکەدا, مەریوان ئەوەندە نەزانیی خۆی دەرخستووە بێ ئەندازە، پاش ئەوەی وەك سەرچاوە ئاماژە بە (تفسير القرطبي) دەدا, ئەمەی نوسیوە: "بهذا القول الحسن البصري والحسن بن صالح بن حي وإسحاق وقال جماعة من العلماء".

دەڵێین:

ئەمە بەو جۆرە نییە، بەڵکو (قورتوبی) کاتێ بەسەر هاتەکەی (علی) باس دەکات, دەڵێ: "وقال بهذا القول الحسن البصري والحسن بن صالح بن حي وإسحاق". ئیتر لێرەدا خاوەنانی ئەم بۆچوونە تەواو دەبن.

دواتر (قورتوبی) دێت باس لە بۆچوونی ئەو کەسانە دەکات, کە پێیان وایە تەنها ڕەجم دەبێ بکرێ, دەنوسێ: "وقال جماعة من العلماء: بل على الثيب الرجم بلا جلد"[١٢٤].

واتە: دەستەیەك لە زانایان دەڵێین: بەڵکو لە سەر خاوەن هاوسەر (ژن بێت, یان پیاو), تەنها ڕەجمی لە سەرە بە بێ جەڵد.

---

[١٢٠] تفسير القرطبي, ج١٩, ص١٣.

[١٢١] بۆ ئاشنا بوونی زیاتر بڕوانە: تفسير القرطبي, ج١٩, ص١٢-١٣, ئایەتی ٩ الجن.

[١٢٢] إبن كثير, ج٣ تفسير اية ٢ النور.

[١٢٣] تفسير القرطبي, ج٥, ص٨٧.

[١٢٤] تفسير القرطبي, ج٥, ص ٨٧.

جا بەرێزان، خۆ دەزانن مەریوان، نەك شێواندن, بەڵكو گاڵتەش بەكاری خەڵكی دەكات و پێی وایە خەڵكی ئێستاش لە سەردەمی "هذا بدرهم و هذا بقرش" دا دەژی.

٩٦ – لەلاپەڕە(٢١٣)دا, دەقێك لە تەفسیری (قورتوبی)دا, هێناوەو واتای كوردی كردووە, دەڵێ: "ڕەجم, كوشتن و بەردباران كردن‌و نەفرەت لێكردن‌و دەربەدەر كردن‌و جنێودان دەگرێتەوە, لە بەرئەوەی خوا بە نوحی وتووە: ئەگەر كۆتایی پێنەهێنی ئەوا لە ڕەجم كراوەكان دەبیت".

دەڵێین: دەقەكە ئاوەهایە "والرجم: القتل و اللعن و الطرد والشتم, وقد قيل هذا كله". في قوله تعالى: ﴿ لئن لم تنته يا نوح لتكونن من المرجومين﴾. واتە وشەی "الرجم" كوشتن, نەفرەت, دەركردن‌و جنێودانە, هەموو ئەم واتایانەش لەسەر ئەو فەرموودەی خوا وتراوە، كە باسی گەلەكەی (نوح) دەكات، كە بە (نوح) دەڵێن: ئەی نوح ئەگەر تۆ دەست هەڵنەگریت.

كەواتە:

١ – "بەردباران " تێچەنی مەریوان خۆیەتی.

٢ – "لەبەرئەوەی خوا بە( نوح)ی وتووە..". نەزانیی و نەفامیی و چەواشەكارییە, چونكە سادەترین كەسێك, كاتێ سورەتی (الشعراء) دەخوێنێتەوە, دەگاتە ئەو ئایەتە دەزانێ، كە ئەوە گەلەكەیەتی وای پێدەڵێن: ﴿ قالوا لئن لم تنته يا نوح لتكونن من المرجومين ﴾ الشعراء/١١٦, خوای گەورە قسەی ئەو هۆزە باس دەكات، نەك وا بە (نوح )بڵێ, بەڵكو بە (نوح) دەوترێت ﴿ يا نوح اهبط بسلام منا و بركات عليك وعلى أمم ممن معك﴾هود /٤٧. ئەی (نوح) لە سەر كێوی (جودی) دابەزە, لە ئێمەوە سڵاوت لە سەرو لە هەموو ئەو نەتەوانەشی لەگەڵ تۆ دان.

٩٧ – لە لاپەڕە(٢١٣)دا, ئەم دەقە دەنوسێ: "الأمة منهن اذا زنت نصف ما على الحرة أذا زنت". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە تەفسیری (القرطبي) دەكات لە سورەتی (النساء) ئایەتی ٢٥.

دەڵێین:

١ – خۆ ئەگەر ئێمەیش وەك (قورتوبی) بمرین، سوپاس بۆ خوا بە هەزاران نوسخە لە تەفسیرەكەی لە جیهاندا هەیەو دەمێنێ، ئەوەی دەیەوێ با بچێت سەیری تەفسیری (القرطبي) بكات, لەو جێگەیەی مەریوان ئاماژەی بۆ كردووە, بزانێ دەقی وا دەبینێ؟ بێگومان نەخێر.

٢ – "الامة منهن...". داڕشتنی وا سەقەت و ناڕێك، تەنها لە قاموسی مەریوان دەوەشێتەوە، كە تەنانەت نازانێ چۆن وشە ڕێك بخات، مەریوان وەك لە سەرچاوە ڕێك كردنەكەیدا بۆی نەچۆتە سەر, دەبوایە هیچ نەبێت دەقەكەی بەڕێكی و بە پێی بنەمای زمانی عەرەبی بنوسیایە, واتە بەم جۆرە: "ألامة أذا زنت فعليها نصف ما على الحرة البكر أذا زنت".

بەسەرهاتێك:

(ئەصمەعی) دەڵێ: "ڕۆژێك بە پیاوێكم وت: ئەوە تۆ لە كوێ بوویت؟ دەڵێ: لەگەڵ جەنازەی كوڕی فلان كەسدا بووم, منیش وتم: كام كوڕەیانی بوو؟ وتی دوو كوڕی هەبوو ناوەنجییەكەیانی مردووە"[١٢٥].

٩٨ – لە لاپەڕە (٢١٤)دا, ئایەتی (٢٥)ی سورەتی (النساء) دێنێ و واتای دەكات, بەم جۆرە: "گەر لەنێو ئێوە دا هەبوو نەیتوانی موحصەنی ئیماندار بهێنێ بیكاتە هاوسەری خۆی, ئەوە با لە كەنیزەكە ئیماندارەكان بهێنێ و بە مۆڵەتی كەسوكاری مارەیان بكات و كرێكەیان بە باشی و چاكی بداتێ".

دەڵێین:

ئەمە بە قسەی مەریوان ڕاڤەی "ومن لم يستطع منكم طولاً أن ينكح المحصنات المؤمنات فمن ما ملكت أيمانكم من فتياتكم المؤمنات والله أعلم بايمانكم بعضكم من بعض فانكحوهن بأذن أهلهن وأتوهن أجورهن بالمعروف...".

واتە: ئەگەر كەسێك توانای دارایی نەبوو، كە لە ئافرەتە ئازادە داوێن پاكەكان بهێنێ، ئەوا با لەوانە بهێنێ، كە كەنیزەكتانن, لەو ئافرەتانەی باوەڕیان هێناوە، وە خوای گەورە زۆر زانایە بەڕاستی و نهێنی هەموو كارەكان, ئێوە

[١٢٥] أخبار الحمقى و المغفلين، ص٢٠٢ ابن الجوزي.

هەمووتان نەوەی (ئادەم)ن و لە یەك نەفس, مارەیان بکەن و بیانخوازن بە ڕەزامەندیی و مۆڵەتی خاوەنەکانیان, وە مارەییەکانییان بدەنێ بە باشی, واتە بە دڵێکی پاکەوە بە بێکەم وکورتی[١٢٦].

بەڕێزان:

١- مەریوان "والله أعلم بایمانکم بعضکم من بعض"ی واتا نەکردووە, یان نەیزانیوە، یان وەك کارو پیشەی هەمیشەیی شێواندنی دەقەکانی بە مەبەست بووە، هەردوو گریمانەکە هەڵدەگرێت.

٢- "کەسوکار" و "کرێکەیان". وەك مەریوان نوسیویەتی بەهیچ جۆرێ لەگەڵ ڕاڤەی ئایەتەکەو وتەی زانایان یەکناگرێتەوەو هیچ ڕاڤەکارێکی ڕەسەنی قورئان بەو جۆرەی مەریوان ڕاڤەیان نەکردووە.

٩٩- هەر لە سەر ئەو ئایەتە، بەڵام لە بەشێکی تری ئایەتەکە، واتە لێرەوە ﴿محصنات غیر مسافحات ولا متخذات أخدان...﴾.دەڵێ: "بەڵام دەبێ ئەو کەنیزەکانە بۆ لەوە دوا داوێن پاك بن و بە نهێنی دۆست نەگرن".

دەڵێین:

لە ڕاڤەکاندا بەم جۆرە ڕاڤە کراوە: "ئەو کەنیزەکانە دەبێت حاڵیان وەها بێت کە داوێن پیس و دۆستگر نەبن بە نهێنی"[١٢٧].

واتە: "محصنات غیر مسافحات ولا متخذات أخدان" (حال) ە، بۆ جوملەی ڕابردوو لە "فمن ما ملکت أیمانکم من فتیاتکم المؤمنات"[١٢٨].

کەواتە: "بەڵام دەبێ...." ڕاڤەیەکی سەقەتە، بەڵکو دەبێ ئەو کەنیزەکانە "حاڵیان وابێ" دەنا نابێ مارە بکرێن.

من وادەزانم هێشتا دەبێ ئەوانەی قسە لە بارەی قورئان وفەرموودەو دەقە عەرەبییە ڕەسەنەکان دەکەن، پێویستە بەبنەمای زمانەوانیی عەرەبییان خوێندبێ, یان دەبێ بیخوێنن، دەنا زۆر ستەم دەکرێ لە خودی ئەو دەقانە.

١٠٠- لە لاپەڕە (٢١٥), لە پەراوێزی ژمارە (٤٣)دا, نوسیویەتی: "موحەمەد بە خاوەندارەکانی وتووە بەزۆر زینا بە کەنیزەکەکانیان نەکەن، هەر کەنیزەکێ بە زۆر زینای پێ بکرێ، خوا لە گوناهی ئەو کەنیزەکە خۆش دەبێ". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (صحیح البخاری, باب: کسب البغی) دەکات.

دەڵێین:

١- ئەوە سەراپا چەواشەکارییە، موحەمەد شتی وای نەفەرمووە، بەڵکو خوای پەروەردگار لە سورەتی(النور) ئایەتی (٣٤)دا, دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّناً لِتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَنْ يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِنْ بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾.

٢- ئەو جێگەیەی لە (بوخاری)دا ئاماژەی پێداوە دوو فەرموودەی تێدایە، یەکەمیان باس لەوە دەکات کە پێغەمبەر ﷺنەهی کردووە لە پارەی سەگ ومارەیی داوێن پیس و ئەو دیاریی و دەسەنەیەشی دەدرێ بە فاڵچیی و دەستگرەوە، لە دووەمیشدا باس لەوە دەکات, کە پێغەمبەر ﷺنەهی کردووە لە پارەیەك کە کەنیزەکێك بە داوێن پیسی پەیدای دەکات[١٢٩].

١٠١- لە لاپەڕە (٢١٥ )دا، وتەیەکی(علی بن أبی طالب) دێنێ, پاشتر دەقە عەرەبییەکە دەنوسێت و لە لاپەڕە (٢١٦)دا, بە ژمارە (٤٥) لە پەراوێزەکەدا دەنوسێ: (صحیح البخاری، باب: تأخیر الحد عن النفساء).

دەڵێین:

[١٢٦] بڕوانە: تفسیر القرطبي, أبن كثیر, مختصر تفسیر الطبري.

[١٢٧] بڕوانە: هەموو ڕاڤە متمانە پێکراوەکانی ئیسلام.

[١٢٨] بڕوانە: تفسیر الجلالین، سورەتی (نساء) ئایەتی ٢٥.

[١٢٩] صحیح البخاري، رقم(٢٢٨٢ و٢٢٨٣)

باوەڕ بکەن بەڕێزان ئەمە بوختـان نییـە، بەڵکو ڕاستییە, گـەرنا خۆتـان بگـەڕێن, بزانن ناونیشانی وەهـا لـە(صـحیح البخاري)دا دەبینن!، بەڵام دڵنیاتان دەکەمەوە تیایدا نییەو خۆشتان ماندوو مەکەن.

١٠٢- لە لاپەڕە (٢١٨ )دا ئایەتی (٤ )ی سورەتی (النور )دێنێ لە پاش ئەوە، کە باس لە چوار شاهیدی پیاو دەکات لە بارەی بینینی زیناوە دەنوسێ: "ئەگەر پیاو نەبوو دەبێ هەشت ژنی ئازاد، ئەگەر نەبوو دەبێ شانزە کـەنیزەك لەگـەڵ خۆی ببات بۆ لای قازی تا شاهیدی بۆ بدەن".

دەڵێین:

ئەم فەتوایە یەکەمجارە دەبیسترێ، کە بۆ شاهیدی زینا ئەگەر چوار پیاو نەبوو دەبێ "هەشت ژن..."چونکە:

١-یەکدەنگیی نەتەوەی ئیسلام لە سەر ئەوەیە, کە شاهیدی زینا دەبێت چوار نێرینەی مسوڵمانی دادپەروەربن[١٣٠].

٢- وە یەکدەنگن لە سەر ئەوەی، کە شاهیدی ئافرەت لە(حدود) و (قصاص)دا, وەرناگیرێ, بەڵام بەتەنها شاهیدییان وەردەگیرێ لە سەر شتێ، کە پیاوان ئاگادارنین لێی، وەك (منداڵ بوون، شیردان)و ئەو شتانەش کە بـەزۆری لای پیـاوان شاراوەیە[١٣١].

١٠٣- لە لاپەڕە (٢١٩ )دا لە سەر ئایەتی (٤)ی سورەتی (النور)، کە باس لەوە دەکات, ئەگەر کەسێك چوار شاهیدی نەبوو, ئەوا جەڵدی لێ بدەن و شایەتی قبوڵ مەکەن, ئەوانە فاسقن, دەڵێ: "جا ئەگەر شکایەتی کردو شاهیدی نەبوو, ئەوا هەشتا جەڵدی لێ بدەن، هەتا لە ژیانیشدا ماوە شایەتی لێوەرناگیرێ, دواتر وەك فاسق تەماشا دەکرێت".

دەڵێین:

هەر چەندە مەریوان بیەوێ چاو بەست لە خوێنەر بکات, بۆی ناچێتە سەر, چونکە شتەکان خۆیان زیندوون و هـاوار دەکەن, هەر چـەندە هـەوڵ بـدرێ لـە خـەڵکی بشاردرێتەوە هـەر ئاشکرا دەبێ, مـەریوان ئـەوەی وتوویـەتی وەهـا نییـە, چونکە ئایەتەکەی دوا ئەو ئایەتە, واتە ئایەتی(٥)ی (النور) کە دەفەرموێ: ﴿الا الذين تابوا من بعد ذلك و أصلحوا فان الله غفور الرحيم﴾.

واتە: "تەنها ئەوانە نـەبن، کـە دەگـەڕێنـەوە و خـۆیـان چـاك دەکـەن, ئـەوان بـەڕاستی خـوا پۆشـەری گوناهەکانیانـە بـە لێبوردەیی خۆیی, وە سۆزو میهرەبانە پێیان[١٣٢]".

جەماوەری زانایان لە وانە (مالیك، شافعی, ئەحمەد) و گـەورەی تابعییـەکان (سـعید بن المسیب) و کۆمـەڵێ لـە زانایانی پێشین (سلف) لە سەر ئەوەن, گەر بوختانچی و زیناکەر تەوبەی کردو خۆی چاك کرد, تەوبەی لێوەردەگیرێ, وە بـەبێ ڕاجیایی (فسق)ەکەشی لـە سـەر لادەچێ بـە تەوبەکـە[١٣٣]. چەواشـە کـردن بـە زیرەکانـە دەکرێـت, نـەك بـەو سادەییەی, کە مەریوان دەستی داوەتێ ...!

١٠٤- لەلاپەڕە (٢١٩)دا, لە بارەی چوار شاهید بۆ زینـا دەڵـێ: "هۆکـاری دەرکـەوتنی ئـەم ئایەتـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕووداوەکـەی (عائیشـە)، کـە بـەڕووداوی (الاءفـك) ناسـرابوو, پـەیامبـەر وتبـووی ئـەوەی دەڵێـت عائیشـەم دیـوە زینـای کردووە، دەبێت چوار شاهیدی هەبێت".

دەڵێین:

بۆ "ئەم ئایەتە" ئەگەر ڕاستی دەکرد، تەنها یەك بۆچوونی لاوازی لە سەر ئەو قسەیەی بهێنایە, تا بوترایە مەریوان لەم قسەیەیدا پێشینەیەکی لاوازی هەیە, بەڵام "فاقد الشيء لايعطي". دڵنیام کەسی ژیر بەمانـە زیـاتر مـەریوانی بۆ دەردەکەوێت, کە چەندە نازانستییانە لە ماناکان دەدوێت .

---

[١٣٠] تفسير القرطبي، ج٥, ص٨٤

[١٣١] رحمة الامة، ص٥٧٣.

[١٣٢] مختصر تفسير الطبري، ج٢، ص٩٢.

[١٣٣] بڕوانە: تفسير القرطبي، ج ١٢، ص١٧٨-١٧٩ أبن كثير، ج٣، ص٢٥٠, رحمة الامة, ص٥٧٤.

١٠٥– لەلاپەڕە (٢١٩–٢٢٠)دا, باسی ئەو ڕووداوە دەکات، کە تۆمەت بۆ (مغيرة بن شعبة)ە هەڵدەبەستریٚ, دەنووسیٚ: "(ابو موسى) لەگەڵ (براء بن مالك وعمران بن حصين وابانجيد)... دەچن بۆ بەصرە, پاش چاودێرییەکی ورد, دوای ئەوەی بە شاهیدی چوار کەس (مغيرة) دەبینن لەماڵێکدا زینا دەکات, لەگەڵ شاهیدەکاندا دەینێرن بۆ لای عومەر..., یەکەم شاهید (نافع بن حارث) دەبێت دەڵیٚ: (مغيرة)م بینی بە سەر سکی ژنەکەوە...، هەروەها دەنووسیٚ: "دووهەم وسێهەم شاهید (شبيل بن معبد)و (ابوبكر) بەهەمان شێوەی (نافع) شایەتی ئەوەیاندا، کە (مغيرة) لەگەڵ (ام جميل)دا زینای کردووە..., بۆ شاهیدی چوارەم (زياد بن ابيه) پێش ئەوەی شاهیدی بدات، عومەر، پێی دەڵیٚ: ئەی زیاد، تۆ درۆ ناکەیت, ئەوەی لە تۆی ڕادەبینم ئەوەیە، بە هۆی تۆوە هاوەڵێکی پەیامبەر ڕەجم نەکرێت, زیاد کە بۆی دەردەکەوێت, عومەر (مغيرة)ی خۆش دەوێت, دەڵیٚ: دیمەنێکی زۆر ناشرینم بینی, گوێم لە ئاخ و ئۆف و هەناسە بڕکیٚ بوو, سمتێکم بینی بەرز دەبووەو نزم دەبۆوە, دوولنگیش، وەك گوێچکەی کەر بەرز ببونەوە, ئیتر من هیچم نەدی، عومەریش ئەم قسەیە بە شاهیدی وەرناگرێت و موغەیرە ڕەوانەی بەصرە دەکاتەوە, سیٚ شاهیدەکەی تریش ڕەوانەی (٨٠)داری حەد دەکات, لە کاتی لێدانە کەدا (نافع بن الحارث) لەسەر قسەی خۆی سوور دەبێت". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (فتوح البلدان)[١٣٤] و (مجتمع يثرب) دەکات.

دەڵێین:

١–ئێمە دێین ئەم بەسەر هاتە لە سەرچاوە بەهێزو متمانە پێکراوە بێخەوشەکان وەردەگرین بەم جۆرە:

(مغيرة کوڕی شعبة) والی عومەر دەبێت لە شاری بەصرە (ابوبكرة) تاوانباری دەکات بەکاری زینا, (ابوبكرة)و (نافع بن حارث) و(شبيل ابن معبد) و(زياد بن عبيد) کۆدەبنەوە, دەبینن (مغيرة) خۆیداوە بە سەر ئافرەتێکدا, کە پێی دەوترا (رقطاء) کە بە (ام جميل بنت عمرو) ناسرا بوو، ئەم چوارە ڕۆیشتن بۆ لای عومەر و شکایەتییان لە موغەیرە کرد، عومەریش (مغيرة) لە پۆستەکەی لا دەبات و (ابوموسى) دەخاتە شوێنەکەی, پاشان (مغيرة) ئامادەی لای عومەر دەبێت, سیانییان شایەتی دەدەن، کە (مغيرة) زینای کردووە، بەڵام (زياد) شایەتییەکەی یەکلا ناکاتەوەو دەڵێت دیمەنێکی ناشرینم بینی، نازانم تێکەڵاوی ببوو، یان نا، پاشان عومەر فەرمان دەکات کە ئەو سیانە جەڵدیان لێبدریٚ, پاشان پێیان دەڵیٚ: هەر کامتان لە شایەتییەکە پەشیمان ببێتەوە, لە مەودوا قسەی وەردەگرم. (شبيل و نافع) خۆیان بەدرۆخستەوە، بەڵام (ابوبكرة) پاشگەز نەبووەوە[١٣٥].

٢– لە گێڕانەوەیەکی حاکمدا هاتووە، کە (زياد) وتویەتی:"هەردووکیانم لە ژێر یەك بەتانیدا بینی, گوێم لە هەناسەیەکی بەرزبوو، بەڵام نازانم چی لە پشت ئەمەوە بوو"[١٣٦].

٣– لە یەکێك لە گێڕانەوەکاندا هاتووە: "کاتێك (زياد) دێت عومەر دەڵێت, پیاوێك هات بە حەق نەبێت شایەتی نادات, زیاد دەڵیٚ: دیمەنێکی ناشرین وکەوتن بە سەر یەکمدا بینی"[١٣٧].

٤– (شنقيطى) دەڵیٚ: "ئەوەی لەم بە سەرهاتەدا بۆ ئێمە دەرکەوتوە ئەوەیە، ئەو ئافرەتەی کە بینراوە لەگەڵ (مغيرة) تێکەڵاو بووە, لەو کاتەدا کە (با) دەرگاکەی کردۆتەوە و بینراون, ئەوە خێزانی خۆی بووەو ئەوان نەیان ناسیوەتەوە, بە ئافرەتێکی تر تێگەیشتوون، کە ئەو ئافرەتە هاتوچۆی لای (مغيرة)و بەرپرسەکانی تری دەکرد, بۆیە وایان زانیوە ئەوە, بۆیە ئەوان مەبەستییان شتی خراپ نەبووە, بەڵام لە گومانەکەیاندا بە هەڵەدا چوون"[١٣٨].

ا– ئەوەی مەریوان دەڵیٚ: "أبو موسى....." بەتاڵە, چونکە ئەو چوار کەسە کە ئەو دیمەنە دەبینن دەچنە مەدینە, ئینجا (أبو موسى) لە وێوە بەڕیٚ دەکەوێت.

---

[١٣٤] شتی وا لەم بارەوە لەم کتێبەدا بوونی نییە.

[١٣٥] بڕوانە: فتح البارى ، ج٥، ص٢٨٨، باب / شهادة القاذف و السارق والزانى.

[١٣٦] هەمان سەرچاوە.

[١٣٧] المعجم الكبير للطبرانى, ج٧، ص٣١١، رقم الحديث(٧٢٢٧).

[١٣٨] مذكرة اصول الفقه على روضة الناظر, ص٢٣٠, محمد الامين الشنقيطى.

ب –(ابوبكر) نییه ، بەڵكو (ابوبكرة) یه.

ج –"ئەی زیاد تۆ درۆ ناكەیت...." و "ئاخوئۆف...". له تێچەنه سەقەتەكانی مەریوان خۆیەتی.

د – "زیاد كه بۆی دەردەكەوێت...". بەتاڵەو بێ بنەمای زانستییه.

ه – "له كاتی لێدانەكەدا (نافع بن الحارث) له سەر قسەی خۆی سوور دەبێت". وانییه, بەڵكو ئەوەی كه سوور دەبێت لەسەر قسەی خۆی (ابوبكرة)یه، برای دایكی (نافع)ه، نەك (نافع) خۆی[139].

١٠٦– له لاپەڕە (٢١٩)دا, له بارەی (مغیرة)وە دەڵێ: "به هۆی مێبازی خۆیەوە چەند جارێك شكایەتی لێدەكەن".

دەڵێین:

هەموو سەرچاوەكان له بارەی (مغیرة)وە, هەر تەنها ئەو ڕووداوە باس دەكەن, ئیتر "چەند جارێك" خۆڵكردنە چاوی خەڵكییه!.

١٠٧– له لاپەڕە (٢٢٧)دا, ئایەتی (٣٠)ی سورەتی (النور)دێنێ و ڕاڤەی دەكات, دەنووسێ: "زیناكەری (نێر) جگە له زیناكەری (مێ), یان ژنێكی بێباوەڕ ناتوانێ هیچ مێیەكی تر له خۆی مارە بكات، زیناكەری مێیش جگە له زیناكەری (نێر), یان كەسێكی بێباوەڕ ناتوانێ شوو به هیچ كەسێك بكات".

دەڵێین:

مەریوان، به بێ ئاماژە به هیچ سەرچاوەیەكی باوەڕ پێكراو هاتووە ڕاڤەی ئایەتەكەی بەسەقەتی كردووە, چونكه به بیری خۆی واتای كردووە, بەڵام شارەزایانی قورئان بەم جۆرە ڕاڤەی ئایەتەكە دەكەن (الزانی لاینكح الا زانیة أو مشركة والزانیة لاینكحها الا زاني او مشرك وحرم ذالك علی المؤمنین) دەكەن .

ئەمە هەواڵێكە لای پەروەردگارەوە, كه پیاوی زیناكار "زینا" لەگەڵ ئافرەتێكدا دەكات كه وەك خۆی زیناكار بێت، یان ئافرەتەكە هاوەڵ پەیدا كاربێت, واته: لەكاری زینادا هیچ ئافرەتێك به گوێی پیاوی زیناكار ناكات، مەگەر ئەو ئافرەتە زیناكارو سەرپێچیكار بێت، یان هاوەڵ پەیداكار بێت و ئەو كارەی به لاوە حەرام نەبێت، به هەمان شێوەش, ئافرەتی زیناكار تەنها لەگەڵ پیاوێكدا زینا دەكات، كه وەك خۆی زیناكارو خراپەكاربێت, یان هاوەڵ پەیداكار بێت[140].

هەروەها ئەم ئایەتە دەربارەی (مرثد بن ابی مرثد) هاتە خوارەوە، كاتێك ویستی (عناق)ی داوێن پیس بخوازێت، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو مەیخوازە[141] .

(ابن عباس) له سەر وشەی "نكاح" له ئایەتەكەدا, دەفەرمووێت: مەبەست گرێبەستو مارەكردن نییه, بەڵكو تەنها مەبەستی لێی "جووتبوونە", كەسێ زینا لەگەڵ ئافرەتێكی زیناكار ناكات، مەگەر ئەویش وەك ئەو زیناكار بێت, یان هاوەڵ پەیداكار بێت، "لیس هذا بنكاح انما هو الجماع لا یزنی بها الا زان او مشرك".

(ابن كثیر) دەڵێت سەنەدی ئەم قسەیه (صحیح)ە[142] .

(قورطبی) دەڵێ: پەیوەندی ئەم ئایەتە به پێش خۆیەوە كه بووترێت مەبەست لێی جووتبوونە (جماع) شتێكی جوان و بەلیغە[143].

---

[139] بڕوانە: فتح الباری, ج٥, ص٢٨٨, المحلی ج١٠, ص ٢٩٧, مسألة ١٨٠٧.

[140] تفسیر ابن كثیر مختصر تفسیر الطبری، ج٢، ص٩١.

[141] بڕوانە: ابو داود (٢٥١) النسائی (٣٢٢٨) والترمذی (٣١٧٧), ارواء الغلیل (١٨٨٦).

[142] تفسیر ابن كثیر آیة ٣ النور.

[143] تفسیر القرطبی، ج١٢، ص ١٦٧.

ئەمەش، کە بوترێت مەبەست لە نکاح لە ئایەتەکەدا جووتبوونە بۆچوونی ئەم کەسانەشە، کە هەمان قسەی (ابن عباس)یان لێوە گێڕدراوەتەوە (مجاهد, عکرمة, سعید بن جبیر, عروة بن الزبیر, ضحاك, مکحول, مقاتل بن حیان) و چەندین کە سی تر[١٤٤].

هەروەها ئەمە بۆ چوونی (طبری)یشە لە تەفسیرەکەیدا [١٤٥].

کەواتە، لەسەر وتەی ئەم بەڕێزانە, ئایەتەکە مانای "هەواڵ"ی تێدایە, واتە کەسی زیناکار حاڵی وەهایە, زینا تەنها لەگەڵ ئافرەتێکدا دەکات، کە هەر وەك خۆی زیناکار بێت .....

ئەگەر واتای هەواڵیش نەبێت, ئەوا دەڵێین: ئەگەر چ پیاوی زیناکار, یان ئافرەتی زیناکار تەوبەی کردو وازی لەو کارەی هێنا، ئەوا بێگومان ئەو کات دروستە مارە بکرێت, ئەمەش بۆچوونی پێشەوا (احمد)ە[١٤٦].

چونکە، وەك زانراوە هەتا کەسی (مشرك)یش, گەر تەوبە بکات، دێتەوە ڕیزی مسوڵمانان, ئەمەش ئەوەندە ڕوونە، کە پێویست بە بەڵگە ناکات.

جارێك پیاو و ئافرەتێك, لە سەردەمی خەلافەتی (ابوبکر)دا, زینا دەکەن، ئەویش پاش لێدانی (جلد), لێکیان مارە دەکات, هاوشێوەی ئەمەش لە (عومەرو ابن مسعود و جابر)یشەوە گێڕدراوەتەوە [١٤٧].

کەواتە:

لە سەر هەر شتێك, کەسێك تەوبە بکات و بگەڕێتەوە، ئەوا لە ئیسلامدا نەك پەراوێز ناخرێت، بەڵکو دەست خۆشیشی لێدەکرێت و هانیش دەدرێت, کە تێکەڵ بە کۆمەڵگەی مسوڵمانان ببێتەوە .

١٠٧– لە لاپەڕە( ٢٢٩)دا, دەنووسێ: "بە ئایەتێکی دیکە بۆمان دەردەکەوێ، کە کۆمەڵگای ئیسلام لە سەردەمی خودی پەیامبەردا بەتەواوی خۆیان کردۆتەوە دیاردەی سیکسبازی بەتەواوی پەرەی سەندووە، بەڵام نەیان دەتوانی ڕوانینی چاویان بگرن و بە نهێنی کاری سێکسی خۆیان کردووە". پاشان ئایەتی (٣٠)ی سورەتی (النور) بە بەڵگە دەهێنێتەوە.

دەڵێین :

ئایەتی ﴿ قل للمؤمنین یغضو من ابصارهم ویحفظوا فروجهم ذلك اذکی لهم واطهر ان الله خبیرُ بما یصنعون ﴾ النور/٣٠.

ئەمە ڕەوشتێکە خوا فێری هەموو باوەڕدارانی دەکات, کە پێی هەستن لە هەر جێگەو سەردەم و کاتێکدابن, تایبەت نییە بە جۆرێك, یان سەردەمێك یان کاتێك, ئەم ڕێنموونییە، کە کراوە زیاتر بۆ پاکێتیی و دوورکەوتنەوەیە لە کاری خراپ, نەك بەڵگە بێت لە سەر ئەوەی, کە "کۆمەڵگەی ئیسلام، بەتایبەتی لەسەردەمی خودی پەیامبەردا بەتەواوی ....."، وەك مەریوان دەڵێ, چونکە ئەوەی ئەمڕۆ دەکرێ‌و دەبینرێ لەوڵاتی خۆمان و وڵاتە بەناوپێشکەوتووەکانی ئەوروپاو خۆرئاوا, بە هەزار ئەوەندەی ئەو کارە سێکسیانەیە, کە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کراوەو ڕوویداوە.

پاشان سەیر کردنی نێرو مێ و پاراستنی عەورەت، چ پەیوەندی بە سەردەم وکاتەوە هەیە، تا بوترێت لەو سەردەمەدا کۆمەڵگاکە بە تەواوەتی ڕوویان لە سێکس کردووە، بۆ مەگەر کاری سێکس و خراپە ئێستا زۆرترە، یان جاران ؟؟؟

کەواتە:

---

[١٤٤] بروانە: تفسیر ابن کثیر, الدر المنثور، ج٥، ص١٩.

[١٤٥] تفسیر القرطبی, ج١٢، ص١٦٨, مختصر تفسیر الطبری، ج٢, ص٩١.

[١٤٦] ابن کثیر، ئایەتی ٣ النور.

[١٤٧] تفسیر القرطبی، ج١٢، ص ١٧٠.

ئایەتەکە ڕێنمونی کردنە بۆ شتێکی پاکترو چاکتر، جا کێ دەچێت بە دەمییەوە, ئەوە خۆی قازانج دەکات, کێش پشتی لێ هەڵدەکات, زیان لە خۆی و کۆمەڵگا دەدات.

١٠٨ – لەلاپەڕە (٢٣١ )دا, دەنووسێ : "پەیامبەر بۆ خۆی ئاسانکاری دەکرد بۆ جیابوونەوەی ئەم توێژە لە کۆمەڵگاداو تەنانەت لە ناوزڕاندنیشیدا, یاخود لە ناوهێنانی کەسێکدا کە ئەو ناو هێنانە ببێتە مایەی کەمبەهای، یان بێڕێزی مرۆڤ .... , پەیامبەر وتویەتی: کەس نەڵێ هەتیوەکەی من، ژێردەستەی من، بەڵکو با بڵێت: غولامی من، کەنیزەکی من". پاشان دەقەکە بە عەرەبی دەهێنێ .

دەڵێین:

ئەو دەقەی، کە مەریوان کردویەتییە بنەماو بۆچوونە سەقەتەکانی خۆی، ئاوەهایە: "لایقل احدكم اطعم ربك, وضيء ربك, وليقل: سيدي, مولاي, ولا يقل احدكم: عبدي, امتي, وليقل: فتاي وفتاتي وغلامي "[١٤٨].

واتە: کەس لە ئێوە نەڵێ: خواردن بدە بە خواکەت, ئاوی دەست نوێژ ببە بۆ خواکەت و دەستنوێژی پێبگرە، بەڵکو بابڵێ: گەورەم, سەردارم, وە کەس لە ئێوە نەڵێ: کۆیلەکەم، بەندەکەم, بەڵکو بابڵێ: کوڕەکەم, کچەکەم, منداڵەکەم.

ئەم فەرموودەیەیە:

١ –ڕێنمونی تێدایە بۆ ئاغاو خاوەن کۆیلەکانی ئەو کات, هەروەها کەسانی تریش, کە لە کاتی نان ئامادەکردن و خزمەتکردنذا بە ژێردەستەکان نەڵێن: "اطعمَ رَبَكَ...", چونکە ئەم وشەیە (رَب) مەبەست لێی تەواوێتی خوایەتی خوا دەگەیەنێت, چونکە تەنها خوایە کە خاوەنی هەموو شتێکە و هەموو شتێك لەژێر فەرمان و ویستی ئەودایە, نەك کەسانی تر.

٢ –هەروەها ئامۆژگاری تێدایە بۆ ئەوانەی, کە ژێر دەستەیان هەیە، بە چاوی سوك و ناوی سوك سەیر نەکرێن و بانگ نەکرێن,بەڵکو مامەڵە کردن لە گەڵیاندا دەبێت, وەك مامەڵەی کوڕو کچەکانیان وەها بێت, چونکە بە کار هێنانی ئەم وشانە, وا دەکات هەستی خۆ بەزلزانی لای خاوەن ژێردەستەکان, کەم بکاتەوە[١٤٩].

٣ – " هەتیوەکەی..". لەو بزرکاندنانەی مەریوانە، کە پێموایە لە سروشتیدا دەمێکە ڕەگی داکوتیوە!.

١٠٩ – لەلاپەڕە (٢٣٢ )دا, دەقێك لە (صحيح البخاری) دێنێ و بەم جۆرە دەنوسێ: "النبي (ﷺ) قال ثم المملوك الذي يحسن عبادة ربه ويؤدي الى سيده الذي له عليه من الحق و النصيحةو الطاعة له اجران". پاش واتا کردنی, دەنووسێت: "کەواتە ملکەچکردن لەلایەن کۆیلەوە بۆ خاوەندار وەك ئەوە وایە ملکەچی خوا بو بیت" .

دەڵێین:

١– بێڕێزی و شێواندنی دەقەکە لەلایەن مەریوانەوە، کە خۆی لەڕاستیدا دەقەکە ئاوەهایە: "عن النبي (ﷺ) قال للمملوك الذي يحسن عبادة ربه.....) تا کۆتایی فەرموودەکە [١٥٠].

کەواتە، "النبي..قالَ ثم..." . جگە لە شێواندنی دەقەکە, واتاکەشی لەنگ و عەیبدار کردووە.

٢ – کاتێ ئەوکۆیلەیە دەتوانێت بە فەرمانی خاوەنەکەی هەڵبستێت، کە خاوەنەکەشی چاکەکار بێت و فەرمانی خوا جێبەجێ بکات, دەنا فەرمانبەرداریی بۆ هیچ کەسێك نییە، ئەگەر سەرپێچی فەرمانی خوا بکات. "لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق".

٣ – پێغەمبەر (ﷺ) وەك فەرمان, فەرمان دەکات ئەوەی کەسێکی لەژێر دەستدا بوو, با لەو خواردنە بیداتێ، کە خۆی دەیخوات، لەو پۆشاك و جلانە لە بەر بکات، کە خۆی دەیپۆشێ و لەبەریدەکات, نەیان خەنە ژێرکارێکەوە، کە لە

---

[١٤٨] رواه البخاری (٢٥٥٢) ومسلم(٢٢٤٩) و ابوداود(٤٩٧٥).

[١٤٩] بڕوانە: زاد المعاد، ج٢، ص ٣٥٢, فتح الباری، ج٥, ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە(٢٥٥٢).

[١٥٠] صحيح البخاری, رقم(٢٥٥) كتاب العنق/ باب: كراهية التطاول على الرقيق .......

توانایاندا نییە، وە ئەگەر کاری واتان پێسپاردن، یارمەتییان بدەن و کۆمەکییان بکەن [١٥١].

١١٠–لە لاپەڕە (٢٣٢–٢٣٣)دا، یەکێکی تر لەزەقترین چەواشەکاریی ودەستکارییەکانی بۆ دەق، چەند بارە دەکاتەوەو دەنووسێ: "پیاوێکی دەوڵەمەند بەلای پە یامبەردا تێپەڕیوپرسیاری ئەو پیاوەی لە صەحابییەکان کرد، ئەوانیش وتیان: پیاوێکە گەر داوای ژن بکات دەیدەنێ شەفاعەت بکات، لێی قبولْ دەکرێ و قسە بکات گوێی لێدەگیرێ، پاش کەمێك پیاوێکی هەژار تێپەڕ بوو، پەیامبەر هەمان پرسیاری کرد، ئەوانیش وتیان: پیاوێکە گەر داوای ژن بکات نایدەنێ و گەر شەفاعەت و دوعا بکات لێی وەرناگیرێ، ئەگەر قسەبکات گوێی لێناگیرێ". پاشان تائێرە دەقە عەرەبییەکە لە پەراوێزەکەدا دەنوسێ.

دەڵێین:

مەریوان، لەو دەقەدا گەورەترین ستەمی مێژوویی کردووە، سەرەڕای ئەوەی داب و ڕەوشتی نووسەریی لە خۆیدا سڕیوەتەوە، چونکە ئەودەقە کۆتاییەکی هەیە، کە مەبەستی هەمووەدەقەکە ڕوون دەکاتەوە، بەلاّم ئەو هاتووە بە ئەنقەست ئەو بەشەی لێی قرتاندووە. ئەمەش دەقەکەیە بە عەرەبی: "مر رجل علی رسول الله(ﷺ) فقال: ما تقولون في هذا؟ قالوا: حري ان خطب ان ينكح وأن شفعُ ان يُشفَعَ وان قال ان يُستَمعَ، قال: ثم سكت، فمر رجل من فقراء المسلمين فقال: ما تقولون في هذا؟ قالوا: حري ان خطب ان لاينكح، وان شفع أن لايُشفع، وان قال ان لايَستمع، قال رسول (ﷺ) هذا خير من ملء الارض مثل هذا" [١٥٢].

واتە: "پیاوێك بەلای پێغەمبەردا (ﷺ) تێپەڕی، بەیارانی فەرموو: ئێوە لە بارەی ئەم پیاوەوە چی دەڵێن؟ وتیان: زۆر شیاو و گونجاوە، ئەگەر چووە داوای ئافرت و خوازبێنی بکات، لێی مارە دەکرێ، ئەگەر تکا بکات، تکای وەردەگیرێ، وەئەگەر قسە بکات، گوێی بۆ دەگیرێ، پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو، پاشان کابرایەك لە مسوڵمانە هەژارەکان تێپەڕی، فەرمووی: ئەی دەربارەی ئەمە چی دەڵێن؟ وتیان: جێی خۆیەتی، ئەگەر چووە خوازبێنی، لێی مارە نەکرێ و گەر تکای کرد، تکای وەرنەگیرێو گەر قسەش بکات، گوێی بۆ نەگیرێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم کابرا هەژارە بە ئەندازەی پڕاوپڕی زەوی لەو کابرا دەوڵەمەندە باشترو چاکترە".

کەواتە:

١– "هذا خير من ملء الارض مثل هذا". مەبەستی فەرموودەکەیە، بەلاّم مەریوان نەیهێناوە، چونکە دەستەکەی کەشف دەبوو، هەروەك چۆن کەشفمان کرد!.

٢–وشەی "دوعا" لە ڕاڤەکەی مەریوان تێنەگەیشتنی خۆیەتی، چونکە:

أ– فەرموودەکە ئەو وشەیەی تێدانییە.

ب– باسەکە باسی دنیایە، نەك باسی "پاڕانەوە" و دواڕۆژ.

١١١– لەلاپەڕە (٢٣٣)دا، دەنوسێ: "عن ابي هريرة (رضی‌الله عنه) و زيد بن خالد عن النبي (ﷺ) قال ثم اذا زنت الامة فاجلدوها ثم اذا زنت فاجلدوها ثم اذا زنت فاجلدوها في الثالثة او الرابعة بيعوها ولو بضفير..". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (صحيح البخاری) دەکات.

دەڵێین:

ئەوەی لە (صحيح البخاری)دایە، بەم جۆرەیە: "حدثنا مالك بن اسماعيل حدثنا سفيان عن الزهري حدثني عبيدالله سمعتَ أبا هريرة(رضی الله عنه) و زيد بن خالد عن النبي (ص) قال: (اذا زنت الامة فاجلدوها ثم اذا زنت فاجلدوها ثم اذا زنت فاجلدوها في الثالثة او الرابعة فبيعوها ولوبضفير)" [١٥٣].

کەواتە:

---

[١٥١] صحيح البخاري، (٢٥٤٥) باب قول النبی (ﷺ) العبيد اخوانكم فأطعموهم...

[١٥٢] رواه البخاری (٥٠٩١)و (٦٤٤٧).

[١٥٣] روه البخاری، (٢٥٥٥و٢٥٥٦).

١-"عن ابي هريرة...". جیاوازی زۆر زۆرە لەگەڵ "سمعتُ" وەك لە زاراوەی فەرموودەناسیدا زانراوە, چونکە "سمعت" بەهێزترە لە"عن" لەڕووی گەیاندنەوە, هەرچەندە باوەڕ ناکەم مەریوان سەر لەم جۆرە بابەتانە دەربکات!.

٢- "قال ثم اذا زنت". وشەی "ثم" تێچەن و زیادەی مەریوانە و واتاکەی تێکدەدات.

٣- "بيعوها"نییە، بەڵکو "فبيعوها"یە، چونکە گەر پیتی(فاء) لە سەر وشەکە نەبێت، کە بۆ (تعقيب)ە، ماناکە لەنگ دەردەچێ.

112- لە لاپەڕە (٢٤٣)دا, فەرمووودەیەك دەهێنێ و بەم جۆرە دەیکات بە کوردی: "ژن وەك پەراسوو وایە, ئەگەر ویستت ڕاستی بکەیتەوە, دەشکێ هەر بە خواری بیهێڵەرەوە، چونکە بەخواری لەزەتی لێدەبینی".

دەڵێین:

ئەمە دەقەکەیە: "المرأة كالضلع ان اقمتها كسرتها وان استمتعت بها استمتعت بها وفيها عوج".

ئافرەت، وەك پەراسوو وەهایە، گەر ویستت ڕێکی بکەیتەوە، ئەوا دەیشکێنی, ئەگەر ژیانیشی لەگەڵ بەریتە سەر دەبێت لەگەڵیا ژیان بەریتە سەر بەو ناڕێکییە.

١-زانایان لەسەر ئەم دەقە زۆر دەمێکە قسەیان کردووەو فەرموویانە: "مەبەست لەوەیە، کە ئافرەت، وەك سروشتی خۆی بەگشتی زمانییان باش ناگەڕێ، جا ئەگەر مێردەکەی بیەوێت ڕێکی بکاتەوە, ئەوا ناتوانێت، چونکە وەك پەراسوو، ئەگەر کەسێك بیەوێت ڕێکی بکاتەوە, دەشکێ, ئەو ئافرەتەش گەر زۆر لەگەڵی بدوێی، کار دەگاتە تەڵاقدان وجیا بوونەوە, بۆیە دەبێت پیاوان لێبوردەیی زیاتریان هەبێت لەگەڵیانداو لەگەڵ ئەو سروشتەیاندا هەڵبکەن"[١٥٤].

٢-هەتا پێشەوا (بوخاری) ئەم فەرموودەیەی لەژێر باسێکدا هێناوە, بەناونیشانی "هەڵکردن لەگەڵ ئافرەتدا (المداراة مع النساء)".

٣-وشەی "استمتاع". گشتی ترە, لێرەدا هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە، نەك تەنها "لەزەتی سێکسیی"، وەك لە چاوی مەریوانەوە دەردەکەوێ.

١١٣- گەر یەك جار, ئەم بەدواداچوونەی ئێمە کردوومانە لە سەر ئەم نووسینەی مەریوان, بخوێنیتەوە, دەگەیتە ئەو باوەڕەی، کە جارێکی تر هەر نوسراوێك ناوی "مەریوان هەڵەبجەیی" لە سەر بوو, بێ سێ و دوو, دەڵێی لەسەدا سەد ئەمە چاوبەست و بوختانە!.

- لەلاپەڕە (٢٣٦)دا, ئەم دەقەی نووسیوە: "عن ابن عباس قال طلاق الامة خمس بيعها طلاقها وعتقها طلاقها وهبتها طلاقها وبراءتها طلاقها وطلاق زوجها طلاقها". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (صحيح البخاري, كتاب النكاح) دەکات.

دەڵێین:

ئێستاو تاڕۆژی دوایش، ئەوە (صحيح البخاري) نەك هەر (كتاب النكاح), بەڵکو تەنانەت هەر هەموو(بوخاری)یش, با بزانێ شتی وای تێدا نییەو تێشیدا نابێت, ئەوەشی دەیەوێت ناڕاستی مەریوانی بۆ بسەلمێ, با تەماشای (صحيح البخاري ) بکات، با بزانین تاماوە چاوی بەو دەقە دەکەوێت، کە مەریوان هێناویەتی؟!.

بەپێچەوانەوە لە (صحيح البخاري)دا, سەر باسێك هەیە بەناوی "لايكون بيع الامة طلاقاً" واتە: فرۆشتنی کەنیزەك تەڵاقدان ناگەیەنێت!.

١١٤- لە لاپەڕە (٢٣٧)دا, زیاتر نەفامیی خۆی دەردەخات و چاوبەست لە خوێنەر دەکات، دەنوسێ: "خاوەندار دەیتوانی لەگەڵ کەنیزەکە کچۆڵەکانیشیدا ڕابوێرێ و ئەجریشیان نەداتێ, چونکە ئەجری کۆیلە بە هەموو شێوەیەکییەوە تەنها جل و بەرگی کۆنەوخواردنی ئاردوخورماو مەسکەنیەتی کە بۆ گەوریش نەدەشیا". پاشان لە

[١٥٤] بڕوانە: فتح الباري، ج٩, ڕاڤەی فەرموودە(٥١٨٦،٥١٨٥،٥١٨٤).

پەراوێزەدا دەنوسێ: "صحيح مسلم، باب: سنان المملوك مما يأكل والباسه ولا يكلفه ما يغلبه, عن ابي هريرة عن رسول الله (ﷺ) انه قال ثم للمملوك طعامه وكسوته ولايكلف من العمل الا مايطيق".

دەڵێین:

ئەوەی چاڵ بۆ کەسێك هەڵبکەنێ، خۆی بەملدا تێی دەکەوێت!. لێرەشدا مەریوان چاك قاچی خزیوە!:

١-"خاوەندار..., چونکە ئەجری کۆیلە ئاردو...". ئەی خوێنەران، لەگەڵ دەقەکەدا بەراووردی بکەن, بزانن قسەکەی مەریوان چی دەردەچێت؟ پێتان وانییە "سەقەتی" و "شێواندن و نەزانیی" تێدا دەخوێندرێتەوە.

٢-"سنان المملوك" لە مەریوان دەپرسم وشەی "سنان"چی دەگەیەنێت لێرەدا؟, بێگومان تا ئەو ماوە، واتاکەی نازانێ!, دەزانن بۆ؟ چونکە مەریوان، وەك "دارکۆکەرەوەی بەشەو"ی لێهاتووە, هەرچی پێش چاوکەوتووە, پڕی پێدا کردووە, بەبێ ئەوەی بزانێ دارە یان نا!.

پێشەوا (نەوەوی) لە نوسینی ئەم سەر باسەدا, ئەم ناونیشانە ڕاست دەکاتەوەو بەم جۆرە دەینوسێ: "باب: اطعام المملوك مما يأكل والباسه مما يلبس ولا يكلفه مايغلبه" [155].

٣ – فەرموودەکە ئاوەهایە "للمملوك طعامه وكسوته ولايكلف من العمل الا مايطيق" [156].

واتە: بەندە خواردن و پۆشاکی خۆی هەیە, وەلە کاروکردەوەشدا ئەوەندە داوای لێبکرێت کە لە توانایدایە.

٤ – لەوسەرباسەی (مەریوان) هێناوییەتی, چەندین فەرموودەی تێدایە، کە هەوڵەکانی مەریوان بە (با) دەدا, چونکە نەك سوکایەتی بە کۆیلە, بەڵکو فەرمانیش کراوە، خاوەن کۆیلەکان چی دەخۆن و چی دەپۆشن، ئەوانیش (کۆیلەکان) دەبێت هەر وابن.

پێغەمبەر (ﷺ) بە (أبو ذر)ی فەرموو: "ئەوانەی وان لەژێردەستتان براو کەسی خۆتانن, خوای گەورە ئەوانی خستۆتە ژێر دەستی ئێوەوە, کەواتە لەو خواردنانەیان بدەنێ، کە خۆتان دەیخۆن, ئەو پۆشاکەیان لەبەر بکەن، کە خۆتان دەیپۆشن, کارێکیشیان لێداوا مەکەن, کە لە توانایاندا نەبێت, ئەگەر داوای کارێکی واشتان لێکردن, یارمەتییان بدەن ", (هم اخوانكم جعلهم الله تحت ايديكم فاطعموهم مما تاكلون, والبسوهم مما تلبسون, ولا تكلفوهم مايغلبهم, فان كلفتموهم فأعيُنَوهم) [157].

کەواتە:

هەموو فێڵەکانی مەریوان ئەم جارەش هەڵوەشایەوە!.

١١٥ – لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە, مەریوان وا خۆی گێل دەکات، کە بایەخی منداڵێکی دە ساڵانەی ئەم وڵاتەش بۆ خۆی نا هێڵێتەوە, لە لاپەڕە (٢٣٧)دا, لەبارەی (عبدالله بن ئوبەی بن سلول)ەوە, دەڵێ: "عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کە صەحابە دەبێت.... ".

دەڵێین:

هەموولایەك دەزانن، کە (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) سەرکردەی دووڕووەکان بووە، ئیدی چۆن لە هاوەڵان و موسوڵمانان دەژمێردرێت؟!, چونکە پێناسەی "صحابة" بەو کەسە دەوترێت, کە هاوەڵێتی پێغەمبەری (ﷺ) کردبێت لە مسوڵمانان, ئەمە پیناسەی (بوخاری)یە, هەروەها قسەی (احمد)و جەماوەری فەرموودەناسەکانە.

مەرجی " لە موسوڵمانان" دەبێ لە پێناسەکەدا هەبێ، تا ئەوەی موسوڵمان نییە, بچێتە دەرەوە.

(ابن حجر )دەڵێ: پێویستە ئەم زیادەیەشی هەبێت. "وە لە سەر موسوڵمانییەتی مردبێت" [158].

---

[155] بڕوانە: شرح مسلم للنووی, کتاب الایمان/ باب اطعام المملوك... .

[156] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[157] هەمان سەرچاوەی پێشوو, ژمارە(٤٢٨٩, ٤٢٩١, ٤٢٩٠).

[158] بڕوانە: فتح الباری، ج٧, باب: فضائل اصحاب محمد (ﷺ).. .

١١٦- لە لاپەرە (٢٣٨)دا, ڕاڤەی ئایەتی (٣٣)ی سورەتی (النور) دەکات, پاشان دەنووسێ: "کەواتە کوڕەکەی ئوبەی ئەم کارەی بەپێی شەرع کردووە، چونکە زۆری لێنە کردون و ڕەزامەندی خۆیانی تێدا بووە". لە دواتر دەنوسێ: "دەتوانین بڵێین کە لەشفرۆشی کەنیزەك حەرام نەکراوە, چونکە لە دەقی ئایەتەکدا هاتووە کە (ئەگەر...)".

دەڵێین:

ئایەتەکە دەفەرموێت "ولاتکرهوا فتیاتکم علی البغاء ان اردن تحصناً لتبتغوا عرض الحیاة الدنیا ومن یکرهن فان الله من بعد اکراهن غفور رحیم" النور, ئایەتی/ ٣٣.

واتە: ئێوە زۆر لە کەنیزەکەکانتان مەکەن لە سەر کاری داوێن پیسی, گەر مەبەستیان داوێن پاکی بوو, تا شتێکی دنیایتان دەست بکەوێت, هەر کەسێك زۆریان لێبکات, ئەوا خوای گەورە لەو کەنیزەکانە خۆش دەبێ و بە سۆزو بەزەییە بەرامبەریان[١٥٩].

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە:

ئەم ئایەتە دەربارەی (عبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول), دابەزی, کاتێ دوو کەنیزەکی هەبوون بە ناوەکانی (معاذةو مُسَیّکة) کە زۆری لێدەکردن و لێی دەدان, بۆ ئەوەی بچن کاری داوێن پیسی بکەن ... ئەوانیش دەچنە لای پێغەمبەر(ﷺ)و شکات دەکەن. ئیتر ئەم ئایەتە دادەبەزێ[١٦٠].

"ان اردن تحصناً" واتە گەر مەبەستییان داوێن پاکی بوو، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت, گەر ویستی داوێن پاکییان نەبوو, وە گوێیان بە ڕەوشت نەدەدا، ئیتر ئەو کارەیان بۆ ڕەوا بێت, (وەك مەریوان بە سەقەتی لێکی داوەتەوە) بەڵکو ئەم جۆرە داڕشتنە زانایان پێی دەڵێن: "زۆرینە (تغلیب)" واتە عادەتەن ئەوەی ئەو کارە دەکات بە ویستی خۆی زۆر کەمە, گەر نا زۆربەیان ئەم کارەیان پێناخۆشە[١٦١].

لە (تفسیر الجلالین)دا, هاتووە: "ئەم مەبەستی پێناخۆش بوون و زۆر لێکردنە, هیچ واتایەکی نییە بۆ مەرج". (وهذه[١٦٢] الارادة محل الاکراه, فلا مفهوم للشرط).

جا بەڕێزان:

باوەڕ ناکەم, مەریوان و ئەوانەشی وەك ئەو بیر دەکەنەوە, بزانن "تەغلیب" چییە؟ ئاخر "مەریوان"ێك سێ ناوەندی تەواو نەکرد بێت, لە کوێ سەر لەم زانستانە دەر دەکات!, بڕواش ناکەم بزانێ "تەغلیب" لە چ جۆرە بابەتێکدا دەخوێندرێت!.

١١٧- لە هەمان لاپەڕەدا، پاش ئەو قسانەی سەرەوە, دەنووسێت: ڕاڤەکەی (البیضاوي)یش (سەبەب نزولی) ئەم ئایەتە دەگێڕێتەوە بۆ هەمان مەبەست. پاشان ئاماژە بە (تفسیرالبیضاوي) دەکات.

دەڵێین:

ئەگەر مەبەستی مەریوان لە (هەمان مەبەست) خودی کارەکەی (ئوبەی) بێت, قسەیەکی ئەوتۆمان لەسەری نییە, بەڵام گەر مەبەستی "ڕاڤە سەقەتەکەی" خۆیەتی, ئەوا (من و ئێوەو مەریوان و تفسیر البیضاوی) لە هەر شوێنێکی ئەو تەفسیرەدا "ڕاڤە سەقەتەکەی" مەریوان هەبوو, ئەوە مافی خۆتانە چی دەڵێن, مەریوان زۆرچاك دەزانێ، کە شتی وا لەو سەرچاوانەدا نییە, بەڵام خۆ پارەو بژێویی ژیان, هەروا بەگاڵتە پەیدا ناکرێت!.

١١٨- لەلاپەرە (٢٣٩)دا, دەنووسێ: "عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب لە سێبەری خەلافەتی باوکی دادپەروەردا ڕاهاتبوو بە قامچی لە کۆیلەکانی خۆی بدات". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بۆ (صحیح مسلم) دەکات.

دەڵێین:

---

[١٥٩] مختصر تفسیر الطبری، ج٢، ص ٩٨

[١٦٠] بڕوانە: گێڕانەوەکان لە تفسیر (ابن کثیر) ئایەتی ٣٣ النور.

[١٦١] بڕوانە: تفسیر (ابن کثیر) ئایەتی ٣٣ النور.

[١٦٢] تفسیر الجلالین, ئایەتی/٣٣ النور.

لە (صحیح مسلم)دا، ئەوەی مەریوان ئاماژەی پێدەكات بەم جۆرەیە: "عن زاذان ابي عمر قال: ثم اتيت بن عمر وقد اعتق مملوكاً قالَ: فاخذ من الارض عوداً اوشيئاً, فقال مافيه من الاجر ما سِوى هذا الا اني سمعت رسول الله (ﷺ) يقول من لطم مملوكه اوضر به فكفارته ان يعتقه".

واتە: زاذان، كە كونییەكەی (ابو عمر)ە, دەڵێ: پاشان هاتم بۆلای (عبدالله بن عمر) ئەوكاتە كۆیلەیەكی ئازاد كرد بوو, پاشان لەزەویەكە چیلكەدارێك، یان شتێكی هەڵگرت و وتی: عەبدوڵلا بەئەندازەی ئا ئەم شتە لەم ئازادكردنەدا پاداشتی نییە, بەڵام ئەوەندە هەیە كە لە پێغەمبەرم (ﷺ) بیستووە, دەیفەرموو: هەر كەسێ بدات لە دەموچاوی ژێر دەستەكەی, یان لێی بدات, ئەوا كەفارەتەكەی ئەوەیە، كە دەبێت ئەو ژێر دەستەیەی ئازادبكات.

جا بڕوانن:

١- "سێبەری خەلافەتی....", "راهاتبوو...". لە كوێی ئەو دەقەدا هەیە!.

٢- دەقەكە دەڵێ: "أعتق مملوكاً -كۆیلەیەكی ئازاد كردبوو", لە باسی ئازادكردنەكەدا (كۆیلەیەك) باس دەكات لەم دەقەدا, كەچی مەریوان دەنوسێ: "كۆیلەكانی".

٣- لە گێڕانەوەیەكی تردا, كە هەر لە (صحیح مسلم)دایە, لە (زاذان)ەوە ڕوونتر باس لە ئازاد كردنی ئەم كۆیلەیە دەكات, بەم جۆرە: "ان بن عمر دعا بغلام له فراى بظهره اثراً, فقال: له او جعتك؟ قال: لا, قال: فانت عتيق" [١٦٣].

واتە: (ابن عمر)خزمەتكارێكی خۆی بانگ دەكات, دەبینێ شوێنەواری لێدانێك بە پشتییەوەیەتی, عبدوڵلا پێی دەڵێ: من ئازارم داوی؟ ئەویش دەڵێ نەخێر, عەبدوڵلا دەڵێ: دەبڕۆ ئەوا تۆم ئازاد كردو تۆ ئازادیت.

ئەوەتا پرسیاری ئەو جێگە لێدانە دەكات، كە ئایا ئەو وای لێكردووە؟ كەچی پێی دەڵێت تۆ وات لێنە كردووم, ئیدی لێدانی كۆیلەكانی لە چ سوچێكدا بەر تارمایی چاوەكانی مەریوان كەوتووە!؟.

٤- لە دەقەكەدا بە دوورو نزیك باس لەوە ناكات، كە لە چ سەردەمێكدا ئەو كۆیلانەی ئازاد كردووە, كەچی مەریوان نوسیویەتی: "لەسێبەری خەلافەتی...".

٥- (عبدالله بن عمر) لە بارەی سۆزو میهرەبانی بەرامبەر ژێردەستەكانی ئەوەندە چاكەی هەیە، یەك كردارو رەفتاری كۆیلەكانی سەرنجی ڕابكێشایە, گورج ئازادی دەكرد, بۆیە وای لێهات بوو, هەموو كۆیلەكانی بەمەیانزانی بوو, دەچوون بۆ مزگەوت وایان نیشان دەدا, كە زۆریان حەز لە خواناسییە, ئەویش كە ئەمەی دەدی ئازادی دەكردن, تا ڕۆژێكیان پێیان وت: (ابن عمر) ئەم كۆیلانەت چاوبەست لە تۆ دەكەن, ئەویش دەڵێ: هەر كەسێك بە خوا چاوبەستمان لێبكات, لەبەر خواو بۆ خوا هەڵدەخەڵەتێین [١٦٤].

هەتا جارێكیان (١٠,٠٠٠) دە هەزار دینارياندا بە (ابن عمر)، كە (نافع)ی خزمەتكاری بفرۆشێت, عەبدوڵلا وتی: لەمە چاكترم دەست دەكەوێت, لەبەر خوا ئازادی كرد[١٦٥].

ئەو (نافع)ە, دەگێڕێتەوە, دەڵێ: "(ابن عمر) هەتا مرد, هەزار مرۆڤ، یان زیاتری ئازاد كرد" [١٦٦].

مەریوان، (عەبدوڵلای كوڕی عومەر) زۆر لەوە گەورەترە، كە تۆ بە نەزانی و چەواشەكارییەكانت, بتەوێت لە بایەخی كەم بكەیتەوە, ئەو بەڕاستی پیاوێكی زۆر گەورە و بەڕێز بووە, تۆ هێشتا زۆرت ماوە, تا بە تەواوی شارەزای ژیانی ئەو كەڵەپیاوە بیت!.

١١٩- لە لاپەڕە (٢٣٩)دا, شتێكی زۆر سەیر و سەمەرە لە مەریوان ڕوودەدات, بەڵام تا بڵێی جێگەی ئەوەیە, كە بوترێت ئاخر نەزانینی كەسێك بگاتە ئەو ئەندازەیەی ئاوەها یاری بە بیری خۆی بكات, ئەبێت چاوەڕوانی چی

---

[١٦٣] صحیح مسلم رقم(١٦٥٧).

[١٦٤] صفة الصفوة، م١، ج١، ص٢٢٠, ژیانی عبد الله بن عمر.

[١٦٥] رواه احمد فی الزهد، ص ٢٣٧ فقرة (١٠٥٠).

[١٦٦] صفة الصفوة، م١، ج١، ص ٢٢١, ابن الجوزی.

لێبکرێت!, بێگومان شتی سەیرو سەیرتر لە هەموو شتە سەیرەکان, باوەڕ ناکەن؟ دەفەرموون با پێکەوە ئەم گەشتەی تر بکەین:

دەنوسیٚ: "لەڕووداوێکی (ئەبو مەسعودی بەدریدا)/ دەگێڕنەوە بە قامچی لە غولامێکی خۆی دەدات, پەیامبەر هات و بانگی کرد یەکەمجار گوێی لێنە بوو, دوایی زانیویەتی پەیامبەرە, قامچییەکەی لە دەست کەوتۆتە خوارەوە لەبەر خاتری پەیامبەر ئازادی کردووە, کۆیلەکەش بە پەیامبەری ووتوە چەنێکە لێم دەدا, هاواری خوای لێدەکەم و بە خوا پەنای لێدەگرم کەچی هەر لێم دەدات بەلاٚم کە تۆ هاتی بەپەنای تۆ وازی لێهێنام". پاشان وەك سەرچاوە دەنوسیٚ: "صحیح مسلم، باب: البغوي المماليك وكفارة من لطم عبده ان بن عمر دعا بغلام له فراى بظهره اثرا فقال له او جعتك, قال لا، قال فانت عتيق، قال ثم اخذ شيئا من الارض فقال مالى فيه من الاجر مايزن هذا".

دەڵێین:

١ – من بە ئێوە دەڵێم: "لە ڕووداوێکی ئەبو مسعودی بەدری...تاد" لەگەڵ ئەو دەقەی کە مەریوان ئاماژەی پێکردووە, چەندەیان جیاوازیی هەیە؟.

٢ – ئەودەقە عەرەبییەی مەریوان ئاماژەی پێکردووە, ئێمە لەمەو پێش, لە وەلاٚمی ژمارە ١٧٨ بڕگەی (٣)دا, بەکوردی دەقەکەمان نووسیوە, کە باسەکە, باسی (ابن عمر )ە, نەك (ابو مسعودی البدری).

٣ –پاشان لە باسەکەی (ابو مسعود), کە لە (صحیح مسلم)دا, هاتووە, مەریوان تێچەنی خۆی خستۆتە نێو دەقەکە, چونکە ڕووداوەکەی (أبو مسعود) لە (صحیح مسلم) بەم جۆرەیە:

(ابو مسعود) دەڵیٚ: "كنت اضرب غلاماً لي بالسوط, فسمعت صوتاً من خلفي: اعلم ابا مسعود, فلم افهم الصوت من الغضب, قال: فلما دنا مني, اذ هو رسول الله (ص) فاذا هو يقول: اعلم ابا مسعود, اعلم ابا مسعود, قال فالقيت السوط من يدي فقال: اعلم ابا مسعود, ان الله اقدر عليك منك على هذا الغلام, قال: فقلت لا اضرب مملوكاً ابداً" [١٦٧].

واتە: من ژێردەستەیەکم هەبوو, بە قامچی لێم دەدا, لە ناکاو گوێم لە دەنگێك بوو لە دوامەوە، کە دەیوت: بزانە (ابومسعود), منیش لە بەر تووڕە بوونی خۆم, لە دەنگەکە تێنەگەیشتم, کاتێك لێم نزیك ببۆوە, زانیم پێغەمبەرە، دەیفەرموو: بزانە (ابو مسعود): بزانە (ابو مسعود), منیش قامچییەکەم لە دەستمدا فڕێدا, فەرمووی: بزانە (ابو مسعود) خوای گەورە زۆر بە توانا ترە بەسەر تۆدا لەوەی، کە تۆ زاڵی بە سەر ئەو ژێردەستەتدا منیش وتم: ئیتر هەتا هەتایە لە هیچ ژێردەستەیەك نادەم.

لە گێڕانەوەیەکی تردا, هاتووە, کاتیٚ (ابو مسعود) لە ژێردەستەکەی دەدا, ژێردەستەکە دەیوت: پەنا دەگرم بە خوا, (ابومەسعود)یش هەر لێی دەدا, پاشان وتی: پەنا دەگرم بە پێغەمبەری خوا, ئیتر وازی لێهێنا, پاشان پێغەمبەر بە (ابو مەسعود)ی فەرموو: خوا زۆر بە تواناترە بە سەر تۆدا، وەك لە تۆ بەسەر ئەو کەسەدا. ئیتر (ابو مەسعود) ژێردەستەکەی ئازاد کرد .

لە گێڕانەوەیەکی تردا: (ابومەسعود) دەڵیٚ: ئەوا لەبەر خوا ئازادم کرد[١٦٨].

(نەوەوی) لە سەر پەناگرتنی کۆیلە بە خواو پاشان بە پێغەمبەر, دەڵیٚ: زانایان وتویانە: "لەوانەیە لەیەکەم جاردا، کە کۆیلەکە پەنا بە خوا دەگرێت, (ابومسعود) لەبەر زۆر تووڕەیی, گوێی لێنە بوو بێت, هەروەك چۆن گوێی لە بانگەکەی پێغەمبەر نەبوو, یان کاتیٚ ژێردەستەکە پەنا بە پێغەمبەر دەگرێت، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر لەو جێگایە دەبێت, (ابومەسعود)یش بە ئاگادێتەوە"[١٦٩].

کەواتە:

---

[١٦٧] صحيح مسلم بشرح النذووى كتاب الايمان, باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده, رقم (٤٢٨٥).

[١٦٨] بڕوانە: صحيح مسلم بشرح النذووى، رقم (٤٢٨٥, ٤٢٨٤).

[١٦٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو كتاب الايمان, باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده.

أ– "لەبەر خاتری پەیامبەر ئازادی کردووە". تێچەنی مەریوانە, چونکە لە یەکێك لە گێڕانەوەکاندا دەڵێ: "ئەوا لە بەر خوا ئازادم کرد". وەك پێشتریش ئاماژەم پێکرد.

ب– "کۆیلەکەش بە پەیامبەری ووتوە ...". وەك لە گێڕانەوەکاندا دەبینرێت, شتی وای تێدا نییە, بەلاّم ئەگەر مەریوان خۆی لەو کاتەدا لەوێ بوو بێت!، ئەوەیان شتێکی ترە, بۆ نا، خۆ مەریوان گوێ بە ڕاستی و ناڕاستی نادات, قەیدی نییە، با ئەمەشیان بچێتە پاڵ شتە ناڕاست و بوختانەکانی ترییەوە!.

ج– پێغەمبەر دەسەلاّتی خوای گەورە, دەخاتەوە یادی (ابو مەسعود)، بۆیە یەکسەر ئەویش ئازادی دەکات و پەیمان دەدات هەتا هەتایە لە ژێردەستە نەدات.

باسێکی سەیر:

جارێکیان (ابوکعب)ی چیرۆکبێژ, لە چیرۆك خوێندنەوەکەیدا, باسی (یوسف) دەکات, لەوەدا کە دێتە سەر باسی (گورگ)ەکە, دەڵێ: ئەو گورگەی (یوسف)ی خوارد, ناوی ئەوەو ئەوە بوو, خەڵکەکە پێی دەڵێن: ئاخر خۆ گورگ, (یوسف)ی نەخوارد, ئەویش هیچ خۆی تێك نادات, دەڵێت: نا, ناوی ئەو گورگەی کە (یوسف)ی نە خوارد, ئەوەیە![170].

١٢٠– لە لاپەڕە (٢٤٩)دا, مەریوان دێت ئیسلام تاوانبار دەکات، کە کۆیلایەتی هێشتۆتەوەو بەرگریشی لێدەکات. پاشان بۆ ئەم چەواشەکاریی و بوختانەشی، ئایەتی (١٣٢)ی سورەتی (الزخرف) دەهێنێتەوە.

دەڵێین:

ئایەتی (١٣٢)ی سورەتی (الزخرف) دەفەرمووێ: ﴿ اهم يقسمون رحمة ربُك نحنُ قسمنا معيشتهم في الحياة الدنيا ورفعنا بعضهم فوق بعض ليتخذ بعضهم بعضاً سخرياً ورحمتَ ربُكَ خيرُ مما يجمعون﴾.

واتە: "ئایە ئەو بێباوەڕانە میهرەبانی پەروەردگارت بە نێو دروست کراوەکانیدا دابەش دەکەن, ئێمە خۆمان میهرەبانی و ڕێزی خۆمان دابەش دەکەین بەوەی، کە دەمانەوێت (کە پێغەمبەرایەتییە) وەك چۆن بژێویو ڕۆزیان لە دنیادا بەسەردا دابەش دەکەین، وە باوی هەندێکیانمان داوە بە سەر هەندێکیاندا, تا کار ئاسانیی و تەواوکاری یەکتر بکەن, وە میهرەبانیی پەروەردگارت باشترە بۆ ئەوان لەوەی کە دەستی دەخەن "[171].

ئەم ئایەتە, وەلاّمدانەوەیەکە بۆ هۆزی قوڕەیش، کە دەیانوت: دەبێت ئەم قورئانە بۆ یەکێك لەو دوو پیاوە گەورە بهاتایە، کە لەو دوو شارە گەورەیەدان (مەبەستییان لە مەککەو طائف بوو), چونکە لای ئەوان وابووە, دەبێت وەك چۆن (وليد بن مغيرة) و ( عروة بن مسعود) دەوڵەمەندن و یەکێکیان لە (مەککە) دەژیاو ئەویتریان لە (طائف), چونکە ئەم دووانە ماڵ و سامانییان هەیە, لای خەڵکی بە حوکمی پارەکەیان گەورەن، ئەگەر قورئانیش بێت, دەبێت بۆ یەکێك لەم دوو پیاوە گەورەیە بێت, نەك بۆ(محمد)ێك, کە دنیای نییە, وەك خوای گەورە قسەکەیان باس دەکات: "وقالوا لولا نزلَ هذا القرآن على رجلين من القريتين عظيم اهم يقسمو.....الخ" الزخرف/٣١–٣٢.

خوای گەورە, وەلاّمیدانەوە، کە پێغەمبەرایەتی بەخشین مافی ئەوان نییە, بەڵکو مافی خوایەو بە یەکێك مەبەستی بێت، پێیدەبەخشێ، یان دەیدات بە کەسێك, کە پاکترین دڵ و دەروونی هەبێت و لە بەڕێزترین بنەماڵە بێت[172].

کەواتە:

١ – ئایەتەکە باس لە بەخشینی پێغەمبەرایەتی دەکات .

٢– "ورفعنا بعضهم على بعض ليتخذ بعضهم بعضاً سخرياً". باس لەوەیە کە سرووشتی ژیان وا دەخوازێت, دەبێت لە پیشەو کاردا, خە ڵکی جیاواز بن، تا کارو باری ژیانی دنیا پێکەوە تەواو بکەن, وەك ئەوەی هەندێك پزیشك, هەندێ مامۆستا, هەندێك بازرگان, هەندێك جوتیارو....تاد.

---

[170] اخبار الحمقى و المغفلين, ص ١٦٠, ابن الجوزي.

[171] مختصر تفسير الطبري، ج٢، ص٣٢٩.

[172] بڕوانە: ابن كثير, ئایەتی ٣١–٣٢ الزخرف .

چونکە، ئەگەر ژیان، ئەمانەی تێدا نەبێت، مانای خۆی لە دەست دەدا, ئەمەش شتێکە, هەموو کەسێکی ژیر وەریدەگریّ, هەتا لەوپەڕی دەسەلاّتی بەناو یەکسانیخوازەکان, لە (یەکێتی سۆڤیەتی جاران) چینی جیاواز زۆر زۆر بووە!.

کەواتە، بە هیچ جۆرێك, ئەم ئایەتە باس لە هێشتنەوەو بەرگریی لە بنەمای کۆیلایەتی ناکات, وەك مەریوان بزڕکاندویەتی!.

١٢١- لە هەمان لاپەڕەدا، ئایەتی (٧١)ی سورەتی (النحل) باس دەکات, بە قسەی مەریوان، کە بەڵگەی مانەوەی کۆیلایەتی تێدایە.

دەڵێین:

خۆزگە، گەر بە درۆ و چاوبەستیش بوایە، وەك کاری هەمیشەیی خۆی, ئاماژەی بە سەرچاوەیەکی (تفسیر) یان سەرچاوەیەکی متمانەپێکراوی ئیسلامی بکردایە لە سەر ئەو بزڕکاندنەی, ئایەتەکەش بەم جۆرەیە کە دەفەرمووێت: ﴿ والله فضل بعضكم على بعض في الرزق فما الذين فضلوا برادي رزقهم على ماملكت ايمانهم فهم فيه سواء افبنعمة الله يجحدون﴾. واتە: خوای گەورە لە بژێویی و ڕۆزی دانا لە دنیادا, باوی هەندێکتانی داوە بە سەر هەندێکی تردا، دەسەلاّتدارەکان ئامادەنین کۆیلەو ژێردەستەکانی خۆیان, بکەن بە هاوبەش لە ماڵ و سامانەکانیاندا, دەی کە ڕازی نین ژێردەستەکانییان ببنە هاوبەش لە ماڵ و داراییەکەیاندا, چۆن ئەوان دێن بەندەکانم دەکەنە هاوبەش لە دەسەلاّت و تواناکانی مندا, ئایە ئەوان نکۆڵی لەو نازو نیعمەتانە دەکەن, کە خوا پێیداون بە هۆی ئەوەی کە هاوبەش بۆ خودا دادەنێن[١٧٣].

خوای گەورە, لەم ئایەتەدا, ئەوە ڕوون دەکاتەوە, کە موشریکەکان ڕازی نەبوون ژێردەستەکانیان, بکەنە هاوبەش لەو ماڵەی هەیان بوو, کەچی دەچوون هاوەڵ و هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار دەدا, ئەمە وەك سەرزەنشتێك وەهابوو لە خواوە بۆ هاوەڵ پەیداکەرەکان[١٧٤].

مەریوان، خۆی لەم ڕاستییە لاداوەو تەنها هاتووە ئایەتەکەی هێناوە, بە بیّ ئەوەی تەنها ڕاڤەیەکی سەر پێیانەشی بکات, جگە لەوەی تەنها ئەوەندەی لە سەر نوسیوە "خوا فەزڵی هەندێکتانی بەسەر هەندێکی دیکەدا داوە...". کەواتە، ئەوەی مەریوان ویستوویەتی واپیشان بدات، کە ئەم ئایەتەش بەڵگەیە بۆ "ڕاستێتی" چەواشەکارییەکانی, وا دەرنەچوو!.

١٢٢- لە لاپەڕە(٢٤١)دا, ئایەتی (٧٥)ی سورەتی (النحل) دەهێنیّو ڕاڤەیەکی زۆر سەقەتی دەکات, دەنووسیّ: "خوا نموونەی هێناوەتەوە لە نێوان دوو پیاودا، یەکێکیان کۆیلەیەو دەسەلاّتی بە سەر هیچ شتێکدا نییە، بەرامبەر بە گەورەیەکی، کە ڕزق و ڕۆزی زۆرمان پێداوەو بەهرەوەرمان کردووەو بە ئارەزووی خۆی بە نهێنی و بە ئاشکرا لێی دەبەخشێت و دادپەروەری دەکات, ئایا ئەم دوانە وەك یەکن؟؟".

دەڵێین:

ئەمە دەقی ئایەتەکەیە, کە دەفەرموێت: "ضرب الله عبداً مملوكاً لايقدر على شيء ومن رزقناه منا رزقاً حسناً فهو ينفق منه سراً وجهرا هل يستون الحمدلله بل اكثرهم لايعلمون" النحل/٧٥.

زانایان و شارەزا بەڕاڤەی قورئان, بەم جۆرە ڕاڤەی دەکەن:

"خوای گەورە نموونە دێنێتەوە بۆ گەورەیی خۆی و بۆ بتەکان، کە دەپەرستران, کە خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێکە, چۆن ویستی بێت, دەیبەخشێت بە بەندەکانی, بە نهێنی و بە ئاشکرا, بتەکانیش موڵکی ئەو کەسانەن, کە دەیانپەرستن، چونکە خاوەنەکانییان ئەوانییان دروست کردووە, بۆیە بێدەسەلاّتن و هیچیان پێناکرێت, دەیکەوایە

[١٧٣] مختصر تفسير الطبري، ج١، ص٤٥٨.

[١٧٤] بڕوانە: ابن كثير ئایەتی ٧١ النحل.

ئیتر چۆن ئەو بتانە دەکەنە هاوبەش لەگەڵ خوادا, کە جیاوازییەکی زۆر گەورە لە نێوانیاندا هەیە, چۆن دەبنە یەك؟".
ئەمە ڕاڤەیەی (مجاهد)و کەسانی ترە, هەروەها پێشەوا (ابن القیم)یش ئەم ڕاڤەیەی پێشیاوترە[175].

(ابن عباس)و (قتادة), دەڵێن: "ئەم ئایەتە نموونەیەکە, خوای گەورە دەیهێنێتەوە بۆ لێکچواندنی باوەڕدارو بێباوەڕ, کە بێباوەڕ, وەك ئەو کۆیلەیە وەهایە، کە توانای هیچی نییە، بیبەخشێ و گوێڕایەڵی خوا ناکات و کاری چاکە ئەنجام نادات، بەڵام باوەڕدار, کار دەکات بۆ گوێڕایەڵی خواو ماڵ و سامانی خەرج دەکات لە پێناو ڕەزامەندی خوادا, وەك چۆن کەسێك ئازاد بێت و خوا ماڵی بداتێ, لە نهێنیی‌و ئاشکرادا خەرجی دەکات, دەی چۆن کەسێك خاوەنی خۆی نەبێت و هیچی نەبێت, لەگەڵ کەسێك, کە ئازادە, وەك یەك نین, بە هەمان شێوەش باوەڕدارو بێباوەڕ, لای خوا, وەك یەك نین"[176].

(ابن القیم) دەڵێ: "بۆچوونی یەکەم، واتە ڕاڤەکەی (مجاهد) شیاوترە, چونکە ئەمیان زیاتر ئاشکراترە لە پووچەڵکردنەوەی هاوبەشدانان بۆ خواو ڕوونترە لەلای قسە لەگەڵکراوەکە...."[177].

سوپاس بۆ خوا, کە بەڵگەو نیشانەکانی ڕوونن, بەڵام زۆرێك لەو بێباوەڕانە ئەمە نازانن و نایبینن!.

ئەم جۆرە داڕشتنە لە جۆری (قیاس العکس)ە، کە بریتییە لە نەفی حوکم لە بەر نەبوونی پێویستیەکانی[178]

من, سەد لە سەد، باوەڕم وایە مەریوان نەی وێراوە بچێت بە لای ئەو کتێبانەی، کە ڕاڤەی ئەم ئایەتەیان کردووە, چونکە:

ا– مەبەستەکەی ئەو لە دوورو نزیك بەلایدا ناچێت.

ب– مەریوان, سەلیقەی زانستی عەرەبی لەم جۆرە بابەتانەدا زۆر لاوازە، وەك ئەوە وایە (گوێزی هەورامانی) بۆ بدەیت بە یەکدا!, ئاخر مەریوان چوزانێت "قیاس" چەند جۆری هەیە, "قیاس" لە چەند زانستی عەرەبیدا بە کاردێت, پێناسە جیاوازەکانییان چییە؟.

ج– ئێستاشی لەگەڵدا بێت, مەریوان, نازانێت لەڕووی عەرەبییەوە "عبداً", "مملوکاً" و "من", جێگەی ئیعرابییان چییە لەو ئایەتەداو واتاکەیان بکات بە کوردی!.

کەواتە:

"خوا نمونەی هێناوەتەوە لە نێوان دوو پیاو...". ئەمە بەس لە قسەو ڕاڤەی کەسی ژیر ناچێت, من لێرەوە دەڵێم: تەفسیرو ڕاڤەی زۆر هەن لە وڵاتی خۆماندا, هیچی بە لای مەبەستە چەواشەکارییەکانی مەریواندا ناچێت, گەر نا بۆ ناوی یەك سەرچاوەی زانستی نەهێناوە.

١٢٣– لە لاپەڕە (٢٤٢)دا, لە هەمان سورەت, ئایەتی (٧٦) دەکات بە کوردی ودەیکاتە بەڵگە بۆ ئەو قسە نادروستەی خۆی، کە گوایە ئیسلام پشتگیریی لە مانەوەی کۆیلایەتی دەکات.

دەڵێین:

دەقی ئایەتەکە, دەفەرموێت: ﴿ وضرب الله مثلاً رجلین أحدهما ابکم لایقدر علی شیء وهو کل علی مولاه اینما یوجهه لا یأت بخیر هل یستوی هو ومن یامر بالعدل وهو علی صراط مستقیم﴾ النحل/٧٦.

واتە: ئەی خەڵکینە, خوا, نمونەی دوو پیاوتان بۆ دەهێنێتەوە، یەکێکیان کەڕ و لاڵە, توانای هیچی نییەو بۆتە بارگرانی بە سەر سەرپەرشتکارەکەیەوەو بۆ هەر جێگایەکی بنێرێت سەرکەوتوو نابێت لە هەوڵدانەکەیدا, ئایە ئەمە

---

[175] بروانە: التفسیر القیم، ص ٣٣٨–٣٣٩, وابن کثیر ئایەتی (٧٥)ی النحل.
[176] مختصر: تفسیر الطبری، ج١، ص ٤٥٩, ابن کثیر ئایەتی ٧٥ النحل.
[177] التفسیر القیم, ص٣٣٩.
[178] التفسیر القیم, ص٣٣٨.

یەکسانە لەگەڵ ئەو کەسەی فەرمان بە دادپەروەریی دەکات, لە کردارو گوتاریدا و لە سەر ڕێگەیەکی ڕاستە؟ ئەمەش تەنها بۆ ڕوونکردنەوەی توانستە، کە ئەو نموونەیەی هێناوەتەوە.

ئەم ئایەتەش نموونەیەکە بۆ دەسەلاّتی خواو بێدەسەلاّتی بتەکان, خوای گەورە, خەڵکی لەوە ئاگادار دەکاتەوە، کە تەنها خوا دەسەلاّتی هەیە لە سوودو قازانج، نەك ئەو بتانەی نە دەبیستن، نە دەشتووانن قسە بکەن[179].

کەواتە:

ئەم ئایەتەش, باس لەو گومانە ڕەشەی, کە مەریوان هەوڵیداوە دروستی بکات بە هیچ جۆرێك ناچێت بە لایدا!.

١٢٤– لە لاپەڕە (٣٤٢)دا, دەڵێ: "خودی پە یامبەر جۆرێك لە خەساندنی پەیڕەو کردووە، ڕۆژووگرتن بەشێك بووە لە خەساندن". پاشان ئەم دەقە دەنووسێت: " قال لنا رسول الله ثم یا معشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج, فانە اغض للبصر واحصن للفرج, ومن لم یستطع فعلیە بالصوم فانە لە وجاء ".

دەڵێین:

دەقەکە ئەمەیە (عبدالله بن مسعود) دەڵێت: "پێغەمبەر پێی فەرمووین: (ئەی دەستە وکۆمەڵەی گەنج ولاوان هەر کەسێك لە ئێوە توانای خەرجی و دابینکردنی ژن خواستنی هەیە, باژن بهێنیت, چونکە ئەمە چاو زیاتر دەپارێزێت و داوێن پاکترو مەحکەمتر دەکات, ئەوەشی توانای نییە, با بە ڕۆژوو بێت, چونکە بە ڕاستی ڕۆژوو, شەهوەت و ئارەزوو دەبڕێ و نایهێڵێت"[180].

(ابن حجر) لە "فتح الباري"دا, لە ڕاڤەی وشەی "وجاء"دا, دەڵێ: "ڕاڤەی وشەی (وجاء) بە خەساندن, جێگەی سەرنج و تێڕامانە، چونکە خەساندن, دەرهێنانی هەردوو گونە، وە دابڕینی (وجاء) بە سەر ڕۆژدا لە بابەتی (مجاز المشابهة)یە" [181].

کەواتە:

"خودی پەیامبەر .....". لە تێگەیشتنە سەقەتەکانی مەریوانە، دەنا بابەتی ڕۆژوو, تەنها ڕێنمونییەو جێبەجێ کردنی ئەو شتەیە, کە زیاتر بەرژەوەندی گەنج دەپارێزێ.

وشەی "وجاء" بە هیچ جۆرێك "خەساندن" ناگرێتەوە[182].

١٢٥– لە لاپەڕە (٢٤٢)دا, دەنوسێ: "پیاوێك هاتە لای پەیامبەر و وتی: ژنەکەم دەست بە ڕووی هیچ کەسێکەوە نانێت (واتە هەر کەسێ هات سواری بوو) پەیامبەر پێی دەڵێ: لە خۆتی دوور خەرەوە (واتە: تەلاّقی بدە) پیاوەکە دەڵێ: خۆشم دەوێ و دەترسم دوایی بیری بکەم، پەیامبەر پێی دەڵێ: کەواتە بیحەوێنەرەوەو تێری بکە (واتە زۆر لەگەڵی ڕابوێرە تا تێر ببێ و لەگەڵ خەڵکی نەیکات". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە دەکات بە (سنن ابي داود)٢/٢٢٠.

دەڵێین:

خەڵکینە، زیادەڕەوی ناکەم, گەر بڵێم: مەریوان بە ئەندازەی گەردیلەیەك زانستی ساغ و دروستی پێ نییە، چەواشەکارییەکانی زۆر بە ڕوونیی سروشتی ئەو کەسە دەردەخەن، ئاخر چەواشەکارییش بەو جۆرە؟!.

دەبڕوانن:

١– ئەوەی کە مەریوان وەك سەرچاوەی ئەو ڕووداوە نوسیویەتی: (سنن ابی داود ٢/٢٢٠) باوەڕ بکەن شتی وا, گەر لە هیچ کون و کەلەبەرێکی (سنن ابی داود)دا هەبوو، پەیمان بێت بڵێین مەریوان دەزانێ شت بنوسێ، بەلاّم بەداخەوە ناتوانین وا بڵێین!، چونکە لە (سنن ابی داود)دا؟, شتی وەهای هەر تێدا نییە, کەواتە ئێوە چی بە مەریوان دەڵێن؟!.

---

[179] بڕوانە: ابن کثیر, تفسیر الجلالین, مختصر تفسیر الطبری, ج١, ص٤٦٠, تفسیر القیم, ص ٣٣٩–٣٤٠.

[180] بڕوانە: البخاری (٥٠٦٥, ٥٠٦٦) ومسلم ( ١٤٠٠).

[181] فتح الباری, ج٩, کتاب النکاح, ڕاڤەی فەرموودەی (٥٠٦٠).

[182] بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، مختار الصحاح, مادة (وجاء).

٢- ئەوەی مەریوان نوسیویەتی بەو جۆرە نییە، بەڵکو ئەمە دەقە عەرەبییەکەیەتی، کە دەفەرمووێ لە (ابن عباس)ەوە, دەڵێ: "جاء رجل الى رسول الله, فقال ان عندي امرأة وهي من أحب الناس الي، وهي لاتمنع يد لامس، قال (طلقها), قال: لا أصبر عنها، قال: استمعت بها"[١٨٣].

واتە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا, پێی وت: من خێزانێکم هەیە، کە لە هەموو کەس خۆشەویسترە بەلامەوە، ئەم ئافرەتە دەستی ناگێڕێتەوە لە خۆی، واتە هەر کەسێ دەستی بۆ بەرێت, ئەو مەنعی ناکات، فەرمووی تەڵاقی بدە، کابراکە وتی: ئارام ناگرم, گەر لێم دوور کەوێتەوە، فەرمووی: دەخۆت لەگەڵیدا بە.

دەستەواژەی "لا تمنع يد لامس". هەندێ وتوویانە: واتە هەر کەسێ دەستی لێبدات, چێژ لەو دەست لێدانە وەردەگرێت و دەستی ناگێڕێتەوە، مەبەستی پیاوەکە کاری زینا نەبووە، چونکە گەر مەبەستی ئەوە بووایە, دەبووە: بوختان (قذف).

هەندێکی تر دەڵێن: نزیکترین بۆچوون ئەوەیە، کە پیاوەکەی زانیویەتی, ئەگەر کەسێ مەبەستی کارێکی خراپە بێت لەگەڵیدا, ئەو ئافرەتە مانع نابێ لە نەکردنی، نەك مەبەستی ئەوە بووبێ، کە کارەکەی لێی ڕوودابێت، بەڵکو بە پێی هەندێ بەڵگە ئەو شتەی بۆ دەرکەووتوە.

پێشەوا (ئەحمەد) دەڵێ: ناکرێ پێغەمبەر فەرمان بکات ئەو ئافرەتە لای خۆی بهێڵێتەوە، ئەویش کاری خراپە بکات.

"استمتع بها" واتە بە پێی پێویست خۆت لەگەڵیدا بمێنەرەوە [١٨٤].

کەواتە:

"هەر کەس هات و ....."، "کەوا بیحەوێنەرەوە ....، تاد". هەمووی قسەی نێو گیرفانی دووراوەی مەریوان خۆیەتی !.

١٢٦- لە لاپەڕە (٢٤٣)دا, قسەی هاوەڵێك دەگێڕێتەوە، کە ناوی (ابن جبير بن النعمان)ە، دەنوسێ: "لەگەڵ پەیامبەردا چووین بۆ غەزا لە کاتی پشووی ڕێگەدا چەند ژنێکم بینی، لە خۆشیاندا چووم لە ناویاندا دانیشتم, هیچی وای نەما بوو ڕەحەت ببم، پەیامبەر هات و وتی: ئەوە چی دەکەیت؟ منیش وتم: حوشترەکەم لێ ونبووە بە شوێنیدا دەگەڕێم". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (اسد الغابة)ی (ابن اثير) دەکات.

دەڵێین:

ئەوەی لە کتێبی (اسد الغابة)دایە، بەم جۆرەیە: "(ابن جبير) دەڵێ: خرجت مع النبي في غزوة، فخرجت من خبائي، فاذا انا بنسوة حوالي، فرجعت الى خبائي، فلبست حلة لي، ثم اتيتهُنَ، فجلَستُ اليهن اتحدث معَهُنَ, فجاء النبي فقال: يا جبير ما يجلسَك هاهنا ؟ قُلتُ: يارسولُ الله بعيرُ لي شرد" [١٨٥].

واتە: لەگەڵ پێغەمبەردا چوومە دەرەوە بۆ غەزایەك, کە لە خێمەکەم هاتمە دەرەوە, بینیم چەند ئافرەتێك لەو دەوروبەرەی مندان، گەڕامەوە بۆ ناو خێمەکەم و پۆشاکێکم هەبوو, لەبەرم کردو پۆشیم، پاشان چووم بۆ لایان, لە لایان دانیشتم, قسەم لەگەڵدا دەکردن، ئەوە بوو, پێغەمبەر هات و فەرمووی: هۆکاری دانیشتنی تۆ لێرە چییە ؟ منیش وتم: ئەی پێغەمبەر وشترێکم بەلەسە بووەو ڕۆیشتووە.

کەواتە:

١- "هیچی وای نەمابوو ڕەحەت ببم... ". لە کوێدا باسی هاتووە؟!.

٢- خۆ ئەوە دەقە عەرەبییەکەو نوسینەکەی مەریوان, خۆتان دادوەر بن.

١٢٧- لە لاپەڕە(٢٤٣)دا, دەنووسێ: "(حمنة بن جحش) وەك خۆی دەڵێت: ئێمە لە مانگانەی خۆمان (عادة الشهرية)دا بووین، بەڵام مێردەکانمان دەهاتنە لامان". پاشان ئاماژە بە (سنن ابو داود) دەدات.

---

[١٨٣] رواه النسائي في السنن الكبرى, ج٣, ص٢٧٠, رقم ٥٣٤٠.

[١٨٤] بڕوانە: سنن النسائي، م٣، ج٦، ص٦٧, بشرح السيوطي وحاشية السندي.

[١٨٥] اسد الغابة، ج١، ص٢٧٢، باب/ الجيم مع الباء .

دەڵێین:

بەڕێزان, لە (سنن ابی داود)دا، باوەڕ بکەن شتی وای هەر تێدا نییە، خۆ ئەمە شتێك نییە زۆر گران بێت، کێ (سنن ابی داود)ی هەبێت، دەتوانێت ئەم ڕاستییە ئاشکرا بکات، ئاخر ئەم چەواشەکارییانە بۆ دەبێت هێندە بەم جۆرە زەقییە بکرێت ؟!!

١٢٨ – لە لاپەڕە (٢٤٦)دا, تۆمەتی ئەوە دەکات، کە هاوەڵان, ئەوانەی لە غەزا بوون, بە شەو هەڵیان کوتاوەتە سەر خێزانی ئەو کەسانەی, کە چوونەتە غەزا...". پاشان دەنووسێت: "بەڵام بە هۆی فەرمووودەکانی پەیامبەرەوە وا دەردەکەوێ، کە دیاردەیەکی بەربڵاوبووە و تەشەنەی سەندووە، پەیامبەر زیاتر لە جارێك دەخالەتی تێدا کردووە". پاشان ئەو فەرموودەیە دەهێنێتەوە, کە بە دەق دەفەرمووێت "اذا طال احدُکم الغیبة فلا یطرقُ اهله لیلا".

دەڵێین:

١ – "دیاردەیەکی بەر بڵاو بووە .....". ئەگەر وا بوایە مەریوان پێش هەموو کەس, سەرچاوەو بەڵگەی بۆ ئەم قسەیەی دەنووسی!.

٢ – ئەو فەرمودەیەشی, کە نووسیویەتی بۆنەو هۆکاری خۆی هەیە، بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی (مەریوان)ەوە, چونکە:

وەك (جابر) دەڵێ: "پێغەمبەر پێیناخۆش بوو پیاو لە شەودا و لە ناکاو خۆی بکات بەماڵەوە". (کان النبي یکره ان یاتي الرجل اهله طروقا) [186].

هۆکاری ئەم پێناخۆش بوونە, لەوەوە سەرچاوەی گرت، کە "جارێکیان (عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە) شەوێك دەچێتەوە ماڵەوە، خێزانەکەشی ئافرەتێکی لادەبێت, قژ بۆ ژنەکەی شانە دەکات, عەبدوڵڵا وادەزانێ ئەو کەسە پیاوە، بۆیە بە شمشێرەکەی ئاماژەی بۆ دەکات, (وەك ئەوەی بیەوێ لێی بدات)، ئەم باسە, کە بۆ پێغەمبەر باس دەکرێ, ئەویش ئەو ڕێنمونییە دەر دەکات" [187].

لە هەندێك گێڕانەوەی تردا، ئاماژە بەوە دراوە, گەر شەو لە سەفەر گەڕانەوە، خۆتان مەکەن بە ماڵدا، ئەمەش بۆ ئەوەی, تا خێزانەکانییان پێش ئەوە, خۆیانییان بۆ ئامادە بکەن, ڕازاوەو قەشەنگتر دیاربن لە بەر چاوی هاوسەرەکانیاندا. [188]

١٢٩ – لە لاپەڕە (٢٤٧)دا، شتێك کە زۆر خۆش و سەیریشە ئەوەیە, کە مەریوان نوسیویەتی: "هەروەها بوخاری باسی ئەوە دەکات کە هەڵکوتانە سەر بەردەوام بووە، بۆیە لە فەرموودەیەکی دیکەدا پەیامبەر دەڵێ: هەر کەسێك بچێتە جێگەی ژنی یەکێك لەو کۆچەرییانە، وەك مارێك وەهایە لە ڕۆژی قیامەتدا لە زنجیرو پەتەکانی ملی ئاڵابن". پاشان وەك ئاماژە بە سەرچاوە دەنوسێت: "هەمان سەرچاوەو لاپەڕە".

دەڵێین:

١ - مەبەستی "هەمان سەرچاوەو لاپەڕە". (صحیح البخاری، باب: لا یطرق اهله لیلا اذا طال الغیبة)یە، چونکە لە پێشەوە ئەو سەرچاوەیەی نوسیووە.

٢ – تا ڕۆژی دوایی, ئەوە کتێبی (صحیح البخاری) و هەموو لایەك، گەر شتی وای تێدا بێت، خۆزگە کەسێك ئەو مارەی, کە مەریوان باسی دەکات, بدۆزیایەتەوە، ئەو کات دەمانوت: مەریوان لە مەیاندا ڕاستی دیوە، بەڵام بە داخەوە, کە ئەمەش وەك شتەکانی تری بوونی نییە!.

١٣٠ – لە لاپەڕە (٢٤٧)دا, دەنوسێ: "لە ڕاڤەکەی (القرطبی)یشدا نوسراوە: (فاطمة بن قیس) کاتێك کە مێردەکەی تەڵاقی دەدا، زۆر لەوە دەترسێ، بە شەو هەڵبکوتنە سەری، هەر بۆیە چۆتە لای پەیامبەرو پێی دەڵێ: ئەی پەیامبەر

---

[186] رواه البخاري, رقم (٥٢٤٣) کتاب النکاح.

[187] رواه ابو عوانة فی صحیحه . هەروەها بڕوانە: فتح الباری، ج٩، ڕاڤەی فەرموودەی ژمارەی (٥٢٤٣).

[188] بۆ زیاتر ئاشنا بوون, بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

زۆر دەترسم شەو هەڵبکوتنە سەرم، ئەویش فەرمانی پێکرد کە ماڵەکەی لەو شوێنە بگوێزێتەوە ". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (تفسیر القرطبی) دەکات.

دەڵێین:

١- ئەم بەسەرهاتە لە (بوخاری و موسلیم)یشدا, باسی هاتووە، وەك (عائیشە)دەڵێت: (فاطمة) ماڵەکەی لە جێگەیەکی چۆڵ بووە، هاودەمێك لێوەی نزیك نەبوو، بۆیە ترساوە لەوەی، کە هەڵبکووتنە سەر ماڵەکەی، بۆیە پێغەمبەر مۆڵەتیدا لەوێ لابچێت.

٢-زانایان ئەم باسەیان لەو بابەتەدا باس کردووە، گەر ئافرەتێك تەڵاقدرا بوو، بۆی هەیە لەو جێگەیەی خۆی دەربچێت، ئەگەر پێویستییەك لە ئارادا هەبوو، یان ترسا لەوەی، کە ماڵەکەی لە بەر چۆڵی جێگەی متمانە نییە، وەك (قورتوبی) ئاماژە بەم باسە دەکات [١٨٩].

کەواتە:

أ- نەك ئەو کات، بەڵکو ئێستاش و لە پێشکەوتووترین وڵاتی ئەم دونیایەدا، چ ئافرەتێك دەتوانێت لە خۆی ئەمین بێت، کە لە جێگەیەکی چۆڵدا ژیان بەرێتە سەر، ئەوە لەم چاخەداو لە وڵاتێکی زلهێزو پێشکەوتووی وەك ئەمەریکا بە ئاشکرا خراپە بەرامبەر ئافرەت دەکرێت، دەی گەر لە جێگەیەکی دوورە دەست بێت, دەبێت چۆن بێت؟.

ب- مەریوان زۆر چاك زانیویەتی ئەم بەهانە شەرعی و مەنتیقییە, هەتا لە (تفسیر القرطبی)یشدا نوسراوە، کە(فاطمة) ماڵەکەی دوور بووە لە ئاوەدانی، بەڵام خۆی لێ هەڵە کردووە, سەرباری ئەوەی کە لە (صحیح البخاری)یشدا بە ڕاشکاویی ئەمە لە سەر زاری (عائیشە)ەوە ڕوونکراوەتەوە. [١٩٠]

١٣١- لە لاپەڕە (٢٤٩)دا, لە باسی مژینی مەمکدا, دەنوسێت: "صەحابەکان ئەگەر چی ڕیشو سمێڵیشیان هەبووە، بەڵام بە حیلەی شەرعی مەمکی ژنیان مژیووە، ئەمەش تەنها لە سەردەمی پەیامبەردا بە زۆری ڕوویداوەو لە دوای ئەو بەرەو نەمان چووە". پاشان باسەکەی (سهلة بنت سهیل) بە بەڵگە دەهێنێتەوە.

دەڵێین:

١- "صەحابەکان ئەگەر چی ....." ، "لە سەردەمی پەیامبەردا بە زۆری ڕوویداوە... "، ئەمانە هەمووی چەواشەکاریی و خۆڵکردنە چاوی خەڵکی سادەیە، چونکە بە پێی هەموو سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان:

ا- تەنها یەك کەس مەمکی ژنێکی مژیوە، ئەویش بۆ مەبەستێکی شەرعیی و دیار، کە پاشان باسی دەکەین.

ب- گەر مەریوان ڕاست دەکات لەوەی، کە دەڵێت: "بەزۆری" ئەی بۆ بە تەنها بە سەرهاتەکەی (سهلة)ی هێناوە، گەر "بەزۆری" ڕوویدا بێت, خۆ دەبێت هیچ نەبێت (چوار, پێنج) ڕووداوی هاوشێوەی ڕووداوەکەی (سهلة) ڕوویدا بێت!.

ج- ئەو ڕووداوەی (سهلة) هیچ پەیوەندی بە چێژی سێکسییەوە نییە، وەك دواتر ئاماژەی پێدەکەین.

٢- ڕووداوەکە وەك لە (صحیح مسلم)داو گەلێك جێگەی تردا هاتووە، ئەوەیە، کە ژنێك بە ناوی (سهلة بنت سهیل) بە فەرمانی پێغەمبەر شیر دەدات بە کەسێك بە ناوی (سالم)ەوە، چونکە زۆر زۆر هاموشۆی دەکردن و تێکەڵاویان بووە, ئەم ئافرەتەش وای بینیوە، کە مێردەکەی پێیناخۆش بێت، ئەم (سالم)ە بێتە لایان، بۆیە ئافرەتەکە بۆ ڕێگە چارە دەچێتە لای پێغەمبەرو ئەویش ئەو ڕێنموونییەی دەکات، ئیتر ئافرەتەکەش وا دەکات. پاشان ئافرەتەکە دەڵێت: ئەو پێناخۆش بوونەی جارانم بە دەم و چاوی مێردەکەمەوە نەدەبینی. [١٩١]

[١٨٩] بروانە: فتح الباری شرح صحیح البخاری, ج٩, ڕاقەی فەرموودەکانی (٥٣٢٦،٥٣٢٥)، القرطبی, ج١٨, ص١٥٥.

[١٩٠] بروانە: هەردوو سەرچاوەکەی پێشووتر.

[١٩١] صحیح مسلم, باب: رضاعة الکبیر، رقم (١٤٥٣)، سنن النسائی رقم (٣٣٢٢،١٣١٦).

٣ – ئەم (سالم)ە، هەر لە منداڵییەوە لە لای (سهلة)و (ابو حذیفة)ی مێردی بووەو ئەوان کردبوییان بە منداڵی خۆیان و بەخێویان دەکرد، چونکە ئەمە کارێکی باو بوو، گەر کەسێك منداڵێکی هەڵبگرتایەتەوەو بیکردایە بە منداڵی خۆی، ئیتر بە منداڵی خۆی تەماشا دەکرا, ئەوە بوو پاش هاتنە خوارەوەی ئایەتی (٥)ی سورەتی (الاحزاب) ئەو باوە هەڵوەشێندرایەوە، جا (سهلة) دەچێت بۆ لای پێغەمبەر, پێی دەڵێ: کە (سالم) وەك منداڵێکی خۆمان سەیری دەیکەن و لەگەڵماندا لە یەك ماڵدا دەژی, زۆر ڕێزم لێدەگرێت و خۆشت دەزانی, کە خوا لەم بارەیەوە چی دابەزاندووە، کەوایە تۆ چیم پێدەڵێی, پێغەمبەریش ڕێنموونی دەکات, کە پێنج جار شیری بداتێ، ئەویش وا دەکات.[192]

٤ – ئەم باسە وانییە، کە مەریوان وای بۆچووە, کە چێژ وەرگرتنی سێکسیی بێت، بەڵکو ئەمە بابەتێکی (فیقهی)یەو لە مێژە وەك تەواوی بابەتە (فیقهی)یەکانی تر, زانایان قسەیان لەسەر کردووە، ئایا ئەگەر کەسێك بە گەورەیی شیری ئافرەتێك بخوات, دەبێتە منداڵی .…) یان نا؟ ئەمە لەو لایەنەوەیە، نەك شتی تر.[193]

کەواتە:

هەرچی مەریوان ویستویەتی لە سەر ئەو ڕووداوەی (سهلة) بیهۆنێتەوە، هەمووی هەڵوەشاوەیەوەو بۆچوونەکانی نەشیاوە.

١٣٢ – لە لاپەڕە (٢٥٠)دا, دەقێکی هێناوە, باوەڕ بکەن لە دوورو نزیك پەیوەندی بە باسی "مژینی مەمك"ەوە نییە، دەقەکەش ئەمەیە: "ابن عمر دەڵێ: كنا نتقى الكلام والانبساط الى نسائنا على عهد النبي هيبة ان ينزل فينا شيء فلما توفى النبي تكلمنا و انبسطنا".

دەڵێین:

ئەم دەقە لە (صحیح البخاری)دایە، بەڵام مەریوان، چونکە زانیویەتی ئەمە پەیوەندی بە باسەکەوە نییە، بەبێئەوەی بیکات بە کوردی بۆ چەواشەکردنی خوێنەر وازی لێهێناوە.

واتاکەشی ئەمەیە: "ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا خۆمان دەپاراست لە زۆر قسەو کرانەوە لەگەڵ هاوسەرەکانماندا, لە ترسی ئەوەی نە وەکو شتێکمان لە بارەوە دابەزێت، بەڵام پاش وەفاتی پێغەمبەر قسەمان زۆر دەکردو ڕوومان لەگەڵیاندا زۆر دەکرایەوە ".

مەبەست لەمە ئەوەیە، واتە: لەو شتانەی کە دین نە قەدەغەی کردووە، وە نە حەرامی کردووە، خۆیان دەپاراست, واتە زیادەڕەوییان تێدا نەکردووە.[194]

١٣٣ – لە لاپەڕە (٢٥٠)دا، لە باسی تەڵاق و مارە بە جاشدا, دەنوسێ: "لە ئیسلامیشدا ئەم کلتورە دووبارە بۆتەوەو بەکارهاتووە، ئەمەش دەلالەتی خۆی هەیە". پاشان بۆ ئەم قسانەی ئایەتی (٢٢٩–٢٣٠)ی سورەتی (البقرة) دەهێنێتەوە.

دەڵێین:

ئەو ئایەتەی مەریوان زیاتر بۆچوونەکەی لە سەر دروست کردووە، ئایەتی (٢٣٠)ی سورەتی (البقرة)یە, کە دەفەرمووێ: ﴿فان طلقها فلا تحل له حتى تنكح زوجاً غيره فإن طلقها فلا جناح عليهما أن يتراجعا إن ظنَا ان يقيما حدود الله﴾.

---

[192] سنن ابی داود، کتاب نکاح، باب: فمن حرم به، رقم (٢٠٦١)، والمصنف رقم (١٣٨٨٧).

[193] بۆ ئاشنابوون لەم بارەیەوە, بڕوانە: صحیح مسلم، رقم ١٤٥٣, فتح الباری, ج٩, ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥١٠٢) باب: من قال لا رضاعة بعد حولین, زاد المعاد, ج٥, ص٥٥٤ – ٥٩٣, سنن نسائی بشرح السیوطی وحاشیة السندی, م٣, ج٦, ص١٠٣–١٠٥, باب: رضاع الکبیر, المحلی شرح المجلی, ج ١١, المسالة (١٨٧١), (١٨٧٢), تفسیر القرطبی, ج٣, ئایەتی (٢٣٣) البقرة, ج٥, ئایەتی ٢٣ النساء و رحمة الامة في اختلاف الائمة, ص ٤٥٢ –٤٥٣, الام, م ٣, ج٥, ص ٢٩ – ٣١, رضاعة الکبیر, ج٥, المسالة السادسة.

[194] فتح الباری, ج٩, ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥١٨٧).

واتە: ئەگەر پیاوەکە لە سێیەم جاردا, ژنەکەی تەلاقدا, ئەوە بۆی حەلاڵ نییە، تا ئەو ئافرەتە شوو نەکاتەوە و جووت نەبێت لەگەڵ پیاوێکی تردا، جا ئەگەر ئەم پیاوی دووەمە ئافرەتەکەی تەلاقدا، ئەوا خراپەیان لەسەر نییە، گەر بگەڕێنەوە بۆ لای یەکتر، ئەگەر زانیان دەتوانن پارێزگاری لە سنووەکانی خوا بکەن.[١٩٥]

کەواتە:

گەر کەسێك ژنەکەی سێ بە سێ تەلاقدا، کاتێك جارێکی تر بۆی حەلاڵە، گەر ژنەکە شوو بکات بە پیاوێکی ترو جووتبوون رووبدات، پاشان پیاوی دووهەم بە ویستی خۆی تەلاقی بدات، ئینجا بۆ پیاوی یەکەم دروستە ئافرەتەکە بهێنێتەوە، بەڵام ئەگەر پیاوی یەکەم ڕێکەوت لەگەڵ پیاوێکی تردا، ئەگەر ژنەکەی لێ مارە بکات، پاش چوونە لای بۆی تەلاق بداتەوە، ئەمە لە ئیسلامدا نادروستە و حەرامە و ڕێی پێنەدراوە، ئەوەشە پێی دەوڕێت "مارە بە جاش".

" مارە بە جاش" لە ئیسلامدا نییەو ئایەتەکەش بە هیچ جۆرێك باس لەوە ناکات، وەك ئەوەی مەریوان هۆنیویەتییەوە، چونکە هەر کات ئەو مەرج و باوانەی، کە هەیە، وەك لە هەندێ جێگەی وڵاتی خۆمان جاران دەکرا، ئەوە نادروستە، چونکە هێنانەوەی ژن کاتێك دروستە، کە پیاوی دووەم, بە بێ هیچ مەرج و ڕێکەوتنێکی پێشوەخت ژنەکە تەلاق بدا، ئەوا ڕەوایە بۆ پیاوی یەکەم !، نەك دووان لە نێوانی خۆیاندا ڕێك بکەون.....هتد.

ئەمە کارێکە بە لای جەماوەری زانایانی ئیسلام، ڕێی پێنەدراوە، بە پشت بەستن بە چەندین فەرموودەی پێغەمبەر, کە دەفەرموێ:

١ – نەفرینی خوا لەو کەسەی ئافرەتێك بۆ پیاوێك حەلاڵ دەکات و ئەوەشی بۆی حەلاڵدەکرێت "لعن الله المحلل والمحلل له".[١٩٦]

٢ – (إبن مسعود) دەڵێت: "پێغەمبەر نەفرینی کردووە لەوەی ئەم کارە دەکات و بۆی دەکرێت". (لعن رسول الله المحلل والمحلل له).[١٩٧]

چەندین فەرموودەی تر، کە (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا ڕێگەکانی باس کردووە.[١٩٨]

هەروەها ئەم کارە لە ئیسلامدا زانایان بە گوناهی گەورەیان داناوە.[١٩٩]

١٣٤ – لە لاپەڕە(٢٥٢)دا، لە بارەی هەمان بابەت بەسەرهاتێك دێنێت، کە گوایە ئەمە بەهێزیی قسەکەی دەسەلمێنێت، بەم جۆرە باسەکە دەنوسێت: "(روفاعی قورەزی)، (تەمیمە)ی ژنی, سێ بە سێ تەلاق دابوو، ئەویش شووی کردبۆوە بە (عبدالرحمن بن زبیر)....، بە قسەی ژنەکە (تەمیمە) (عبدالرحمن) لەزەتی لێ نابینێ و ئەویش تەلاقی دەدات، (تەمیمە)ی تازە تەلاقدراو, دەچێتە لای پەیامبەرو پێی دەڵێ: ژنی ڕوفاعە بووم و تەلاقی دام، شووم‌کرد بە (عبدالرحمن)و هیچ چێژی لێ وەرنەگرتم، تەنها یەکجار هاتە لام و ئەویش بە هیچ دەرچوو، ئایا ئەگەر بگەڕێمەوە بۆ لای مێردەکەم حەلاڵ دەبم...؟، لەو کاتەدا (عبدالرحمن) لەگەڵ دوو کوڕیدا لەوێ دەبێ ودەڵێ: ئەی پەیامبەر درۆ دەکات، چۆن پێستە لە یەك جیا دەکرێتەوە، ئاوا یەکالای دەکەم (واتە عەورەتی دەدڕم)، بەڵام ئەو (تەمیمە) دەڵە، چاو لە دەرەو بە مێردی خۆی داناکەوێت و هەر ڕوفاعەی دەوێ، پەیامبەریش دەڵێ: ئەگەر وابێت ئەوە بۆ ڕوفاعە حەلاڵ نیت، هەتا لە خۆشاوییەکەت نەچێژێ‌و لە خۆشاوییەکەی نەچێژی.... ". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە دەکات بە (صحیح البخاری, باب: الثیاب الخضر)، تەفسیری (ابن کثیر).

دەڵێین:

---

[١٩٥] بڕوانە: تفسیر (إبن کثیر) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا.

[١٩٦] سنن إبن ماجه، رقم ١٩٣٦.

[١٩٧] سنن ابو داود، رقم ٣٤١٦، الجامع الترمذی ( ١١٢٠)، وأحمد فی سنده (٤٣٠٨).

[١٩٨] ابن کثیر، ئایەتی٢٣٠ البقرة.

[١٩٩] الزواجر عن إقتراف الکبائر، ج٢, الکبیرة ٢٦١ – ٢٦٢.

چەند ڕەخنەیەکمان لەسەر ئەمە هەیە، لەوانە:

١ – لە هیچ یەکێك لەو سەرچاوانەی مەریوان نوسیوویەتی, نەهاتووە، کە ئەو ژنە ناوی (تەمیمە) بێت، نەك هەر ئەوەندە, بەڵکو (بوخاری) لە صەحیحەکەیدا، ئەم ڕووداوە لە چەندین جێگەو چەندین ڕێگەی جیاواز دێنێت، بەبێ ئەوەی کە ناوی ئەو ژنەی تێدا بێت!.

٢ – لە (مستخرج)ەکەی (إسماعیلی)دا هاتووە، کە ئافرەتێك بووە لە (بنی قریضة)، وە (إمامی مالك) لە (الموطأ)ەکەیدا باسی دەکات، کە ناوی (تمیمة بنت وهب)، بەلاَم بە (مرسل)ی, ئەمە لە لایەك. لە لایەکی تریشەوە, جیاوازی هەیە، کە (تمیمە) چۆن دەخوێندرێتەوە؟ بە فەتحەی (تاء)ەکە، واتە بخوێندرێتەوە: (تەمیمە), یان بە بچوککراوەیی (تصغیر)، واتە بخوێندرێتەوە: (تومەیمە)؟, ئەوەی پەسەند بێت دووەمە.

٣ – هەندێکیش وتویانە: "ناوی (سُهیمة)یە".[٢٠٠]

٤ – ئەمە دەقە عەرەبییەکەیە:

"ان رفاعة طلق امراته فتزوجها عبدالرحمن بن الزبير القرظي، قالت عائشة: وعليها خمار اخضر، فشكت اليها وارتها خضرة بجلدها فلماجاء رسول الله، والنساء ينصر بعضهن بعضا، قالت عائشة: مارايت مثل ما يلقى المؤمنات، لجلدها أشد خضرة من ثوبها قال: وسمع أنها قد اتت رسول الله فجاء معه ابنان له من غيرها قالت والله مالي إليه من ذنب إلا أن ما معه ليس بأغنى عني من هذه، وأخذت هدبة من ثوبها، فقال: كذبت والله يارسول الله اني لأنفضها نفض الاديم، ولكنها ناشز تريد رفاعة، فقال رسول الله فإن كان ذلك لم تحلي له أو لم تصلحي له، حتى يذوق من عسيلتك ......الحديث".[٢٠١]

واتە: ڕیفاعە، خێزانەکەی خۆی تەلاَقدا, پاشان مێردی کردەوە بە (عبدالرحمن بن الزبیری قورەزی)، عائیشە دەڵێت: سەرپۆشێکی سەوزی دابوو بەسەریدا، شکایەتی حاڵی خۆی لای عائیشە کرد، وەسەوزاییەك بە پێستییەوە بوو, نیشانی عائیشەیدا, پاشان کە پێغەمبەر هات, ئافرەتانیش پشتگیری یەکتر دەکەن و یارمەتی یەکتر دەدەن، عائیشە وتی: بەڕاستی نەم بینیوە ئەوەندەی, کە ئافرەتە باوەڕدارەکان تووشی دێن، مەبەستی ناڕەحەتییەکە, کە توشیان دێت، پێستی ئەو ژنە لە سەر پۆشەکەی سەوزترە، جا (عبدالرحمن) بیستی کە ژنەکەی چووە بۆ لای پێغەمبەر، ئەویش هات و دوو کوڕی خۆی لەگەڵدابوو، کە لەم ژنە نەبوون، ئافرەتەکە, وتی: سوێند بە خوا من شکایەتی هیچ تاوانێکم بەلای (عبدالرحمن)ەوە نییە، تەنها ئەوە نەبێت ئەوەی، کە پێیەتی (مەبەستی عەورەتی پیاوەکەیەتی) بە ئەندازەی ئا ئەمە سوودی بۆ من نییە، دەستی برد ڕیشوویەکی لە پۆشاکەکەی گرت، (واتە عەورەتی مێردەکەی وەکو ئەو ڕیشووە لاوازو باریکە)، (عبدالرحمن) وتی: سوێند بە خوا پێغەمبەر درۆ دەکات، من وەك چۆن پێستە دەتەکێنرێت، ئاوا دەیتەکێنم و دەیجوڵێنم، بەلاَم ئەو خۆی سەرپێچی مێردی دەکات و ڕقی لێیەتی (واتە ڕقی لێمە)، ڕیفاعەی دەوێت, پێغەمبەریش فەرمووی: گەر ئەمە وایە، ئەوا تۆ بۆ ڕیفاعە حەلاَڵ نیت، یان فەرمووی: ناگونجێی بۆی، هەتا (عبدالرحمن) چێژ لە جووتبوونت وەرنەگرێت.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: "هەتا تۆش چێژ لە جووتبوونی ئەو وەرنەگریت".[٢٠٢]

کەواتە:

أ–"لەو کاتەدا عبدالرحمن لەگەڵ...". هەڵەیە,(عبدالرحمن) کە دەبیستێ ژنەکەی چووە شکات بکات، ئینجا ئەویش دەڕوات بۆ ئەو جێگەیە.

---

[٢٠٠] بڕوانە: فتح الباری، رقم الحديث (٥٣١٧) باب: اذا طلقها ثلاثا ثم تزوجت.....

[٢٠١] صحيح البخاري، مع الفتح ج١٠, باب: الثياب الخضر رقم (٥٨٢٥).

[٢٠٢] صحيح البخاري، رقم (٥٢٦٠ و ٥٣١٧).

ب- "چۆن پێستە لە یەك جیا دەکرێتەوە..". ئەمە وانییە, چونکە وشەی "نفض" بە واتای جولاندن و تەکاندن دێت، پاشانیش پێستە دەتەکێندرێت، نەك یەکالا دەکرێتەوە.[٢٠٣]

ج- "بەلام دەلـە......, چاولە دەرە.....". واتاکردنێکی زۆر سەقەتە، چونکە وەك لە دەقە عەرەبییەکەدا هاتووە, دەلێ: "ناشز" ئەم وشەیەش بە ئافرەتێك دەوترێت، کە بە گوێی مێردەکەی نەکات و ڕقی لێی بێت.[٢٠٤]

د- "هەتا لە خۆشاوییەکەت...". ئەمەش هەلەیە، چونکە "عسیلة" بچوکراوەی "عسل"ە، بە واتای هەنگوین دێ، مەبەستیش لەم دەستەواژەیە، وەك زانای زمانزان (الازهری) دەلێ: واتە شیرینی جووتبوونە, ئەمەش بەوە دەلێن، کە سەری عەورەتی پیاوەکە لە ناو عەورەتی ئافرەتەکەدا وون ببێ، وە جەماوەری زانایانیش دەلێن: "مەبەست لەم دەستەواژەیە (کنایە)یە, لە جووتبوون، بە وونبوونی عەورەتی پیاوەکە لە ناو عەورەتی ئافرەتەکەدا".[٢٠٥]

هـ- هەروەها مەبەستیش لەو بڕگەیە "وەك چۆن پێستە.....". لەوەیە, کە بە هێزو بە توانایە، ئەو کەسەی کە پێستە دەتەکێنێت, پێویستی بە بازوی پتەوو بەردەوامییە.[٢٠٦]

و- پاشانیش ئەم بەسەرهاتە, بەلگە نییە بۆ بۆچوونەکەی مەریوان، بەلکو ئەمە ئەو بۆ چوونەی مەریوان ڕەتدەکاتەوە، کە پێیوایە "مارە بە جاش" لە ئیسلامدا هەیە, ئیسلام, هەر چەشنە گرێبەستێك کە لەو چەشنە بێت, ڕەفزە لای و بە گوناهی گەورە و گرێبەستێکی بەتالی دادەنێت. وەك پێشتریش باسمان کرد.

١٣٥- لە لاپەڕە(٢٥٩)دا، لە باسی ژن و سێکسی زێڕیندا, باس لەوە دەکات، کە مارەکردنەوەی ژنی باوك, ئیسلام ڕێگەی پێداوە.

دەلێین:

١- ئیسلام، کاتێك هات, کۆمەلێك دابونەریت خۆی سەپاند بوو بە سەر ئەو کۆمەلگە نەفامەدا، بۆیە ئیسلام, پلە بە پلەو قۆناغ بە قۆناغ, هەولیدا ئەو شتانەی کە ناڕەوایە نەیهێلێ، یەك لەو باوە نادروستانە، مارەکردنی "ژنی باوك" بوو، کە لە نێو عەرەبدا باو بوو، بەلام خوای گەورە ئەم باوەی قەدەغە و حەرام کرد، وەك دەفەرموێت: ﴿ولاتنكحوا ما نكح اباؤكم من النساء الا ما قد سلف انه كان فاحشة و مقتاً و ساء سبيلاً﴾ النساء/٢٢.

**ئەم ئایەتە بەچەند جۆرێك ڕاڤە کراوە:**

١- "ئێوە ئەو ئافرەتانە مارە مەکەن، کە باوکتان مارەیان کردوون، تەنها ئەوەنە بێت, کە لەڕابردوودا ڕوویدا، ئەوەش دەبێت وازی لێبهێنن و دوور بکەونەوە لێی, چونکە بەڕاستی ئەمە کارێکی خراپەو دەبێتە مایەی ڕق و خراپترین ڕێگەیە".

٢- هەندێکی تر, لەوانە (قرطبی) ئاوا ڕاڤەی کردووە: "ئێوە وەك ئەوەی باوکانتان بە شێوەی نادروست و پێچەوانەی دینی خوا، کە ژنیان مارە دەکرد، ئێوە بەو جۆرە مارەی مەکەن ، بەلکو بە پێی یاسای خوا ژن مارە بکەن، مەگەر ئەوە نەبێت، کە لە پێشدا بە پێی شەرعی خوا مارە نەکراوە".[٢٠٧]

بەلام ئەوەی پەسەندو ڕاستر بێت، ڕاڤەی یەکەمە (وەك قورطبی) دەلێت، (ابن كثير)یش بە هەمان شێوە ڕاڤەی کردووە... .[٢٠٨]

---

[٢٠٣] بڕوانە: مقدمة فتح الباري, ص٢٧٢, فصل (ن, ف), ومختار الصحاح مادة (ن, ف, ض).

[٢٠٤] بڕوانە: مختارالصحاح, مادة(ن, ش, ز).

[٢٠٥] بڕوانە: فتح الباري, ج٩ باب: اذا طلقها ثلاثاً ثم تزوجت بعد العدة . فەرموودەی ژمارە(٥٣١٧).

[٢٠٦] بڕوانە: فتح الباري, ج١٠, باب: الثياب الخضر, رقم (٥٨٢٥).

[٢٠٧] بڕوانە: تفسير القرطبي، ج٥, آية ٢٢ النساء .

[٢٠٨] بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو، وتفسير ابن كثير.

٣ – ئەوەی پشتگیریی بۆچوونی یەکەم دەکات, هۆی دابەزینی ئایەتەکەیە، کاتێك (ابو قیس بن الاسلت) دەمرێ، کە یەکێك بوو لە پیاو چاکەکانی (ئەنصار), کوڕەکەی دەیەوێت ژنەکەی باوکی بهێنێتەوە، بۆیە دەچێتە داوای، ئافرەتەکەش پێی دەڵێ: من تۆم وەك منداڵێکی خۆم داناوە، پاشان تۆ یەکێکی لە پیاو چاکەکانی هۆزەکەت، بەڵام با بچم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ), پرسێکی پێبکەم، دەچێ باسەکە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە ولێی دەپرسێ: کە ڕای ئەو چییە؟ ئەویش پێی دەفەرموێت: بگەڕێرەوە بۆ ماڵی خۆت، ئیتر ئایەتی ﴿ولاتنكحوا ما نكح اباؤكم.....﴾ دادەبەزێ.[٢٠٩]

٤ – بە یەکدەنگیی زانایانی ئومەتی ئیسلام، هەر ئەوەندەی باوك گرێبەستی مارە بڕینەکەی کرد، ئیتر ئەو ئافرەتە لە سەر منداڵەکانی حەرام دەبێت.[٢١٠]

٥ – جگە لەم ئایەتەش، چەندین فەرمووده هەیە لەم بارەیەوە, ئەوەی کە شتی وەها بکات, بە هەڵگەڕاوە دەژمێردرێت ودەبێ بکوژرێ, هەرچیشی هەیە لە ماڵ و دارایی دەچێتە (بیتُ المال)ەوە.[٢١١]

٦ – لەو فەرموودانە لەم بارەیەوە:

ا – (بەڕراء) دەڵێ: "گەیشتم بە خاڵم (ابو بردە) ئاڵایەکی بە دەستەوە بوو، وتی: پیاوێك ژنی باوکی هێناوەتەوە, پێغەمبەریش(ﷺ) منی ناردووە، کە بچم بدەم لە گەردنیو ماڵەکەشی بهێنم".[٢١٢]

ب –(بەڕراء) دەڵێ: "دەگەڕام بە شوێن وشترێکمدا لێم وون ببوو، لە پڕ گەیشتم بە چەند سوارێك، ئاڵایەکیان پێبوو، دەشتەکییەکان دەیانزانی کە من هاوەڵی پێغەمبەرم(ﷺ) بە دەورمدا دەسوڕانەوە، ئەوەبوو سوارەکان چوونە خێمەیەك و پیاوێکیان لەوان دەرهێناو ودایان لە گەردنی، منیش کە پرسیام لێکردن، وتیان ئەمە ژنی باوکی مارە کردۆتەوە.[٢١٣]

ج – پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت: هەر کەسێك لەگەڵ ئافرەتێکی مەحرەمدا دروست بێ دەستبەجێ بیکوژن, "من وقع على ذات محرم فاقتلوه".[٢١٤]

کەواتە:

لەپەیامی خوادا ئەم کارە نادروستەو حەرامە، جا (من عمل صالحاً فلنفسه ومن اساء فعليها) فصلت/ ٤٦.

*تێبینییەك:*

لەوانەیە پرسیار بکرێت، ئەی مانای "الا ماقد سلف" چی لێدەکەن؟

دەڵێین:

ئەم (إلا)یە (استثناء)ی (منقطع)ە, واتاکەی بەو جۆرە ئەبێتەوە, کە سەرەتا لە خاڵی یەکەمدا باسمان کرد، کە ئەمە بۆچوونی (قورتوبی)یشە.[٢١٥]

هەتا مەریوان خۆیشی, یەك دوو نموونە باس دەکات، کە چۆن (عمر بن الخطاب) ڕێگری لەم کارە کردووە.*

گەرچی ئەوانەی ئێمە هێنامانەوە، شیفای دڵ دەدات، بەڵام بۆیە ئاماژەماندا بەوەی کە مەریوانیش هێناویەتی، ئەمە لە بابەتی (ولايحيق المكر السيء الا بأهله..) فاطر/٤٣ یەو هیچی تر!.

---

[٢٠٩] تفسير القرطبي وابن كثير.

[٢١٠] تفسير ابن كثير، آية/٢٢ النساء .

[٢١١] ابن كثير, زاد المعاد، ج٥، ص١٤-١٦.

[٢١٢] رواه احمد/٢٩٥ والنسائي ١٠٩/٦, ١١٠ باب: نكاح ما نكح الاباء، والترمذي رقم(١٣٦٢), وابو داود رقم (٤٤٥٧).

[٢١٣] رواه ابوداود، رقم (٤٤٥٦) واحمد في المسند ٢٩٥/٤ .

[٢١٤] رواه ابن ماجه (٢٥٦٤) كتاب الحدود، باب: من اتى ذات محرم....

[٢١٥] بڕوانە: تفسير القرطبي، ج٥, آية ٢٢ النساء.

*بڕوانە: مەریوان هەڵەبجەیی (هـ.س.پ), لاپەڕە/٢٥٩-٢٦٠.

١٣٦- لە لاپەڕە (٢٦٠)دا, دەنوسیٚ: "صەحابەیەك دەڵیٚ: هەرچییەکمان دەکرد، یەکسەر پەیامبەر ئایەتێکی بۆ نازڵ دەکردین, ئێمەش لە زەمانی پەیامبەردا خۆمان دەپاراست لەوەی قسەی خۆش وگاڵتەو گەپ و یاری لەگەڵ ژنەکانماندا بکەین، ئەترساین لەوەی ئایەتێکیش لەم بارەیەوە نازڵ ببیٚ، کە پەیامبەر وەفاتی کرد، ئێمەش دەستمان کرد بە قسەی خۆش وگاڵتەو گەپ".

دەڵێین:

سەیری ئەم چەواشەکارییە بکەن، چۆن مەریوان هەرچی ئارەزووی بیخوازێت, وا شت دەینوسیٚ ولێکی دەداتەوە، ئەو دەقە, هەر مەریوان خۆی, لە لاپەڕە (٢٥٠)دا دەقە عەرەبییەکەی نوسیوە، بەڵام چونکە پەیوەندی بە مەبەستەکەوە نەبووە لە وێدا واتای نەکردووە، لێرەشدا هاتووە چەند گۆڕانکارییەکی لە واتاکەیدا کردووە. دەقە عەرەبییەکە قسەیەکی (ابن عمر)ە کە دەڵیٚ: "كنا نتقى الكلام والانبساط الى نسائنا على عهد النبى (ﷺ) هيبة ان ينزل فينا شىء, فلما توفى النبى(ﷺ) تكلمنا وانبسطنا".

واتە: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خۆمان دەپاراست لەوەی لەگەڵ خێزانەکانماندا قسە بکەین و بکرێینەوە, لە ترسی ئەوەی نەکا شتێکمان لە بارەوە دابەزیٚ، بەڵام کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) وەفاتی کرد، قسەمان زۆر دەکردو ڕوومان کرایەوە لەگەڵیاندا.

مەبەست لەم قسەو کرانەوەیە, ئەو جۆرە بوو کە بە "مباح" ناسراوە، واتە ڕەوا بوو بیکەن، بەڵام ئەوەی دەچووە نێو بازنەی (البراءة الاصلية) بەم جۆرە دەترسان کە قەدەغەکردن، یان حەرامکردن دابەزیٚ لەبارەیەوە، وەك (ابن حجر)[٢١٦] بۆی چووە.

تێبینی:

مەبەست لەوەی سەرەوە ئەوە بوو، کە باسمان کرد، دەنا خودی پێکەنین وکردنی قسەی خۆش لەگەڵ خەڵکی، بەتایبەت ماڵ وخێزان، یەکێکە لەو دیاردانەی، کە ئیسلامی پێدەناسرێتەوە، مەگەر نابینریٚ، کە خوا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموویٚت: ﴿ولوكنت فظاً غليظ القلب لانفضوا من حولكَ...﴾آل عمران/١٥٩.

واتە: "ئەی محەممەد، ئەگەر تۆ کەسێکی مڕو مۆچ بویتایەو قسەت ناشرین بوایە، ئەوا ئەو خەڵکە لە دەورت نەدەمان وچواردەوریان چۆڵ دەکردیت ".[٢١٧]

هەتا بەجۆریٚ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕووخۆش و قسە شیرین و دەم بەپێکەنین بووە، زانایان کاتیٚ دانراویان لە بارەی ژیانییەوە نوسیبیٚ، باسی دادوەریی و نوێژو جەنگ و لایەنی کۆمەڵایەتی ....هتد, کردبیٚ، باسێکی سەربەخۆشیان بۆ پێکەنین و قسە خۆشەکانی داناوە, لەوانە: پێشەوا (تیرمیذی)، کە لە (الشمائل المحمدية)یەکەیدا دوو باسی سەربەخۆی نووسیوە، یەکێکیان لەبارەی "پێکەنین", ئەویتریان "گاڵتەو سوعبەت"ەکانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم).

ئەوەتا (عبدالله بن الحارث) دەڵیٚ : "کەسم نەبینیوە ئەوەندی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەم بە پێکەنین بوبیٚ، "ما رأيت أحداً أكثر تبسماً من رسول (صلى الله عليه وسلم)".[٢١٨]

(جرير بن عبدالله) دەڵیٚ: "لەوکاتەی موسڵمان بووم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەنعی نەدەکردم لە چوونە ژوورەوەم بۆ لای، هەر کاتێکیش منی بدیبایە، پێدەکەنی بۆم"، ﴿ما حجبنى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) منذ أسلمت ولا رانى إلا ضحك﴾[٢١٩].

[٢١٦] فتح البارى،ج٩، رقم(٥١٨٧).

[٢١٧] بڕوانە: ابن كثير، لەو بارەیەوە.

[٢١٨] رواه الترمذي، فى المناقب، رقم (٣٦٤٥).

[٢١٩] صحيح البخارى، كتاب المناقب، باب، ( ذكر جرير بن عبدالله )، ومسلم فى الفضائل، رقم (٢٤٧٥).

دیارترین نمونە بەسەرهاتەکەی (حنظلة)یە، کە پێیوایە پێکەنین و یاریکردن لەگەڵ خێزان و ماڵ و منداڵدا, نیشانەی دووڕوییە، بەڵام پێغەمبەر (صلی‌الله علیه وسلم) تێی دەگەیەنێت، کە هەموو شتێ کاتی خۆی‌و جێگەی خۆی هەیە[٢٢٠] .

هەتا (ابن عباس) دەستوری وابوو، کە لەگەڵ هاوەڵەکانیدا دادەنیشت و ماوەیەك قسەی بۆ دەکردن، دوایی دەیوت: "دەی دانیشتنەکە مزرو خۆش بکەن" ,(دیارە بەشتی ڕێك و جوان)[٢٢١] .

نمونە گەلێکی زۆر لەو بارەوە هەیە, بەڵام بەوەندە واز دێنین[٢٢٢] .

جا بەڕێزان:

سەرنجێك بدەن لە نێوان ئەو دەقەی مەریوان نووسیبوی و ئەو دەقە عەرەبییەش, کە ئێمە هێناومانە، ئیتر خۆتان دادوەرێکی بە ویژدان بن!.

١٣٧– لە لاپەڕە (٢٦٥)دا, دەقێکی عەرەبی دێنێ, بەم جۆرە: "أن امرأة كان يقال لها أم مهزول من أجمل النساء وهي من البغايا التسع اللاتي كن في الجاهلية فأراد بعض الصحابة أن يتزوجها فنزلت: (الزاني لاينكح...... ".

پاشان بەم جۆرە واتای دەکات: "ژنێك هەبووە بە ناوی (أم مهزول) ئەم ژنە یەکێك بوو لەو نۆ ژنەی، کە لە سەردەمی جاهیلیدا لەشفرۆشیان دەکرد، لە جوانترین ژن بووە، دواتر کە ئیسلام هات, ئەویش ئیمانی هێناو موسڵمان بوو، لەبەر جوانییەکەی, هەندێك لە صەحابەکان ویستویانە بیخوازن، بەڵام حوکمی ئەم ئایەتە ڕێگرییان لێدەکات: (الزانی لا ینکح.....).

دەڵێین:

بەڕێزان، من دەپرسم لە کوێی ئەو دەقە عەرەبییەی، کە مەریوان نوسیویەتی ئەمانەی تێدایە:

أ– "ئەویش ئیمانی هێناو موسڵمان بوو....". تەحەددای مەریوان دەکەم تەنیا سەرچاوەیەکی متمانەپێکراو بهێنێ لە سەر موسڵمانبوونی (أم مهزول)، کە ناشتوانێ، چونکە شتی وانییە.

ب– "لەبەر جوانییەکەی ....."، ئەوەی کە هەیە پێچەوانەی ئەمەیە، ئەویش ئەم ژنە بە مەرجی گرتبوو هەر کەسێ بیهێنێ, ئەم بژێویی ئەو پیاوە دابین دەکات[٢٢٣] .

ج– مەریوان وای نوسیوە، کە (عبدالله بن عمر) باسەکە دەگێڕێتەوە, هەر وەکو لە لاپەڕە (٢٦٥)ی کتێبەکەیدا ئاماژەی بۆ کردووە، بەڵام لە ڕاستیدا (عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص) ە[٢٢٤] .

ئەمە، جگە لەوەی کە ئایەتی (٣)ی سورەتی(النور)ی, بە سەقەتی واتا کردووە، ئێمە لە بڕگەی (١٠٧)دا بە درێژی قسەمان لە سەر کرد.

١٣٨– لە لاپەڕە (٢٦٥ – ٢٦٧)دا, لە باسی خالیدو شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا, باسێکی دوورو درێژی سەبارەت بە (خالید)و هۆکاری کوشتنی (مالك بن نويرة) دەنووسێت، کە گوایە خالید، لە بەر جوانی ژنەکەی، (مالك) دەکوژێ، تا ڕابوێرێ لەگەڵیدا، ئەوەی زیاتر بابەتی قسەکانی ئێمەیە ئەوەیە، کە مەریوان هەندێ چەواشەکاریی لە نوسینی ئەم ڕووداوەدا کردووە، دەنوسێ: "کە خالید دەگاتە ناوچەکە بە هۆی چەند کەسێکەوە لەگەڵ مالك بەیەك دەگەن و پاش ئەوەی مالك باوەڕو بڕوا هێنانی خۆی بۆ خالید دووپات دەکاتەوە، پێکەوە نوێژێك دەکەن، بە تەواو بوونی نوێژەکە

---

[٢٢٠] بڕوانە: صحيح مسلم كتاب التوبة، باب/ فضل دوام الذكر ،وابن ماجه (٤٢٣٩) وابن حبان (٢٤٩٣).

[٢٢١] مقدمة أخبار الحمقى والمغفلين لابن الجوزي، ص٢٤.

[٢٢٢] بۆ ئاشنا بوونی زیاتر بڕوانە: الشمائل المحمدية، ص ١٢٠بۆ ١٢٨ الترمذي، اختصار و تحقيق محمد ناصر الدين الالباني، هەروەها پێشەکی (اخبار الحمقى والمغفلين, لابن الجوزي)، تقديم وتعليق: رضوان جامع رضوان.

[٢٢٣] بڕوانە: إبن كثير، القرطبي ئایەتی (٣) النور.

[٢٢٤] بڕوانە :إبن كثير ، القرطبي، تفسير الجلالين.

شمشێر بازەکانی خالید پەلاماری شمشێرەکانیان دەدەن و مالك و هاوەڵانی دەستگیر دەکەن ....، لە ناویاندا هاوسەرەکەی (مالك)ی تێدا بووە، ئەم ژنە یەکێك دەبێت لە ژنە جوانە بە ناوبانگەکانی عەرەب، بە تایبەت جوانی پوزو چاوەکانی چەندین شیعری لەسەر دەنووسرێ، ئەم جوانییە سەرنجی خالید ڕادەکێشێ...... خالید بە مالك دەڵێ: من بکوژی تۆم، مالك پێی دەڵێ: ئەبوبکر ئەم فەرمانەی پێکردویت؟ ....مالك، سەیرێکی ژنەکەی خۆی دەکات و ڕوو دەکاتە خالیدو دەڵێت: ئەم ژنەم کوشتمی، واتە: جوانی ئەم ژنەم، وای لێکردی بمکوژی، بۆ ئەوەی دەستی بە سەردا بگریت ....، خالیدیش پەلی ژنەکەی مالك دەگرێ و لەگەڵ خۆی دەیبات و ....هەر ئەو شەوە لەگەڵی جووت دەبێ ....". پاشان مەریوان بۆ هەڵخەڵەتاندنی خوێنەر هەندێ سەرچاوە دەنوسێ، وەك (تأريخ طبري والاصابة وفيات الاعيان) کە ئەمانە زۆرتر متمانەپێکراون لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی دیکە.

دەڵێین:

جارێ با سەرەتا بزانین (مالك بن نويرة) کێ بووەو بۆ خالید کوشتی؟.

(مالك بن نويرة) لەو عەرەبانە بوو، کە هاتن بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کردیە سەرپەرشتیارو کۆکەرەوەی زەکات و خێرو خێراتی نێو هۆزەکەی، بەڵام کاتێ کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەفات دەکات، چەندین کەس لە عەرەبەکان هەڵگەڕانەوەو زەکاتیان نەدا، (مالك بن نويرة)یش یەکێك بوو لەوانە، ئەمە جگە لەوەی کاتێ (سجّاح) بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کرد، (مالك) چووە پاڵی و پەیوەندی پێوە کرد، هەتا لە (الاصابة)دا، هاتووە کاتێ، کە دەبیستێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کردووە، هەرچی ماڵێکی زەکاتی لادەبێ، گلی دەداتەوەو دابەشی دەکات بەسەر هۆزەکەیداو لەم بارەوە ئەم یەك دوو دێڕ شیعرەش دەڵێ:

| | |
|---|---|
| فَقلتُ خُذُوا أموالَكم غَيرَ خائفٍ | ولا نَظَر فيما يجيءُ من الغد |
| فإنْ قام بالدِّينِ الْمَحُوقِ قائم | أطَعْنا وقُلْنا الدينُ دينُ محمد |

واتە: دەڵێم: بەبێ ترس ماڵەکانتان وەرگرنەوەو چاوەڕێ ناکرێ لەوەی، کە سبەینێ چی دێت و ڕوودەدات، خۆ ئەگەر کەسێ هەستاو کاری ئەم دینە نەماوەی گرتە دەست، ئێمە پێی دەڵێین: وەختی خۆی گوێڕایەڵیمان هەبووەو دینیش هەر بە (محمد)ەوە دینە، کە ئەو نەما دینیش نامێنێ. ئەمە واتای هۆنراوەکەی بوو بە شێوەی پەخشان.

(خالید)یش لەو کاتەدا، کە خەریکی جەنگی هەڵگەڕاوەکان دەبێ، ڕووەو جێگەو شوێنی خێڵی (تەمیمی)یەکان دەچێت، کە (مالك) یەکێك دەبێ لەو خێڵە، تا دەگەنە جێگەیەك، کە پێی دەوترێ (البطاح)، لەوێ دەستەو کۆمەڵێکی وەها بەدی ناکەن، بۆیە (خالید) لە سوپاکەی چەند دەستەو مەفرەزەیەك دەنێرێت و بڵاوەیان پێدەکات بەو ناوەدا، (مالك) سەر لە ڕووداوەکە دەرناکات، بۆیە خۆی لە هۆزەکەی بەدوور دەگرێت، جا دەستەیەك لە سوپاکەی (خالید) کە (أبو قتادة)شی تیادابووە، دوانزە پیاو دەستگیر دەکەن، کە لەناویاندا (مالك)ی تێدا دەبێ، خالید بانگی (مالك) دەکات و سەرزەنشتی دەکات لە سەر ئەوەی، کە بۆ شوێن (سجاح) کەوتووەو زەکات نادات؟ هەروەها پێی دەڵێ: مەگەر نازانی زەکات هاوشانی نوێژە؟، (مالك) دەڵێ: ئەوە هاوەڵەکەی ئێوە، مەبەستی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، گومانی وایەو وەختی خۆی وایدەوت، خالیدیش پێی دەڵێ: بۆ تۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵی خۆت نازانی؟، بۆیە (خالید) فەرمان دەدات بە (ضرار بن الازور) بدات لە گەردنی (مالك) ،(مالك) ئاوڕ دەداتەوە بۆ لای خێزانەکەی و دەڵێ: ئا ئەمە منی کوشت، خێزانەکەی (مالك) لەوپەڕی جوانیدا بووە، بەڵام خالید دەڵێ: نەخێر، بەڵکو خوا دەتکوژێ، چونکە تۆ لە ئیسلام پاشگەزبوویتەوە، ئیتر (ضرار) دەدا لە گەردنی .... . دەربارەی خێزانەکەشی لە (وفيات الاعيان)دا، چەند بۆچوونێك باسکراوە، هەندێ وتویانە لە دەسکەوتی جەنگەکە دەیکڕێتەوەو پاشان مارەی دەکات،

هەندێکی تر دەڵێن: لە پاش ئەوەی ئافرەتەکە سێ سوڕی مانگانە تەواو دەکات، خالید دەچێت خوازبێنی دەکات و ئەویش ڕازی دەبێت [٢٢٥].

تێبینی:

١ – (إبن حجر) لە ( الاصابة)دا, دەڵێ: "کاتێ (مالك) بە ژنەکەی خۆی دەڵێ: تۆ منت کوشت، واتە لە پێناو تۆدا دەکوژرێم، ئەمە وەك گومانێکی خۆی وای وتووە و ئیتر ڕێکەوتووە کوژراوە، نەك ئەوە بێ، کە لەبەر خاتری ژنەکەی دەکوژرێ، وەك گومانی بردووە". [٢٢٦]

٢ – (مالك) لەبەر هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام و دانەنانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە پێغەمبەری خۆی، هەروەها ئەوەی بەڵگەیەتی هەڵگەڕاوەی (مالك) دەگەیەنێت ئەوەیە, کاتێ (متمم)ی برای (مالك) لە چەند دێڕە شیعرێکدا (مالك) دەلاوێنێتەوە، (عومەر) دەڵێ: خۆزگە منیش هۆنینەوەی شیعرم بزانیایە، وەك تۆ چۆن براکەت دەلاوێنیتەوە، منیش ئاوەها (زەید)م بلاواندایەتەوە، (متمم)یش بە (عومەر) دەڵێ: ئەگەر براکەی منیش وەك براکەی تۆ بڕۆیشتایە، ئەوا قەت نەمدەلاواندەوە، بۆیە (عومەر) دەیوت: هیچ کەسێ ئەوەندەی (متمم) لە سەرەخۆشی (زەید)ی برام بۆم کاریگەر نەبووەو سەبوری پێنەداوم [٢٢٧].

کەواتە:

أ– "کە خالید دەگاتە ناوچەکە ......" ، "بەتەواو بوونی نوێژەکە......." .

ب– "جوانی پوزو ......." ، "ڕودەکاتە خالید ........" .

ج– "هەر ئەو شەوە لەگەڵی جوت دەبێ ......." و ئەمانە و چەندین چەواشەکاریی تر، کە بۆ کەسێك خۆی بە نووسەرو خوێندەوار بزانێت شتێکی ناشیاوە، کە بەم جۆرە مامەڵە بکات لەگەڵ هەر کولتوورێکدا، گەرچی کولتوورەکەش دژی بیرو هۆشی ئەو کەسە بێت!.

د– کارەکەی (خالید)یش گەر بە باش دانەنرێت، ئەوە تەنها وەك مرۆڤێك کردوویەتی‌و ڕەخنە بەمە لە ئیسلام ناگیرێ و (خالید)یش وەك تەواوی کەسەکانی تر (معصوم) نییە.

خۆزگە خەڵکی خوێندەواری ئێمە، ئەوەندە هۆشمەند دەبوون، گەر شتێکیان بەرچاو بکەوێت، بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی شتەکان، خۆ خراپی تێدا نییە, ئەگەر خوێنەریش وەك نوسەر، بەڵام کەمێك ماندوو ببێت، ئەگەر خوێنەرەکانی وڵاتی ئێمە گەیشتنە ئەو ئاستە لەو باوەڕەدام کەس ناتوانێ "چاوبەست"، "فێڵ"، "درۆ"یان لەگەڵدا بکات.

١٣٩– تا ئەو کاتەی گەیشتمە ئەم جێگەیەی ئێستا بۆتان باس دەکەم، زۆر گومانم بەلای ئەوەدا دەچوو، کە ڕەنگە مەریوان تەنها کێشەی نەشارەزایی بێت، بەڵام کە گەیشتمە ئەم شوێنە (لاپەڕە ٢٧١)ی کتێبەکەی زانیم، کە چەندە دڵ پڕ لە قینە بەرامبەر بە وشەکانی: (خوا، پێغەمبەر و ئیسلام) خەڵکینە سەرتان سوڕدەمێنێ، لەوانەیە زۆر بە لاتانەوە گرنگ بێت ئاخر نوسەرێك بە حساب خۆی بە ڕۆشنبیرو گەرۆك بە دوا ڕاستیدا، بەڵام ئا بەم جۆرە ڕەفتار بکات، واباشە خۆتان بیخوێننەوە.

لە لاپەڕە (٢٧٠ –٢٧١)دا، دەقێکی عەرەبی دێنێ، دواتر دەیکاتە کوردی، پاشتریش وەك سەرچاوە ئاماژە دەدات بە (صحیح مسلم)، لە سەرەتاوە وەرگێڕانەکەی مەریوان دەنوسم، کە لە (إیاس بن سلمة)و دەنوسێ: "لە کاتی غەزای

[٢٢٥] بڕوانە: ئەم ڕووداوە لە (البدایة والنهایة)م٣، ج٦، ص ٣٢١ ـ ٣٢٣ ، (الاصابة فی تمیز الصحابة)ج٣, ص ٣٥٧، حرف المیم / القسم الاول، (وفیات الاعیان )ج٦، ص١٤، (رفع الخفا شرح ذات الشفاء)، ج٢، ص ١٥٠ـ ١٥١ .

[٢٢٦] الاصابة، ج ٣، ص ٣٥٧.

[٢٢٧] بڕوانە: رفع الخفا شرح ذات الشفاء، ج٢، ص١٥١، للعلامة : محمد بن الحاج حسن الالانی الکردی، تحقیق/ حمدی عبد المجید السلفی و صابر محمد سعدالله الزیباری.

هەروەها تأریخ الخلفاء الراشدین، ج١, ص ٢٦٩ ـ٢٧٣, د. علی محمد محمد الصلابی.

(فزارة)دا کۆمەڵێك جاریەو سەبایام دەستکەوت، پێشیخۆم دابوون لەو هۆزەدا ژنێکی تێدا بوو لە جوانەکانی عەرەب بوو، گەیشتینە مەدینەو هێشتا نەچوو بووم بە لایا، جلەکانیم لە بەر دانەکەندبوو، لە ڕێگە پەیامبەرم پێگەیی و وتی: ئەی (سلمە) ئەو ژنەم پێببەخشە، منیش پێم وت: ئەی پەیامبەری خوا بەڕاستی سەرنجی ڕاکێشاوم و هێشتا جلیشم پێدانەکەندووە، واتە نەچووم بە لایدا، بۆ ڕۆژی دوایی پێی وتمەوە: بیکە بە خاتری خوای باوکت ئەو ژنەم پێببەخشە، منیش پێم وت: با بۆ تۆ بێت بەخوا هێشتا جلەکانیم لەبەر دانەکەندووە".

مەریوان تا ئێرەی هێناوەو نووسیوە .

دەڵێین:

یەك تکاتان لێدەکەم ئەمەی، کە منیش دەینوسم زۆر بە وردی سەرنجی لێبدەن، چونکە زۆر گرنگە، من ئێستا ڕووداوەکە وەك خۆی لە (صحيح مسلم)دا, دەهێنم و پاشان دەقە عەرەبییەکەش، جا بزانن مەریوان کێیە!.

(إياس کوڕی سلمة) دەڵێ: "باوکم بۆی گێڕامەوە وتی: غەزای (بني فزارة)مان کردو پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) أبوبکری کردبووە ئەمیرمان، کاتێك کە ماوەیەك مابوو لە نێو ئێمەو ئاوەکەدا، (أبوبکر) فەرمانی پێکردین کە بار بخەین، ئێمەش بارمان خست، لە کۆتایی شەو بۆ ماندوو حەسانەوە، پاشان فەرمانی کرد هێرش بکرێت، (أبوبکر) گەیشتە سەر ئاوەکە (لەگەڵ سوپاکەیدا)، جا ئەوەی کوژرا کوژرا لە سەر ئاوەکە، دیلیشی گرت، ڕوانیم چەند کەسێکم بینی، کە منداڵیشیان تێدا بوو، ترسام لەوەی پێش من بگەنە لای چیاکەو دەربازیان بێت، منیش تیرم پێوەنان، کاتێ کە تیرەکەیان بینی ڕاوەستان، منیش چووم هەموویانم هێناو پێش خۆمم دان، لە ناویاندا ئافرەتێکی تێدا بوو لە خێڵی (فزارة) ڕاخەرێکی چەرمی پێوە بوو، کچێکی خۆی لەگەڵدا بوو لە جوانترین ئافرەتەکانی عەرەب، پێش خۆم دان, تا هێنامن بۆ لای (أبوبکر)، (أبوبکر)یش کچی ئەو ژنەی پێدام، کە هاتینەوە (مەدینە) هێشتا جلەکانیم لێ دانەکەندبوو، لە بازاڕ پێغەمبەرم (صلی اللە علیەوسلم) پێگەیشت و فەرمووی: ئەی (سلمة) ئەو ئافرەتەم پێببەخشە، وتم: ئەی پێغەمبەر بەڕاستی سەرنجی ڕاکێشاوم و جلیشم پیێ دانەناوە، پاشان بۆ بەیانی پێغەمبەرم (صلی اللە علیە وسلم) لە بازاڕ پێمگەیشتەوەو فەرمووی: ئەی (سلمە) ئەو ئافرەتەم پێببەخشە، بۆ خوا باوکت پیاو بووە، منیش وتم: با بۆ تۆ بێت ئەی پێغەمبەر، سوێند بەخوا جلم پێدانەکەندووە، پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) لە پاشان ئافرەتەکەی نارد بۆ خەڵکی (مەککە) لە بەرابەری چەند موسڵمانێك کە لە مەککە گیرا بوون دیل بە دیلی پێکرد".

عەرەبییەکەشی ئەمەیە:

قال: غزونا فزارة وعلينا أبوبكر، أمَّره رسول (صلى الله عليه وسلم) علينا، فلما كان بيننا وبين الماء ساعة، أمرنا أبوبكر فعرسنا، ثم شن الغارة فورد الماء، فقتل من قتل عليه، وسبى، وأنظر إلى عنق من الناس، فيهم الذراري، فَخشيت أن يسبقوني إلى الجبل، فرميت بسهم بينهم وبين الجبل، فلما رأوا السهم وقفوا، فجئت بهم أسوقهم، وفيهم إمرأة من بني فزارة عليها قِشعٌ من أدَمٍ قال ( القشع النطع )، معها ابنة لها من أحسن العرب، فسقتهم حتى أتيت بهم أبا بكر، فنفلني أبوبكر ابنتها، فقدمنا المدينة، وما كشفت لها ثوبا فلقيني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) في السوق، فقال: يا سلمة هب لي المرأة، فقلت: يا رسول الله والله لقد أعجبتني وما كشفت لها ثوباً، ثم لقيني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) من الغد في السوق، فقال لي: يا سلمة هب لي المرأة لله أبوك، فقلت: هي لك يا رسول الله، فوالله ماكشفت لها ثوباً، فبعث بها رسول الله (صلى الله عليه وسلم) الى أهل مكة، ففدي بها ناساً من المسلمين كانوا أُسروا بمكة[٢٢٨].

بەڕێزان:

١- چەندە خیانەتە بڕگەیەك لە باسێکدا کە ئەو بڕگەیە باسەکە ڕوون بکاتەوە بە ئەنقەست نەهێنرێ و خەڵکی پیێ چەواشە بکرێ، مەریوان ئەو بەشەی، کە خەتمان بەژێردا هێناوە نەیهێناوە، چونکە تەواوی بڕکانە بیێ بنەماکانی هەڵدەوەشایەوە!.

[٢٢٨] صحيح سلم بشرح النووي، ج٦، باب التنفيل وفداء المسلمين بالأسارى، رقم (٤٥٤٨).

٢ – مەگەر تەنها خوێنەری بە ویژدان و وریا ئەو جیاوازییە گەورەیە ببینێ، کە لە نێوان نوسینەکەی مەریوان و ئەوەی ئێمەدا هەیە، پاشان دەبێ چ جۆرە بڕیارێك بۆ ئەم کەسە گێرەشێوێنانە بدرێ؟!

٣ – جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە, کە مەریوان ئەوە نییە متمانە بە بچوکترین نوسینو قسەی بکرێ، ئاخر مەریوان وا دەزانێ خەڵك شت نازانێ، بابە خەڵکی بایی ئەوەندە ماوە وەك دەڵێن: (کاغەزی سپی بخوێنێتەوە!)، چ جای ئەوەی نوسینەکانی مەریوان، لەو کەسانە هەرگیز ون نابن!.

١٤٠ – لە لاپەڕە (٢٧٤)دا، پاش باسکردنی ڕووداوەکەی (حەڕڕە) دەنوسێ: "بەڵکو ئەمە یەکێکە لە مەهزەلەکانی دونیای سێکس، کە بە ئایەتی یەکەم لە سورەتی (الأنفال) شەرعییەتی پێداوە".

دەڵێین:

مەبەست لە ئایەتی یەکەمی (الأنفال) ئایەتی: ﴿يسألونك عن الأنفال قل الأنفال لِلهِ والرسول فاتقوا الله وأصلحوا ذات بينكم وأطيعوا الله ورسوله إن كنتم مؤمنين﴾.

واتە: ئەی (محمد) پرسیارت لێدەکەن لە بارەی دەسکەوتو ئەو شتانەی لە جەنگی بێباوەڕاندا دەستی موسڵمانان دەکەوێ، تۆ بڵێ بڕیارەکەی بۆ خوایەو دابەش کردنەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیکات بە فەرمانی خوا، کەوایە لەخوا بترسنو لە نێوان خۆتاندا چاکسازیی بکەنو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بن، گەر ئێوە بەڕاستی باوەڕدارن.[٢٢٩]

جا ئەوەی ئەندازەی کێشی گەردیلەیەك ئاشنای قورئانی هەبێ، دەزانێ ئەم ئایەتە مەبەستی باوەڕدارانە، کە لەگەڵ بێباوەڕاندا دەجەنگن، دواتر دەسکەوتیان لێدەگرن، هۆی هاتنە خوارەوەکەشی زۆر ڕوونو ئاشکرایە.[٢٣٠]

ئەوەی ڕوویدا لەمەدینە، کەدواتر ناسرا بەڕووداوی (حەڕڕە) نە خواو نەپێغەمبەرەکەی بەشتی وا ڕازی نینو ڕازیش نابن، چونکە:

١ – خەڵکی مەدینە هەموویان موسڵمان بوونو موسڵمانیش دەبن، پشت بە خواو بە کوێرایی چاوی دوژمنان!.

٢ – چ لە قورئانداو چ لە فەرموودە ساغ و دروستەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئەوە ڕوونکراوەتەوە، کە (خوێن و ماڵ و ناموسی) موسڵمان لە موسڵمانانی تر قەدەغەو ناڕەوایە، خوای گەورە دەفەرموێ:

أ – ﴿من قتل نفساً بغير نفس أو فساد في الارض فكأنما قتل الناس جميعاً ومن أحياها فكأنما أحيا الناس جميعاً﴾ المائدة /٣٢.

ب – ﴿ومن يقتل مؤمناً متعمداً فجزاؤه جهنم خالداً فيها وغضب الله عليه ولعنهم وأعد لهم عذاباً عظيماً﴾ النساء/٩٣.

لە چەندین فەرموودەشدا سەرزەنشتی ئەوکارە کراوە:

ج – "لزوالُ الدنيا أهون على الله من قتل رجل مسلم"[٢٣١].

د – "الكبائر: الإشراك بالله وعقوق الوالدين وقتل النفس..."[٢٣٢].

هـ – هەموو گوناهێك ئومێد هەیە خوا چاوپۆشی لێبکات، تەنها ئەوکەسە نەبێ، کە بە کافری دەمرێت، یان کەسێك باوەڕدارێك بە ئەنقەست دەکوژێت، "كل ذنب عسى اللهُ أن يغفره، إلا الرجل يموت كافراً، أو الرجل يقتل مؤمناً متعمداً"[٢٣٣].

---

[٢٢٩] تفسير الجلالين، ص٢٣٤.

[٢٣٠] بڕوانە: تەفسیرەکانی: (ابن كثير، قورتوبی و جلالين).

[٢٣١] رواه الترمذي، رقم (١٣٩٥) والنسائي، رقم (٣٩٨٧).

[٢٣٢] رواه البخاري، رقم (٦٦٧٥).

[٢٣٣] رواه النسائي، رقم (٣٩٨٤).

ئەوەی کرا لە ڕووداوی (حەڕڕە) پەڵەیەکی ڕەشە بە نێوچەوانی ئارەزوو پەرستان و دونیا ویستان و دوور لە ئامۆژگارییەکانی ئیسلام بوو، ئیسلام بە گەورەو بچوکی ئەو ڕووداوە غەمبارەو ناڕازییە، ئەوەی کردی پێچەوانەی خواو پێغەمبەرەکەی ڕەفتارییان نواندووە, بێگومان دەبێ سزای خۆشیان لە لای پەروەردگار وەربگرن.

ئیسلام، ئەگەر کەسی دڵسۆزی بمایە، نەیدەهێشت نە (یزید)ەکان و، نە (صدام)ەکان و نە (مەریوان)ەکانیش بازرگانی بە ئیسلامەوە بکەن!، هەر کەسەو بۆ خۆی چمکێکی لێدا بدڕێ و چاوبەستی خەڵکی پێبکات، بەڵام دڵنیا بن ڕۆژێ دێت هەموو لایەك ئەنجامی کاری خۆی دەبینێتەوە، جا چ چاکە، یان سزای خوایی.

١٤١ – لە بارەی ڕاڤەکردنی (موتعە) زۆر بە هەڵەدا چووەو ئاوا دەنوسێ: "(موتعە) واتە چەشتن و بە سەر بردنی کاتێکی خۆش، دەشێت ئەم مانایە بۆ هەموو حاڵەتێك بەکار بهێنرێت، یاخود ڕابواردن، کە ئەمەیان مانایەکی سێکسیانەی هەیە". پاشان چەند ئایەتێك دەنوسێ کە دەستەواژەی (متع)ی تێدایە.

دەڵێین:

ئەمە جگە لە بزڕکاندنەکانی مەریوان هیچی دیکە نییە، تەنانەت تاکە سەرچاوەیەکیشی بۆ ئەم نەزانییەی خۆی نەهێناوەتەوە!.

هەروەها دەبێت ئەوە بزانین, کە لە بنەمادا عەرەب بە بەرز بوونەوەی خۆر دەڵێن: "متع النهار"، وەبە سەرەتای هەڵکشانی گژوگیا دەڵێن: "متع البنات". کەواتە وشەی "المتاع" بریتییە لە (سود وەرگرتن لە درێژ بوونەوەی کات). هەر شتێکیش لە ماڵدا سوودی لێ ببینرێ پێی دەوترێ: "متاع".

وە بە خواردنیش دەوترێ: "متاع"، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ولما فتحوا متاعهم﴾ یوسف/ ٦٥, یعنی طعامهم، بەو شتەی خواردنی تێدەکرێ وتراوە (متاع)[٢٣٤].

کەواتە:

مەریوان، نەك هەر لە گوێی (گا بۆر)دا نوستووە!، بەڵکو لەوێشدا لە هۆش خۆشی چووەو لە خەوە سێکسییەکانی خۆیدا ئەم جۆرە لێکدانەوانەی بە مێشکدا هاتووە!، چونکە ئەوەی ئێمە زۆر بە کورتی ئاماژەمان پێدا، وتەی کەڵە زانایەکی زمانەوانییە, کە هەموو خەڵك هەژاری دەستی نووسینەکانی کەسێکی وەك (راغب)ن، نەك (مەریوان)ی هەژار, تەنانەت بە زمانەکەی خۆشی!، لە ناو باسەکەماندا زیاتر لەسەر ئەم چەمکە دەدوێین.

١٤٢ – لە لاپەڕە (٢٧٩)دا, لەسەر وشەی "عەرەفە" دەڵێ: "وشەی عەرەفات لە عەرەفەوە هاتووە، ئەم کۆیەش لە کۆی کۆمەڵەکانەوە هاتووە، کە لەوێدا شەو تا بەیان سێکس دەکەن و تاکە کێوێکە لە ناوچەکەدا بە کۆ ناوی بێت".

دەڵێین:

١ – (عرفات) (إسم الجمع)ە, واتە: ناوی کۆیە، نەك خۆی (کۆ) بێت، واتە: (مفرد)ی نییە، تا (جەمع)ی هەبێت، هەر لەبەر ئەمەیە, کە بە (إسم علم) ناسراوە، وەك (أذرعات) چۆن (إسم الجمع)ە، ئەویش ئاوهایە. وەك (قورتوبی) ئاماژەی بۆ کردووە.

٢ – ئەم ناوە ئەوەی ڕوون و ئاشکرا بێت وەك (إبن عطية) دەڵێ: (مرتجل)ە, وەك تەواوی ناوی جێگەکانی تر، واتە بە بێ هیچ شتێ پێی وتراوە "عرفات"، بە واتایەکی تر, واتە لە هیچ ناوێکی تر وەرنەگیراوە[٢٣٥].

ئەمە لە لایەنی زانستییەکەیەوە، کە باوەڕم نییە مەریوان لە یەك وشەی ئەمانەی نوسیومانە تێبگات، چونکە نەیبیستووەو تازەش بەم تەمەنەوە فریای ئەوە ناکەوێ لەمانە فێر بێت !.

٣ – ئەگەر بێینە سەر ئەو لایەنەی (دەڵێن و وتیان) ئەوا وتەی زۆرو جیاواز لەسەر ئەمە وتراوە، کە هیچی بە لای لایەنە سێکسییەکەی مەریواندا ناچێ، بۆ نمونە: وتراوە "عرفە" لەوەوە هاتووە، کە حاجی لەو جێگەیەدا زەلیلی و

---

[٢٣٤] بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن/ راغب الأصفهانى، مادة (متع)، ص ٧٥٧ ـ ٧٥٨، ومقدمة، فتح البارى, فصل (م ت).

[٢٣٥] بڕوانە: تفسير القرطبى، ئایەتی (١٩٨) البقرة.

ملكەچی زۆر دەردەبڕێ، وتراوە لە (العَرْف) وەرگیراوە, كە بە واتای (بۆنی خۆش) دێت، یا وتراوە لە ئارامگرتنەوە وەرگیراوە[٢٣٦].

١٤٣ – لە بارەی (حجر الاسود)ەوە, پاش ئەوەی نەزانی خۆی دەردەخات، كە لە كوێوە هاتووە و دواتر پێیوایە پارچە (نەیزەك) بێت و دەنوسێ: "مێژونوسێكی ئیسلامی پاڵپشت بە ئەفسانە باس لە بەردە ڕەشەكەی ناو كەعبە دەكاو دەڵێ: بەردەكە لە سەرەتادا سپی بووەو بە هۆی مانگانە (حیض)ی ژنەكانەوە ڕەش بووە، دواتر ئاماژە بە كتێبەكەی (عبدالحمید السیسلی) دەكات.

دەڵێین:

١– ئێمە وەك موسڵمان باوەڕی سەد لە سەدمان هەیە، كە ئەو بەردە ڕەشە لە بەهەشتەوە هاتووەو لە دوورو نزیك پەیوەندی بە (نەیزەك)ەكەی مەریوانەوە نییە، چونكە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەو هەواڵەی بە ئێمە داوەو دەفەرموێ: "الحجرُ الأسودُ منَ الجنة".[٢٣٧]

جا خەڵكی تر چی دەڵێن, ئەوە وتەی گیرفانی خۆیانەو تا ئێستا زانستی ڕاستیش لە یەكلابوونەوەی ئەو بەردە كۆڵەوارەو سەرسامە!.

٢– ڕەشبوونی بەردەكە بە پێی فەرموودەی ساغ و درووستی سەروەری مرۆڤایەتی، تاوان و خراپەی مرۆڤەكان هۆكاری بووە، چونكە سەرەتا كە بەردەكە لە بەهەشتەوە نازڵ بووە, لە شیر سپی تر بووە، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: "نزل الحجر الأسود من الجنة، وهو أشد بیاضاً من اللبنٌ، فسوَّدتهُ خطایا بني آدم"[٢٣٨].

٣– (عبد الحمید السیسلی)یش كەسێكە، وەك مەریوان هەر دەڵێی زەلكاوی یەك زۆنگاون و نووسینە قەڵبو بێناوەڕۆكەكانی ئەویش، وەك ئەوانەی مەریوان سەری سەر لێشێواوی خاوەنەكەیەتی.

١٤٤ – لە لاپەڕە (٢٨٠)دا, دەنوسێ: "ئەگەر چی لەو سەردەمەدا هەموو شتەكان پەیوەندییان بەئەفسانەو خورافەو عەقیدەوە هەبوو، بەڵام كۆمەڵێك لە موسڵمانان لۆژیكانەتر بیریان لەم مەسەلەیە دەكردەوە و تەوافی صەفاو مەڕوەیان بە دیاردەیەكی خورافی دەزانی". پاشان دەقێك لە (بوخاری)دا دێنێ و بەم جۆرە دەیكات بە كوردی: "پرسیارم لە ئونەس كرد، ئایا ئێوە ڕقتان لە صەفاو مەڕوە دەبووەوە؟ وتی: بەڵێ، چونكە لە دروشمەكانی جاهیلی بوو".

دەڵێین:

شەرم نەكردن بەم جۆرە، بە ڕاستی ژیریی و دانایی هیچ كەسێ بەم جۆرە ڕێگەی نادات، بەڕێزان وەرن با پێكەوە ئەو دەقەی، كە لە (صحیح البخاری)یدایە بیهێنین، ئەو جا چی بە مەریوان دەڵێن سەر پشك بن.

(عاصم) دەڵێ: "قلت لأنس بن مالك (رضی الله عنه) أكنتم تكرهون السعي بین الصفا والمروة ؟ قال: نعم لأنها كانت من شعائر الجاهلیة، حتى أنزل الله: إن الصفا والمروة من شعائر الله .....".[٢٣٩]

عاصم دەڵێ: بە (أنس)م وت: ئایا ئێوە وەختی خۆی هاتوچۆی نێوان سەفاو مەڕوەتان پێناخۆش بوو؟ وتی: بەڵێ، چونكە یەكێك بوو لە دەستورو دابەكانی سەردەمی نەفامیی، هەتا ئەوە بوو خوای گەورە ئایەتی ﴿إن الصفا والمروة من شعائر الله...﴾ البقرة/١٥٨ی دابەزاند.

هۆی ئایەتەكان ئەوە ڕوون دەكەنەوە، كە بۆیە هەندێك پێیان ناخۆش بووە، چونكە لە سەردەمی نەفامیدا، لە كاتی حەجدا، لەسەر سەفا بتێكیان دانابوو، بەناوی (إساف) و لەسەر مەڕوەش بتێك بە ناوی (نائلة)، دەبوایە ئەوەی سەعی نێوان سەفاو مەڕوە بكات، وەك پیرۆزییەك دەستیش بهێنێ بەو دوو بتەدا، جا كاتێ ئیسلام فەرمانی حەج كردنیداو

[٢٣٦] بروانە: تفسیر القرطبی، ئایەتی (١٢٨ و١٩٨) البقرة.

[٢٣٧] رواه النسائی، فتح الباری، ج١، باب ماذكر فی الحجر الاسود.

[٢٣٨] رواه الترمذی، وهو قوي بطروقه، كما قال ابن حجر. وفتح الباری باب/ ما ذكرفی الحجر الاسود.

[٢٣٩] صحیح البخاری، رقم (١٦٤٨) وابن كثیر, ئایەتی ١٥٨ البقرة.

هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروە بووە یەكێك لە نیشانەكانی حەج، هەندێ وایانزانی ئەگەر ئەوە بكەن هەمان كاری نەفامەكانیان كردووە، بەڵام خوای گەورە پێی ڕاگەیاندن، كە هاموشۆی سەفاو مەروە، یەكێكە لە داخوازییەكانی خوای گەورە (بەدەر لەوەی كە موسڵمانان بالاّ دەست بوون و ئەو دوو بتەیان لەناو برد)[٢٤٠].

كەواتە:

١ – موسڵمانەكان وا ڕاهاتبوون، هەتا كارێك خواو پێغەمبەرەكەی مۆڵەتیان نەدەن لە خۆیانەوە ئەنجامی نادەن، ئەم كارەش لەم بابەتەیە.

٢ – لە فەرموودەكەدا "حتی أنزل الله...." هەیە, بەڵام مەریوان بە دەستی ئەنقەست نەیهێناوە، چونكە درۆكەی بۆ نەدەچووە سەر!.

١٤٥ – لە لاپەڕە (٢٨٠)دا، ئایەتی ﴿الحج أشهر معلومات....﴾ البقرة/ ١٩٧ دێنێ و دواتر دەنوسێ: "بەڵام دوایی ئەم ئایەتەی نەسخ كردەوە، ئەو ئایەتەی بە ڕاشكاوانە باس لە عەمرەو موتعەی حەج دەكات ئەمەیە ﴿وأتموا الحج والعمرة لله ....﴾ البقرة /١٩٧".

دەڵێین:

من بەش بە حاڵی خۆم، تا نووسینی ئەم وەڵامەش بە عەقڵی مەریوان زۆر پێكەنینم دێت، ئێستا بە دەم پێكەنینەوە، ئەم وەڵامە دەنووسم!، چونكە نەزانی مەریوان گەیشتۆتە ئاستێك بە جارێك خۆی خستۆتە دەرەوەی كەسێكی خوێندەوار!، چونكە:

١ – ئایەتی ﴿الحج أشهر معلومات.... ﴾ نەسخ نەبۆتەوە، بەڵكو هەموو ڕاڤەكارانی تەفسیر لەسەر ئەوەن، كە ئەم ئایەتە باس لە دیاریكردنی مانگەكانی حەج دەكات و پاشان هەندێ داب و دەستور لەكاتی (ئیحرام)ی حەجدا, كە دەبێ ئەوەی حەج دەكات پابەند بێت پێوەی لەكاتی (ئیحرام)ەكەیدا، هەتا ئیحرام دەشكێنێ، بە تایبەت نەچوون بەلای (خێزان)دا.

٢ – تەحەددای مەریوان دەكەم، ناوی تەنها سەرچاوەیەكی ڕەسەنی ئیسلامی هەبێت لەسەر ئەو قسەی، كە دەڵێ "نەسخ" بۆتەوە، من لەو باوەڕەدام, گەر مەریوان بە ئاستەم بۆنی شتی وای بكردایە بە "چەواشەكارییش" بوایە دەینوسی!، بەڵام خۆ ئەوە سەرچاوە ڕەسەن و متمانەپێكراوەكان، با كەسی خوێندەوار خۆیان بچن ئەم درۆ شاخدارەی (مەریوان)یان بۆ ئاشكرا ببێت[٢٤١].

٣ – ئایەتی "وأتموا الحج والعمرة لله...." البقرة/١٩٦، باس لەو حاڵەتە دەكات، كە ئەو كەسە ڕێی لێدەگیرێ لە حەجكردن كە پێی دەوترێ "مُحصِر" چیبكا، هەروەها ئایا (عەمرە) كردنیش، وەك حەج پێویستە یان نا، گەر كەسێ (إحرام)ی بەست بە (عەمرە)و پاش تەواو بوونی عەمرەكەی ئیحرامی بەست بە (حەج)، كە پێی دەوترێ "موتعەی حەج", یان "تەمەتوع" ......چی بكا[٢٤٢].

٤ – لە هەمووی خۆشترو پێكەنیناوی تر ئەوەیە، كە مەریوان "موتعەی حەج"ی بە كاری سێكسیی لێكداوەتەوە، كە ئەمە تەنها لە قاموسە سێكسییەكەی مەریواندا هەیە!, دەنا "موتعەی حەج" وەك باسمان كرد و دواتریش باسی دەكەین، بریتییە لە ئیحرام بەستن بە (حەج) و (عەمرە) پێكەوە، تۆ بڵێی كەسێكی تر هەبێ لە مەریوان داماوتر؟! باوەڕ ناكەم.

ڕونكردنەوەیەكی پێویست:

---

[٢٤٠] بڕوانە: فتح الباری، باب (وجوب الصفا والمروة)، وجعل من شعائر الله، ج٣ ، وابن كثیر، ئایەتی ١٥٨ البقرة، وتفسیر القرطبی.

[٢٤١] بڕوانە: تفسیر إبن كثیر، القرطبی و جلالین، ئایەتی ١٩٧ی (البقرة)، والمحلی، ج٧ مسألة ٨٢١، فتح الباری، ج٣ باب قوله تعالی: (الحج أشهر معلومات).

[٢٤٢] بڕوانە: تفسیر ابن كثیر، القرطبی و جلالین .

حەجکردن سێ شێوەی هەیە:

أ- (إفراد): ئەوەیە، کە (ئیحرام) بە (حج) دادەبەستێ و کاری حەج تەواو دەکات، پاشان گەر ویستی لە (میقات)ەوە ئیحرام بە (عەمرە) دەبەستێ، یا گەر ویستی بۆ ساڵێکی تر بە جیا (عەمرە)کە دەکات، ئیحرام بەستن: بریتییە لە داکەندنی جلی ئاسایی و لەبەر کردنی پۆشاکی سپی و نییەت هێنان بە حەج یان عەمرە....، هەروەها حەرامکردنی هەندێ شت لەو ماوەیەدا، بە داکەندنی ئەو پۆشاکانەو تەواو کردنی هەندێ مەراسمی حەج، یان عەمرە، پێی دەوترێ "ئیحرام شکاندن".

ب- (قران): ئەوەیە حەج و عەمرە پێکەوە دەکات، واتە لە میقاتەوە ئیحرام بە(حەج) و(عەمرە) دەبەستێ.

ج- (تمتع): ئەوەیە, کەسی دانیشتوی غەیری (مەککە) لە مانگەکانی حەجدا (ئیحرام) بە (عەمرە) دەبەستێ، پاش تەواو بوونی لە کارەکانی عەمرە، ئیتر هەر لە مەککە ماوەیەك دەمێنێتەوە، پاشان ئیحرام بە (حەج) دەبەستێ، یان هەردووکیان پێکەوە دەکات, کە ئەمەیان پێیدەوترێ "تمتع القران".[٢٤٣]

ئەوەی مەبەست بێت، مەریوان ئەو دەقە حەدیسیانەی، کە لە بارەی "تمتع"ەوە هێناوە لە (حەج)دا، هەموویان مەبەستیان ئەو جۆرەیە، کە لە لقی (ج)دا باسمان کرد، نەك ئەو تەفسیرو خەیاڵییە سێکسییەی، کە مەریوان ڕاڤەی پێکردووە، وەك دواتر زیاتر باسی دەکەین. جا سەرنج بدەن!.

١٤٦ - لە لاپەڕە (٢٨٢)دا, دەنوسێ: "ابن عباس دەڵێ: لە کاتی حەجدا, کە دەگەیشتینە مەککە پەیامبەر یەکسەر فەرمانی دەردەکرد، کە تەوافی کەعبە بکەین، صەفاو مەڕوە بکەین، موتعەی ژنان بکەین، دوایی سەرو ڕیشمان بتاشین یان کورتیان بکەینەوە". پاشان وەك سەرچاوە دەنوسێ (صحيح البخاری، باب/ تقصير المتمتع بعد العمرة).

دەڵێین:

خەڵکینە من ئێستا ئەو دەقەتان, لە هەمان سەرچاوەدا, بە عەرەبییەکەی بۆ دەنووسم، بزانن چەندە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ نوسینەکەی مەریوان، ئەمە دەقە عەرەبییەکەیەکە.

(ابن عباس) دەڵێ: "لما قدم النبي (صلى الله عليه وسلم) مكة أمر أصحابه أن يطوفوا بالبيت، وبالصفا والمروة، ثم يُحلّوا و يحلِقُوا أو يقصروا".[٢٤٤]

واتە: کاتێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتە (مەککە) فەرمانی کرد بە هاوەڵانی، کە تەوافی بەیت بکەن و سەعی سەفاو مەڕوە بکەن، پاشان ئیحرام بە (عەمرە) بشکێنن و سەریان بتاشن، یان کورتی بکەنەوە.

کەواتە:

کە مەریوان دەنوسێ: "موتعەی ژنان بکەن..." درۆیەو خەیاڵی سێکسیی خۆیەتی!، چونکە:

١- ئەگەر مەبەستی ئەمە بێت، کە شتی وا هەیەو لە واتای "يحلوا " وەردەگیرێ، جارێکی تریش هەڵەی کردووە!، چونکە ئەوەی بە ئەندازەی دەنکە نیسکێك شارەزایی زمانی هەبێ دەزانێ "يحلوا" واتە: "ئیحرام شکاندن" بە واتای ئەوەی پێش ئیحرام لێی قەدەغە بووە لە (ڕاو و موو لە خۆ کردنەوە و ژن هێنان و چوونە لای خێزان ...هتد) بەو ئیحرام شکاندنە بۆی ڕەوا دەبێت.

٢- جا یەکێك لەو هەموو ڕەواییانە چوونە لای خێزانە، نەك بە تەنها چوونە لای خێزان, وەك مەریوان (ئەگەر بۆی چووبێ) ئاماژەی بۆ کردووە.

[٢٤٣] بڕوانە: مقدمة فتح الباري، فصل (م ت)، وفتح الباري، ج٣, ص٤٧٧, باب: التمتع والقران والافراد ... وابن كثير، ج١ ئایەتی ١٩٦ البقرة، والقرطبي، رحمة الأمة، ص٢١١، المحلى, ج٧, ص٧٠و مفردات ألفاظ القران مادة (متع)، شەریعەتی ئیسلام، ص ٢٦٩ - ٢٧٠، زاد المعاد، ج٢, ص ١١٢.

[٢٤٤] رواه البخاري, رقم (١٧٣١) .

٣ - ئەم فەرموودەیە باس لەو کەسە دەکات، کە سەرەتا (عەمرە) بکات، پاشان ئیحرام بشکێنێت و دواتر ئیحرام بە (حەج) دابەستێ، ئەمەش بە ڕوونی لەسەر باسەکەی خودی پێشەوا (بوخاری)دا بەدەر دەکەوێت، کە نوسیویەتی: (باب/ تقصير المتمتع بعد العمرة)، کە باس لەو کەسە دەکات لە پاش تەواو بوونی (عەمرە)کەی قژ کورت دەکاتەوە.[٢٤٥]

١٤٧ - لە لاپەڕە (٢٨٢)دا، ئەم دەقە دەهێنێ: "أمر النبي (صلى الله عليه وسلم) أصحابه أن يجعلها عمرة و يطوفوا ثم يقصروا ويحلوا". پاشان ئاماژە دەکات بۆ (صحيح البخاري، باب / متى يحل المعتمر).

دەقەکە بەم جۆرە دەکات بە کوردی: "پەیامبەر فەرمانی بە صەحابەکان کردووە حەجەکەیان بکەن بە عەمرەو تەواف بکەن و دوایی سەر و ڕیشیان کورت بکەنەوە، دوای ئەوانە شتیش بۆ خۆیان حەڵاڵ بکەن، واتە موتعە بکەن.

دەڵێین:

"موتعە بکەن..." تێگەیشتن و کاڵفامییە سەقەتەکانی مەریوان خۆیەتی و لەسەر وشەی "یحلوا" لە پێشەوە قسەمان کرد.

١٤٨ - لە هەمان لاپەڕەدا، گەورەترین فێڵ دەکات، کاتێ ئەم دەقە دەنوسێ: "سألنا ابن عمر (رضى الله عنهما) عن رجل طاف بالبيت في عمرة ولم يطف بين الصفا والمروة، أيأتي إمرأته؟ فقال: وقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة لا يقربنها حتى يطوف بين الصفا والمروة".

دواتر بەم جۆرە دەیکات بە کوردی: "لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری خەتتابیان پرسیوە: ئەگەر پیاوێك لە عەمرەدا تەوافی ماڵی کردو پێش ئەوەی تەوافی صەفاو مەڕوە بکات، ئایا ئەبێت بچێت بە لای ژنەوە؟ لە وەڵامدا وتوویەتی: پەیامبەر بۆ ئێوە نمونەیەکی جوان و چاك بووە، کەس نەچێت بە لای ژنەوە تا تەوافی صەفا و مەڕوە دەکات".

دەڵێین:

١ - "تەوافی سەفاو مەڕوە"نییە، مەریوان، لەفزەکە ڕاستە وا نوسراوە، بەڵام واتاکەی هاموشۆ کردن (سعي)ی سەفاو مەڕوەی مەبەستە، ئەمە مەگەر لای تۆ ڕوون نەبێت، چونکە نەزانی!.

٢ - ئەوان پرسیار لە (ابن عمر) دەکەن، کە ئایا ئەو کەسەی بچێت بەلای خێزانی خۆیەوە؟ "أيأتي إمرأته" ؟ کەچی تۆ کردوتە بە "بچێت بە لای ژنەوە" ئەم دوو واتایە جیاوازییان هەیە، چەواشەکارییش لەم جۆرە، جگە لە ناشرینکردن هیچ بۆ خاوەنەکەی بەجێ ناهێڵێ!.

٣ - "لا يقربنها" واتە: نەچێت بە لای ژنی خۆیەوە، نەك ئەوەی مەریوان واتای کردووە!.

مەریوان، خۆی ئایا ڕازی دەبێت ئاوها یاریی و گاڵتەو هەڵگێڕانەوە بە دەقێك بکەن، کە خۆی بیهێنێت (ئەگەر ڕاست بێت) بێگومان نەخێر، دەی ئەم ڕەوشتە قێزەونە بێ شەرمانە لە کوێوەو لە کێوە فێر بووە ؟!.

١٤٩ - لە لاپەڕە (٢٨٢ - ٢٨٣)دا، دەقێك لە (صحيح البخاري)دا دێنێ بەم جۆرە: "عن أبي موسى الأشعري (رضى الله عنه) قال ثم قدمت على النبي (صلى الله عليه وسلم) فقال: أحججت قلت نعم، قال أحسنت طف بالبيت وبالصفا والمروة، ثم أحل فطفت بالبيت وبالصفا والمروة ثم أتيت إمرأة من قيس فكنت أفتي به حتى كان في خلافة عمر".

پاشان بەم جۆرە دەیکات بە کوردی: "هاتم بۆ لای پەیامبەر پێی وتم: حەجت کرد؟ وتم: بەڵێ، وتی: چاکت کرد، بڕۆ تەوافی ماڵی خوا بکەو صەفاو مەڕوە بکەو شتیش بۆ خۆت حەڵاڵ بکە، منیش چووم تەوافی ماڵی خواو صەفاو مەڕوەم کردو ژنێکیشم لە هۆزی (قەیس) هێناو بۆ خۆم حەڵاڵم کرد، هەر واشم دەکردو تا خەلافەتی عومەریش فتوام لەسەر دەدا".

دەڵێین:

بەڕێزان وەرن با نەفامیی مەریوانتان بۆ ئاشکرا بکەم:

---

[٢٤٥] بڕوانە: فتح الباري، ج ٣، باب / تقصير المتمتع بعد العمرة، هەروەها بۆ ئاشنابوونی زیاتر لە بارەی ئیحرام شکاندنی عەمرەکار، بڕوانە هەمان سەرچاوە (باب/ متى يحل المعتمر).

١ – لە دەقە عەرەبییەکەدا لابردنێکی زۆری تێدا کردووە، دەقەکە خۆی لەو جێگەیەی، کە مەریوان لێوەی نەقڵ کردووە، ئاوهایە: "عن أبي موسى الأشعري (رضى الله عنه) قال: قدمت على النبي (صلى الله عليه وسلم) بالبطحاء وهو مُنيخ، فقال: أحججت؟ قلت: نعم، قال: بم أهللت؟ قلت: لبيك بإهلال كإهلال النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: أحسنت، طف بالبيت وبالصفا والمروة ثم أحل، فطفت بالبيت و بالصفا والمروة، ثم أتيت إمرأة من قيس فَفلَتْ رأسي، ثم أهللت بالحج، فكنت أفتي به حتى كان في خلافة عمر، فقال: إن أخذنا بكتاب الله فإنه يأمرنا بالتمام، وإن أخذنا بقول النبي (صلى الله عليه وسلم) فإنه لم يحل حتى يبلغ الهدي محله".[٢٤٦]

٢ – جا بەڕێزان ئێستا ئەم دەقە دەکەین بە کوردی ئنجا ئەزانن، کە بەڕاستی مەریوان چەواشەکارە، بێئەدەبە بەرامبەر کاغەزو قەڵەم و بێ سەلیقەیە!، ئەو دەقە (بوخاری) بە چەند ڕێگەیەکی تریش لە (صحیح)ەکەیدا هێناویەتی، کە بەو جێگەیەوە دەکاتە (شەش) جێگە بە ژمارەکانی (١٥٥٩، ١٥٦٥، ١٧٢٤، ١٧٩٥، ٤٣٤٦ ، ٤٣٩٧).

ئەمەش دەقە کوردییەکەیەتی:

"(أبو موسى) دەڵێ: گەیشتمە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و کە چوومە بەرەوە ئەو لە (بەطحاء) لایدابوو، (وەك لە گێڕانەوەکانی تری بوخاریدا هەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (ابو موسى) دەنێرێت بۆ وڵاتی یەمەن، پاشان لە دەی کۆچیدا دەگەڕێتەوە ئەم ڕووداوەی لێ ڕوودەدا)، پێی فەرمووم: حەجت کردووە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: چۆن ئیحرامت دابەستووە؟ وتم ئاواها ئیحرامم دابەستووەو وتومە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چۆن ئیحرامی دابەستووە، منیش وەك ئیحرام بەستنەکەی ئەو ئیحرامم دابەست، فەرمووی: چاکت کرد، بڕۆ تەوافی بەیت و سەعی سەفا و مەڕوە بکە، پاشان ئیحرام بشکێنە، منیش وام کرد، تەوافی بەیت و سەعی سەفاو مەڕوەم کردو ئیحرامم شکاند، پاشان چووم بۆ لای ئافرەتێك، کە لە هۆزی (قیس) بوو سەری بۆ دۆزیم (واتە ئەسپێ لە قژیا بووە بۆی دۆزیوە)، پاش ئەمە ئیحرامم بە حەج دابەست، ئیتر من بەم جۆرەی، کە خۆم حەجم کردبوو، فەتوام دەدا هەتا سەردەمی عومەر هات، عومەر وتی: ئەگەر ئێمە بە قسەی قورئان بکەین، ئەوا قورئان فەرمانمان پێدەکات, کە حەج و عەمرە, کاتێك دەستمان پێکرد تەواوی بکەین، وە ئەگەر کار بە قسەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بکەین و وتەی ئەو وەرگرین، ئەوا ئەو ئیحرامی نەشکاندووە، تا ئاژەڵی دیاری (هدي) نەگەیاندایەتە شوێنی خۆی، واتە: سەری دەبڕی.

چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێویست:

١ – (أبو موسى) لەیەمەنەوە دەگەڕێتەوە لەو جێگەیەی، کە باسمان کرد، بە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتووە.

٢ – ئەو ئافرەتەی (أبو موسى) چۆتە لای تا سەری بۆ بدۆزێ، یەکێك بووە لە براژنەکانی (أبو موسى)، (أبو موسى) چەند برایەکی هەبوو, لەوانە: (أبو رهم، أبو بردة) وتراویشە (محمد) وەك (إبن حجر) هێناویەتی.

٣ – لە هەندێ گێڕانەوەی (بوخاری)دا (أبو موسى) دەڵێ: "قژی بۆ شانە کردم و بۆی شۆردم" ئەمەش هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ گێڕانەوەکەی پێشوودا نییە، چونکە دەکرێ بوترێ سەرەتا قژی بۆ دۆزیوەو پاشان بۆی شۆردووەو شانەی کردووە.[٢٤٧]

کەواتە:

١ – کە مەریوان نوسیویەتی: "ژنێکم لە هۆزی (قیس) ...". باوەڕ بکەن تەنها قسەی خۆیەتی و لە هیچ گێڕانەوەکاندا باسی شتی وا نەکراوە!.

---

[٢٤٦] رواه البخاري، باب / متى يحلوا المعتمر، رقم (١٧٩٥) .

[٢٤٧] بۆ زیاتر ئاشنابوون لەم بەسەرهاتە، بڕواننە: هەموو گێڕانەوەکانی نێو (صحيح البخاری) بە ژمارەکانی: (١٥٥٩، ١٥٦٥، ١٧٤٢، ١٧٩٥، ٤٣٤٦، ٤٣٩٧) . هەروەها فتح الباري، باب/ من أهل في زمن النبي (صلى الله عليه وسلم) و راقەی فەرموودەکانی ژمارە (١٥٥٩) و ئەوانی تر.

٢ – ئەمە جگە لەوەی ئەو هەموو ناڕێکی و سەقەتییەی لە نوسینەکانی مەریواندا هەیە بۆ خۆتان بەراووردی بکەن.

من ئامۆژگاری مەریوان دەکەم، با هیچ نەبێت، گەر بە (نهێنی)یش بووە شتێ لە زمانی عەرەبی لە لای مامۆستایەکی وانەی عەرەبی یەك و دووی ناوەندی بخوێنێ، سوودی چاکی دەبێ بۆی!، هەروەها با بزانێ خەڵکی وا هەن، کە بتوانن درۆو فێڵەکانی ئاشکرا بکەن و وانەزانێ ئەم وڵاتە کەسی تیادا نییە!.

١٥٠ – لە لاپەڕە (٢٨٣ – ٢٨٤)دا، دەنوسێ: "لە حەڵاڵ و حەرام کردنی موتعەی حەجدا، دوو ڕیوایەت هەیە، یەکێکیان حەڵاڵی دەکات، کە ڕیوایەتی پەیامبەرەو ئەوەی حەرامی دەکات ڕیوایەتی عومەری کوڕی خەتتابە". پاشان ڕیوایەتی یەکەم دێنێ بە دەقە عەرەبییەکەو دواتر دەیکات بە کوردی، لە بە کوردیکردنەکەیدا چەند شتێکی بۆ زیاد دەکات، کە لە دەقە عەرەبییەکەدا بوونی نییە.

بەم جۆرە دەنوسێ: "(جابر بن عبداللە)ی صەحابی دەگێڕێتەوە, (ڕیوایەتەکە دوورو درێژە و ئێمە کەمێکیمان هێناوە) کاتێك پەیامبەرو صەحابەکان چوونە حەج پەیامبەرو تەڵحە نەبێت کەس قۆچی قوربانی پێنەبو، عەلی کوڕی ئەبی تالیبیش، لەو کاتەدا لە یەمەنەوە دەگەڕایەوە لەگەڵ خۆی قوربانی هێنابوو، پەیامبەر فەرمانیدا حەجەکەیان بکەن بە عەمرە، واتە تەوافی ماڵی خواو صەفاو مەڕوە بکەن، ڕیش و سەریان بتاشن و ژن بە خۆیان حەڵاڵ بکەن، جگە لەوانەی قۆچی قوربانییان پێیە، وتیان چۆن شتی وا دەبێت ئێمە بە ناوی حەجەوە هاتووین، داوامان لە پەیامبەر کرد خۆیشی وەك ئێمە بکات، لە وەڵامدا وتی: ئەگەر قۆچی قوربانیم پێنەبوایە، دەهاتم و ئێوە چیتان دەکرد، منیش دەمکرد، حەرامەمان حەڵاڵ کردو چووینە لای ژنەکان، هەندێك لە صەحابەکان ئەم کارەیان بەباش نەزانی، کە تێکەڵی ژنان ببین وتیان: چۆن دەبێ بچین بۆ میناو ناوچەوانمان ئاوی لێ بتکێ (واتە عارەقەی گەرمای رابواردن بە ناوچەوان و ڕوومەتماندا بێتە خوارەوە) پەیامبەر, کە ئەم قسەیەی بیست, وتی: گەر بمزانییایە ئاوهایەو صەحابەکان گومانیان هەیە، قۆچی قوربانیم لەگەڵ خۆم نەدەهێناو وەك ئەوانم دەکرد".

مەریوان, بۆ ئەم باسە ئاماژە دەدات بە (صحيح البخاري, باب/ التمتع والقران ولإفراد بالحج....).

دەڵێین:

ئێمە ئێستا دەقە عەرەبییەکە, لەو جێگەیەی مەریوان ئاماژەی پێداوە دەیهێنین:

"عن جابر أنه حج مع النبي (صلى الله عليه وسلم) يوم ساق البُدن معه، وقد أهلّوا بالحج مفرداً، فقال لهم: أحلوا من إحرامكم بطواف البيت و بين الصفا والمروة، وقصروا ثم أقيموا حلالا، حتى إذا كان يوم التروية، فأهلوا بالحج واجعلوا التى قدمتم بها متعة، فقالوا كيف نجعلها متعة وقد سمينا الحج؟ فقال: إفعلوا ما أمرتكم، فلولا أنى سقت الهدى لفعلت مثل الذي أمرتكم، ولكن لايحل مني حرام حتى يبلغ الهدي محله ففعلوا".[٢٤٨]

واتە: لە حەجی ماڵئاوایدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وشتری دیاری بەیتی لەگەڵ خۆی برد، من لە خزمەتیدا بووم، لەو کاتەدا حەجکاران بەس ئیحرامیان بە حەج دابەستبوو (کە پێی دەوترێ ئیفراد) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون: حەجەکەیان هەڵبوەشێننەوە (واتە بیکەن بە عەمرە) بەم شێوەیە: تەوافی بەیت و سەعی نێوان سەفاو مەڕوە تەواو بکەن و مووی سەرتان کورت بکەنەوە، ئیتر لەم ماوەیەدا بەبێ ئیحرام لە مەککە بمێننەوە، هەتا ڕۆژی تەروییە (کە ڕۆژی هەشتەمی مانگی ذى الحجة)یە، ئەوسا سەر لە نوێ ئیحرام بە حەج دابەستنەوەو ئەوەی، کە لە پێشدا ئیحرامتان بۆ بەستبوو بیکەن بە عەمرە، لەم ماوەدا هەتا ڕۆژی تەروییە, پشوو وەرگرن و بیکەن بە حەسانەوە (واتە قەدەغە کراوەکانی ئیحرامتان لەسەر نییە، چونکە ئیحرامیان شکاندووە) جا ئەوانیش وتیان: چۆن بیکەین بە عەمرەو پشوو وەربگرین، خۆ ئێمە ناوی حەجمان لە سەرەتاوە لێناوە؟ فەرمووی: چیتان پێدەڵێم ئاوها بکەن، خۆشم لەبەر ئەوە نەبێ، کە ئاژەڵی دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم هێناوە، هەمان شتم دەکرد, کە بە ئێوە دەڵێم بیکەن، بەڵام ئەو شتانەی بە هۆی ئیحرام بەستنەوە لێم قەدەغە کراوە, بۆم ڕەواو حەڵاڵ نابنەوە، هەتا ئاژەڵی دیارییەکان نەگەنە شوێنی

---

[٢٤٨] صحيح البخاري، باب/ التمتع والقران والافراد بالحج... رقم (١٥٦٨).

خۆیان (کە ڕۆژی دەی ذی الحجة دەکات و سەر دەربڕدرێن)، ئیتر ئەوانیش بە قسەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان کرد.

کەواتە:

١- وەك لە پێشەوە باسمان کرد "تەمەتوع" لە حەجدا (متعة الحج) ئەوەیە، کە حەج و عەمرەکە تێکەڵاو دەکرێ لە مانگەکانی حەجدا، کە پێی دەوترێ: "تەمەتوعی قیڕان" بەو جۆرەش دەوترێ، کە ئیحرام بە عەمرە دەبەسترێ و کارەکانی عەمرە تەواو دەکرێو پاشان ئیحرام دەشکێنرێ و ماوەیەك پشوودانو پاشان لە ڕۆژی هەشتەمدا ئیحرام بە حەج دادەبەستێ، زیاتر کە زانایانی فیقه باسی تەمەتوعی حەجیان کرد بێت, مەبەستییان ئەم جۆرەیانە[٢٤٩].

٢- چەند جارێکی تریش باسمان کردووە، مەریوان بە لەفزی "متعة" هەڵخەڵەتاوە!، خەیاڵی سێکسیی ئەو وایە, هەرچی باسی (م ت ع ) بکات, یەعنی "متعة"ی مارەیی کاتی، ئەمەش لاوازییەکی تری توانای زانستیی و عەقڵی مەریوانە!.

٣- مەریوان چەند شتێکی زیاد کردووە:

أ- "ڕیش و سەر ...." باسی ڕیشی تیا نییەو بابەتی ڕیشیش لە حەجدا نییە.

ب- وشەی "بتاشن" نییە، بەڵکو "کورتکردنەوە"یە، ئەمەش جیاوازییان زۆرە.

ج- "شت و ژن بە خۆیان حەڵاڵ کەن". گەر مەبەستی ئەم دەستەواژەیە ئەوانە بێت، کە لە کاتی ئیحرامدا کەسی حاجی لێی قەدەغەیە، لەوانە ژنی خۆی؟ ئەمە تەواوە، دەنا تەنها قسەی گیرفانە دڕاوەکەی خۆیەتی!.

د- "حەرامِمان حەڵاڵ کردو چووینە لای ژنەکان" بوختانێکی ڕوون و ئاشکرایە، سەرەڕای ئەوەی نەفامیی و سێکسبازیی مەریوان دەردەخات.

هـ- "هەندێك لە صەحابەکان ئەم کارەیان... کە تێکەڵی ژنان.... ". یەکپارچە درۆیە، شتی وا لە هەموو (صحيح البخاري)دا بوونی نییە.

و- بەکورتی، بەڵکو ئەوەی هاوەڵان لایان گران بوو, ئەوە بوو, کە ئەمان نییەت و ئیحرامییان بە حەج دابەستووە، ئێستا گەر بیکەن بە عەمرە, چۆن دەبێ, پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆی ڕوونکردونەتەوە, ئەگەر ئەویش ئاژەڵی دیاریی نەهێنایە هەر وای دەکرد، بەڵام دەستور وایە ئەو کەسەی نییەتی حەج بێنێ و ئاژەڵی دیاریی لەگەڵ خۆی بەرێ بۆ مەککە، بۆی نییە تا لە (دەی ذی الحجه) ئاژەڵەکە سەر نەبڕێ, ئیحرام بشکێنێ.[٢٥٠]

ز- من ئێوە دەکەمە دادوەر, ئەو دەقە عەرەبییەی، کە نووسیومان تا چەند لەگەڵ نووسینەکەی مەریواندا یەکدەگرێتەوە، سەرنج بدەن چەواشەکاریی و بوختان و درۆ وخەیاڵە سێکسییەکانی مەریوان ببینن!.

١٥١- لە لاپەڕە (٢٨٤ - ٢٨٥)دا، دەقێك دێنێ و دەڵێ: "ئەمەش ڕیوایەتی حەرامکردنەکەیەتی، کە سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خەلافەتی عومەر".

دەڵێین:

ئەوەی، کە عومەر نەهی لێکردووە لە بارەی (متعة الحج)ەوە, مەبەست لەو جۆرەیە، کە نییەتو ئیحرام دابەستنەکە بۆ حەج و عەمرە پێکەوە بێت، نەك (متعة) سێکسییە فراوانەکەی مێشکی مەریوان.[٢٥١]

چونکە، وەك زانایان دەڵێن: "بۆیە عومەر ئەم جۆرەی پێناخۆش بووە، چونکە حەزی کردووە بەردەوام خەڵکی بێن بۆ سەردانی ماڵی خواو ساڵی دوو جار, خەڵکی سەر لەو جێگەیە بدەن، جارێ بۆ حەج و جارێ بۆ عەمرە".[٢٥٢]

[٢٤٩] بڕوانە: بڕگەی (١٤٥) پێش کۆتاییەکەی (ڕوونکردنەوەیەکی پێویست).

[٢٥٠] بڕوانە: فتح الباري, ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە ( ١٥٦٨) و (١٧٨٥).

[٢٥١] بۆ جیاوازی زانایان لە بارەی حەج کردن لە سەر شێوەی (تمتع), هەروەها بڕوانە: المحلى، ج، ص٥٧-٦٢, ٧٠, ١٠١. ١٠٥.

[٢٥٢] بڕوانە: تفسير القرطبي، ج ٢، ص ٣٨٨ و ٣٩٢.

ڕوونکردنەوەیەك:

زانایان ڕا جیاییان هەیە، بۆچی بەو جۆرە حەجەی، کە دەوترێ "تەمەتوع" و ئەو کەسەی بەو جۆرە ئەم حەجە دەکات دەڵێن: "موتەمەتیع"؟.

(ابن القاسم) دەڵێ: "بۆیە وای پێوتراوە، چونکە کاتێ ئەو کەسە کارو باری عەمرە تەواو دەکات، ماوەیەك پشووی هەیە، تا ئەو کاتەی ئیحرام بە حەج دەبەستێ".

کەسانی تریش، جگە لەو، وتویانە: "بۆیە وای پێیدەوترێ، چونکە بەیەك سەفەر ئەوەی لە کۆڵ دەکەوێت جارێکی تر بێتەوە بۆ سەردانی مەککە". بەڵام (قورتوبی) دەڵێ: "بۆچوونی یەکەم گشتگیر ترە، چونکە لەو ماوەی پشووەدا هەرچی بەهۆی ئیحرامەوە لێی قەدەغە بووە، بۆی ڕەواو حەڵاڵ دەبێ".[٢٥٤]

تەواوکارییەك:

ئەو جۆرە تەمەتوعەی حەج، کە هەموو زانایان یەکدەنگن لە سەری، هەروەها لە ئایەتی ﴿ فمن تمتع بالعمرة الى الحج.... ﴾ البقرة /١٩٦شدا ئاماژەی بۆ کراوە، ئەوەیە، کە لە مانگەکانی حەجدا ئیحرام بە حەج و عەمرە پێکەوە دەبەستێ، ئەویش چەند مەرجێکی هەیە:

١- دەبێ حەج و عەمرەکە پێکەوە کۆ بکرێتەوە. ٢- بە یەك سەفەر بێت. ٣- لە یەك ساڵدا بێت. ٤- لە مانگەکانی حەجدا بێت (ذو القعدة، ذو الحجة، دەیەی یەکەمی شەوال). ٥- کرداری عەمرەکە پێش بخرێت. ٦- تێکەڵاوییان نەکات، واتە: سەرەتا ئیحرام بە عەمرە ببەستێ و پاش تەواو بوون، ئینجا ئیحرام بە حەج دابەستێ. ٧- دەبێت هەردوو کاری عەمرەو حەجەکە یەك کەس ئەنجامی بدات. ٨- خەڵکی دەرەوەی شاری مەککە بێت.[٢٥٥]

پەیوەندی ئەمە بە باسەکەوە گەلێ گرنگە، چونکە ئەو "متعة الحج"ی مەریوان دەستکاریی تێدا کردووە و وای دەرخستووە، کە بریتییە لە یەکپارچە سێکس و جووتبوون، وەهانییە، بەڵکو "متعة الحج" شتێکە بەدەر لەو بۆچوونە سەقەتانە، "موتعەی حەج" کارێکە پەیوەندی بە خودی پایەکانی (حەج) و (عەمرە)وە هەیە، نەك درامای سێکسیی و خەیاڵی سەقەتی مەریوان، کە هەموو شتێ لە چوار چێوەی جەستەی ئافرەتدا دەخوێنێتەوەو دەبینێ!.

١٥٢ - لە لاپەڕە (٢٨٥)دا، لە باسی موتعەی تەڵاقدراو، بە نەزانیی خۆیی و ئارەزووە سێکسییەکەی خۆی، دەیەوێ وا لە خوێنەر بگەیەنێت، کە "موتعة" چەند جۆرێکە، بەڵام ئەو پێی خۆش بێت، یان نا، زانست و بەڵگەکان لەگەڵ مەریواندا نین، پاشان هەندێ ئایەتیش بە عەقڵە کورتە تۆز لەسەر نیشتووەکەی دێنێ و ڕاڤەی دەکات، بێئەوەی لەم بەشەدا ئاماژە بەیەك سەرچاوە بکات.

١- ئایەتی: ﴿لا جناح عليكم إن طلقتم النساء مالم تمسوهن أو تفرضوا لهن فريضة ومتعوهن على الموسع قدره وعلى المقتر قدره متاعاً بالمعروف حقا على المحسنين﴾ البقرة /٢٣٦. پاش ڕاڤە کردنەکەی، دەنوسێ: "شوێنی وشەی موتعە لە ئایەتەکەدا (ومتعوهن على الوسع قدره)، لەم بەشەدا موتعە بە مانای بەخشیش دێت، بەخشیشی مێردێك بۆ ژنەکەی خۆی، کە پێش ئەوەی بچێتە لای و لەگەڵی ڕابوێرێ تەڵاقیداوە".

دەڵێین:

پێشەکی زانایان ئاوها پێناسەی "موتعەی نیکاح"یان کردووە:

(ڕاغب ئەسفەهانی) دەڵێ: "مەتاع و موتعە، بەو شتە دەوترێ، کە دەدرێ بە ئافرەتی تەڵاقدراو، تا لە ماوەی عیدەکەیدا سوودی لێ ببینێ".[٢٥٦]

---

[٢٥٤] تفسير القرطبي، ج ٢، ص ٣٩٥ .

[٢٥٥] تفسير القرطبي، ج ٢، ص ٣٩١ .

[٢٥٦] مفردات الفاظ القران، مادة /متع .

(إبن حزم) دەڵێ: "موتعە، فەرزو پێویستە لەسەر هەر پیاوێك، كە ژنەكەی تەلاق بدات، جا یەك یان دوو، یان سێ تەلاقی بدا, چوبێتە لای یان نا، مارەیی بۆ دانابێ، یان نا، پێویستە لەسەر پیاو موتعەی ژنەكەی بدات، دادوەر (حاكم) زۆر لە پیاوەكە دەكات لەسەر ئەمە، جا پیاوەكە پێی خۆش بێت، یان پێی ناخۆش بێت".[٢٥٧]

وە ئەم ئایەتە لەسەر پیاوان پێویست دەكات، كە ئەو كارە بكەن، ئەمەش بۆچونی (ابن عمر، علی بن أبی طالب، حسن بن أبی الحسن، سعید بن جبیر، أبو قلابة، زوهری، قتادة، ضحاك بن مزاحم)ە.[٢٥٨]

ئەوەی بوتری "موتعە" لە سەر پیاوان پێویستە (واجب)، ئەمە شیاوترو پەسەند ترە، وەك پێشەوایان (إبن حزم) و(قورتوبی) باسی لێدەكەن.[٢٥٩]

كەواتە:

١- قسەی مەریوان، كە دەڵێ: "موتعە بەمانای بەخشیش دێت، بەخشیش ...هتد". لە گیرفانە ڕزیوەكەی خۆی بە كۆڵێ تەپو تۆزەوە دەریهێناوە، هیچ كاتێكیش نەبووە قسەی كەڵە زانایانی وەك (راغب) و (ابن حزم) و (قورتوبی) و كەسانی وەك ئەوان, بەرابەری پێ بكرێ بە سەر قسەی كەسێكی عاشق بە سێكسیی ئافرەت و جەهل و سەر لێشێواویدا!.

٢- ئەم پەیامە ڕێزی ئافرەت دەردەخات، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان جیا بۆوە، واجب كراوە لەسەر پیاو، دەبێ شتێكی بداتێ, كە هیچ نەبێ لە ماوەی سێ مانگدا بتوانێ خۆی پێ بژیەنێت، نەك ئەوەی مەریوان پێیوایە ئەم خۆشیی و لەزەت دەدات بە پیاو و بە خراپەش بگەڕێتەوە بۆ ژن (وەك لە كتێبەكەیدا لاپەڕەكانی ٢٨٦و ٢٨٧دا دەڵێ)، چ "ڕێباز و مەریوان"ێك دەستوری وا ڕێك دەتوانێ دابنێ بۆ ئافرەتێك, كە بە هەر هۆیەك بووە, ناتوانێ لەگەڵ مێردەكەی هەڵكات، ئەزانم مەریوان و ئەو كەسانەی وەك ئەو وان, دەڵێن: "جا قەیچێكە با ئافرەتەكە بچێت لە ....... پارە پەیدا بكات و بژێویی خۆی دابین بكات!".

٣- گەر چی لە ئەندازەی ئەو برە شتەدا، كە پیاوەكە پێویستە لە سەری بیدات بە ژنەكە، زانایان ڕای جیا جیایان هەیە، كە ئەمە مەبەستی سەرەكی ئێمە نییە لێرەدا، بەڵكو ئەوەی مەبەست بێت بە هەڵەدا نەچوونی خوێنەرە لە وڕێنەرەكانی مەریوان.

٤- وشەی "ومتعوهن" مەبەست لەوەیە، كە ئافرەتەكە دەبێ سوودمەند بێت لێی و ئەو ماوەیەی پێ بباتە سەر.[٢٦٠]

١٥٣- لە لاپەڕە (٢٨٧)دا, ئایەتی ﴿وللمطلقات متاع بالمعروف حقا على المتقين﴾ البقرة/ ٢٤١، دێنێ و وا ڕاڤەی كردووە "بۆ ژنانی تەلاق دراو بڕێك سامان وپارە پێویستە ......".

دەڵێین:

ئەمە ڕاستێتی قسەكەی ئێمە دەردەخات، كە لە سەرەتاوە باسی "موتعە"مان كرد، نەك گومانە لێڵاوییەكەی مەریوان، چونكە زانایان یەكێك لەو بەڵگە قورئانییانەی دەیهێننەوە بۆ پێویست (واجب) بوونی "موتعە" ئەم ئایەتەیە.[٢٦١]

١٥٤ - لە هەمووی سەیرتر, مەریوان لە لاپەڕە(٢٨٧)دا, ئاوها ڕاڤەی ئایەتی: ﴿ یاایها النبي قل لأزواجك اِن كنت تردن الحیاة الدنیا و زینتها فتعالین أمتعكن و أسرحكن سراحاً جمیلاً ﴾الاحزاب/ ٢٨. دەنوسێ: "ئەی پەیامبەر بە

---

[٢٥٧] المحلى، ج١١، المتعة مسألة ( ١٩٨٨).

[٢٥٨] تفسیر القرطبی، ئایەتی ٢٣٦ البقرة المسألة السادسة .

[٢٥٩] بڕوانە: المحلى، ج١١ المسأله (١٩٨٨)، تفسیر القرطبی، ئایەتی ٢٣٦ البقرة المسألة السادسة.

[٢٦٠] بڕوانە: تفسیر الجلالین، تفسیر القرطبی, ئایەتی ٢٣٦ البقرة المسألة السابعة .

[٢٦١] بڕوانە: هەموو ئەو سەرچاوانەی لەم بارەوە نوسیومانن.

هاوسەرانت بڵێ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیاو ڕازاوەییەکەیتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارەو سامانتان پێببەخشم، لەوە دواش تەڵاقتان بدەم و بە جوانترین شێوە دەستبەردارتان ببم".

دەڵێین:

قسەی ئێمە لە سەر ئەو نوسینەیەتی، کە نوسیویەتی: "وەرن با هەندێك شت و مەك و پارەو سامانتان پێببەخشم" (أمتعكن).

من دەڵێم ئەمە تەنها قسەی مەریوانە، دەنا گەر ئەو کەسێکی هەق بێژەو ڕاستی ئاشکرا دەکات (کە ئەمە تەنها لەودا بوونی نییە) بۆ ئاماژەی بە تەنها یەك سەرچاوەی ئەم ڕاڤە سەقەتەی نەکردووە؟!!

(ابن كثير)، لە بارەی "أمتعكن" دەنوسێ: "بێن با مافەکانی خۆتان بدەمێ". "أي أعطيكن حقوقكن".[٢٦٢]

مەریوان، وا دەزانێ ئەو خەڵکە نانی بە شاخەوە خواردووە، نە ئاوەدانییان بینیوە و نە کتێب، خەڵکانێك زۆر لەوە ژیرترن نەخوێندەوارێکی بێ شەهادەو دەروون نەخۆش بیان خەڵەتێنێ.

١٥٥ – لەمە سەیرتر، مەریوان لە لاپەڕە (٢٨٦)دا, لە ئایەتی (٤٩)ی سورەی (الاحزاب) بەشی "فمتعوهن" نوسیویەتی: "هەندێك دیارییان پێشکەش بکەن".

دەڵێین:

قوڕ بەسەر ئەوەی گوێ بۆ قسەو (تحليل)ەکانت دەگرێت، کەی "موتعەی تەڵاق" دیارییە؟، بەڵکو گەر مێردەکە نەیدا (حاكم) بۆی هەیە بە زۆری ..... لێی بستێنێ، وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

١٥٦ – لە لاپەڕە (٢٨٧)دا, لە باسی "موتعەی ژن"دا, ئایەتی (٢٤ی سورەتی النساء) دێنێو بەم جۆرە ڕاڤەی دەکات: "جگە لە کەنیزەك و ئەوانەی کە باسکران بڕیاری خوا لەسەرتانە و حەڵاڵکراوە بۆتان، ماڵو داراییتان لە داوێنپاکەکاندا، نەك لە داوێن پیسەکان، خەرج بکەنو پاشان ئەوەی لەگەڵیان ڕادەبوێرن و چێژیان لێوەردەگرن ئەو کرێیەیان بدەنێ، کە لەسەری ڕێککەوتوون، هیچ گوناهیشی تێدا نییە، دوای تەواوبوون و پێدانی کرێکەی, جارێکی دی لە نێوان خۆتان دا ڕێکبکەونەوە ....".

دەڵێین:

ئەمە دەقی ئایەتەکەیە ﴿ والمحصنات من النساء إلا ما ملكت أيمانكم كتاب الله عليكم وأحل لكم ما وراء ذلكم أن تبتغوا بأموالكم محصنين غير مسافحين فما استمتعتم به منهن فآتوهن أُجورهن فريضة، ولا جناح عليكم فيما تراضيتم به من بعد الفريضة إن الله كان عليماً حكيماً ﴾ النساء/٢٤.

ئەمەش واتاکەیەتی بە کوردی:

"هەروەها ئەو ئافرەتانەشی، کە مێردییان هەیە, قەدەغە کراوە لەسەرتان بیهێنن، جگە لەو ئافرەتانە نەبێت، کە لە جەنگدا دەستتان دەکەوێت، ئەم قەدەغە کردنی ئافرەتانە بڕیارو فەرزێکە خوا لەسەر ئێوەی داناوە، ئیتر لەپاش ئەمانە (واتە ئەوانەی کە لە ئایەتەکەی پێشوودا باسکران، لە ئایەتی پێش ئەم ئایەتەدا, باسی کۆمەڵی ئافرەت دەکات، کە لە سەر باوەڕداران حەرامن. (حرمت عليكم أمهاتكم ........ ٢٣ النساء) بۆتان ڕەوایە، کە بە هۆی ماڵ و سامانەکانتانەوە بچن بگەڕێن ئافرەت بخوازن، تا ببنە خاوەن هاوسەرو داوێن پیس نەبن، کەوایە گەر چێژو خۆشیتان وەرگرت لێیان بە نیکاحی دروست, ئەوا ئەو مارەییەیان بدەنێ کە دیاری کراوە، وە هیچ خراپەیەکتان لەسەر نییە، گەر خۆتان لە نێوان خۆتاندا ڕازی بوون, واتە پیاو و ئافرەتەکە لە پاش دیاری کردنی مارەییەکە، مارەییەکە، کەمبکەنەوەو لێی دابشکێنن لە ئەندازەکەی، یاخود لایبەرن, بەڕاستی خوا زاناو دانایە".[٢٦٣]

بەڕێزان:

---

[٢٦٢] ابن كثير، ئایەتی ٢٨ الاحزاب .

[٢٦٣] بڕوانە: تفسير الجلالين، قورتوبی، إبن كثير، مختصر تفسير الطبري، روائع البيان في تفسير ايات الاحكام من القران (محمد علی صابونی).

١ – بڕوانن لەو جیاوازییەی لەنێو ڕاڤەکەی ئێمە، کەپشت بەستووە بەو سەرچاوانەو ڕاڤە سەقەتەکەی مەریوان, کە پشت بەستووە بەخولیای سێکسیی خۆی، چەندە جیاوازیان زۆرە! بۆ ڕوونی سەقەتی ڕاڤەکەی مەریوان ئەمانە دەنوسین:

أ– ڕاڤەی "المحصنات" لە سەرەتای ئایەتەکە نەکراوە.

ب– "جگە لە کەنیزەك" ئەم ڕاڤەیە بۆ "ما ملکت ایمانکم" سەقەتە تاسەر ئێسقان، ئەمە ڕای مەریوان خۆیەتی.

٢– "محصنین غیر مسافحین" مەریوان وای زانیوە (سیفەتی ئافرەتە), ئەمەش زۆر سەقەتە, چونکە:

أ– بۆ مێینە دەوترێ "محصنات غیر مسافحات" هەرواش لە قورئاندا دەربڕدراوە، بۆ نمونە: خوای گەورە لە ئایەتی (١٢٥)ی سورەی (النساء) بۆ مێینە وا دەفەرمێت، هەروەها بۆ مێینە "محصنات" هاتووە، بڕوانە ئایەتی (٥)ی سورەی (المائدة)، هەروەها ئایەتەکانی (٤ و٢٣)ی سورەی (النور)، هەروەها چەندین جێگەی تر.

ب– (قورتوبی) دەڵێ: "محصنین غیر مسافحین" دوو بۆچوون هەڵدەگرێت:

یەکەمیان، واتە هاوسەرگیریی و دوور لە داوێن پیسی, بە ڕێگەو گرێبەستی نیکاح، واتاکەی وای لێ دێتەوە: ئێوە ئەی پیاوان دەستی خۆتان بخەنو بگەڕێن بۆ چێژ وەرگرتن لە ئافرەت بەماڵ وسامانتانەوە, بەڕێگەی نیکاح و هاوسەرگیریی، نەك لە ڕێی داوێن پیسییەوە.

دووەمیان: هەڵدەگرێ "محصنین" سیفەت بێ بۆ ئافرەت، بەڵام بۆچوونی یەکەم شیاوترو گشتیترە، چونکە لە سەر بۆچوونی دووەم وا دەبێت, کە زیناکارەکان حەڵاڵ نەبێ نیکاحیان، ئەمەش پێچەوانەی کۆڕای زانایانە.[٢٦٤]

٣– "دوای تەواو بوونی و پێدانی کرێکە.....هتد" پێچەوانەی دەق و وتەی زانایانە، چەندین بزرکاندنی تریش، گەر سەرنج لە ڕاڤەکەی ئێمە بدرێ بۆ ئایەتەکە, ئەو خەڵافاویانەی مەریوان دەردەکەوێ.

١٥٧– وەرن بادرۆیەکی تری مەریوان ئاشکرا بکەین، لە لاپەڕە(٢٨٨)دا, ئەم دەقە دەهێنێ: "قال: سألت ابن عباس عن متعة النساء قال: اما تقرأ سورة النساء ؟ قال: قلت: بلى، قال: فما تقرأ فيها فمااستمتعتم به منهن الى أجل مسمى؟ قلت: لا، لو قرأتها هكذا ماسئلتك، قال: فانها كذا". پاشان وەك سەرچاوە دەنوسێ: (صحيح البخاري، كتاب النكاح، باب نهى رسول الله عن المتعة) .

دەڵێین:

درۆزن ئەگەر شەرمیشی نەما، ئەوا دەستی لێ بشۆ!. بەڕێزان، ئەوە (صحيح البخاري) باوەڕ بکەن شتی وابوونی هەرنییە، من وا دەزانم مەریوان لە ڕووی دەروونییەوە زۆر نەخۆش بێت، دەنا چۆن شتێ لە جێگەیەکدا نەبێت, دەنووسێ لەوێدا هەیە!؟.

بیرەوەرییەك:

بیرم دێ لە ڕاپەڕینەکەدا، پێشمەرگە لە کەرکوك کشابوونەوەو هەر هێزبوو دەهاتنە ناوشار, خەڵکیش شپرزەو جارجارەش دەنگی تۆپ دەهات، سلێمانی ببووە هەڵاو هاوار, دەنگۆ وا بڵاوبوەوە, کە (عزت ابراهيم) گیراوەو وا لە (مزگەوتی عەلی کەمال), هەندێکی تریش دەیانوت: لە قوتابخانەیەکدا لە نزیك ئەو مزگەوتە دەستبەسەرە، بە هەرحاڵ ئەوەی ئێستاش سەرنجی ڕاکێشاوم, ئەوەبوو ئافرەتێکی خەڵکی گەڕەك و هەم ناسیاو، بە شپرزەیی هات و وتی: فڵانە کەس گیراوەو بەم چاوانەی خۆم بینیومە، تەنانەت پارچە ئێسقانێکیشم بۆ فڕێداوەو پێموتووە "پشە سوور, هابخۆ بە دەردت بێ.....", بەڵام هێشتا ئێوارە دانەکەوتبوو, خەڵکی بۆیان دەرکەوت ئەم قسانە درۆیە، کەوتنە ماڵپێچانەوە بۆ ڕاکردن بەرەوسنورەکان، چونکە حکومەتی بەعس بەرەو سلێمانی دەکشا، پاڵەوانی مەیدانیش ئەوکەسە بوو بۆی دەرچی!.

[٢٦٤] القرطبي، ئایەتی ٢٤ النساء, المسألة السادسة.

ئای لەو ڕۆژەی، درۆکانی مەریوانیش بەچەشنی ئەودرۆیانە بۆخەڵك ئاشکرا دەبێت، بەڵام بەلای مەریوانەوە, ئەمانە هیچ نین, چونکە شتێك نییە لای ئەو بەهاو پیرۆزی هەبێت, بەتایبەتی شتێکی بەنرخی وەك (شەرم و شکۆ)! .

١٥٨– لە لاپەڕە(٢٨٩–٢٩٠)دا، لە باسی مانای گشتی (المحصنات وما ملکت ایمانکم) دەدویٚ و لە سەر وشەی (المحصنات) دەنوسیٚ: "واتە: داوێن پاکەکان، مەبەستی ئەو ژنانەیە، کە عەورەتی خۆیان لە زینادا پاراستوە....بەپێی ڕاڤەکان کە هەموویان لە سەر ئەوە هاوڕان، ئەگەر ژنێك (١٠٠)ساڵ و زیاتر، یان تەنها یەك جار لەگەڵ مارەبڕێکی خۆیدا نووستبێت وسێکسی حەرامی نەکردبێت، ئەوە پێی دەڵێن ژنی داوێن پاك (محصن) بەپێی ئەم ئایەتە (کچ) ناکەوێتە ناو ئەم حوکمەوە, چونکە شوی نەکردووە".

دەڵێین:

١– "المحصنات" لەم ئایەتەدا, واتە: ئایەتی (والمحصنات من النساء..) النساء ٢٤، مەبەست ژنێکە پیاوی هەبێت، جا چووبێتە لای یان نا، ئەمە ڕاڤەکاران وا ڕاڤەی دەکەن، بێئەوەی بچن بەلای ئەوەی ئەو ژنە مێرددارە، داوێنپاکە, یان زیناکار.[٢٦٥]

٢– لە واتای "محصن" زۆر بە هەڵەدا چووە, کاتێك کە تەنها تایبەتی کردووە بە (داوێنپاك) (ژنی شووکردووی داوێنپاك) ئەمە دوورە لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکانەوە، چونکە لە سەرچاوە متمانە پێکراوەکاندا, وشەی "محصن" بەم واتایانە هاتوە:

أ– ئافرەتی مێردار، وەك لە ئایەتی (٢٤ النساء)دا هەیە, بێئەوەی باسی داوێنپاك، یان پیسبکات.

ب– داوێنپاك، وەك لە ئایەتی (٢٥ النساء)دا هەیە.

ج– ئافرەتی ئازاد، واتە: ژێردەستە نەبێت، وەك لە ئایەتی (٥/المائدة)دا هەیە.

د– واتە (ئیسلام) گەرچی ئەمەیان لە قورئاندا نەهاتووە، بەڵام لەفەرموودەی ساغدا هاتووە.[٢٦٦]

٣– کە مەریوان دەڵیٚ: "بە پێی ڕاڤەکان کە هەمویان ......پێی دەڵێن ژنی داوێن پاك". قسەی خۆیەتی و ئەو مەرج و شەرتانە, بەس مەریوان قسەی لەسەر کردووە، دەنا ئەگەر ڕاستی دەکرد, سەچاوەیەکی متمانەپێکراوی هیچ نەبوایە دەهێنا، کەواتە ئەو قسەیە "قەڵبە", ماڵی "قەڵب"یش سەری بێمێشکی خاوەنەکەیەتی!

١٥٩– لە سەر وشەی "ماملکت ایمانکم" لە لاپەڕە(٢٩٠)دا، دەنوسێت: "واتە: ئەو ژنانەی کە کەنیزەکتانن وکۆیلەو موڵکی خۆتانن, ئەمانە داوێن پاکنین، چونکە نەیانتوانیوە عەورەتی خۆیان بپارێزن......".

دەڵێین:

واتاکردنی "ماملکت ایمانکم" زۆر سەقەتە, وەك لە پێشیشەوە باسمان کرد، واتاکەی ئەمەیە "ئەو ئافرەتانەیە، کە لە جەنگدا دەست موسڵمانان دەکەوێت و مێردیشیان هەیە, بەڵام مێردەکانیان (مشرك)ن".[٢٦٧]

ئەوەی ئەم بۆچوونەش بەهێزدەکات، هۆی هاتنە خوارەوەکەیەتی، کە کاتێك لە ڕۆژی غەزای (حونەین)دا, پێغەمبەر دەستەیەك لە سوپاکەی نارد بۆ (أوطاس)... . پاشان سەرکەوتن بە سەردوژمناندا و چەندین ئافرەتیشیان بە دیل گرت، هەندیٚ لە هاوەڵان بە لایانەوە گران بوو, کە بچنە لایان, چونکە هاوسەریان هەبوو لە بێباوەڕەکان (واتە ژنەکان ژنی بێباوەڕەکان بوون) جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی نازڵ کرد: (والمحصنات من النساء الا ماملکت ایمانکم.....).[٢٦٨]

---

[٢٦٥] بڕوانە: تەفسیر الجلالین، قورتوبی، ابن کثیر، ئایەتی ٢٤ النساء .

[٢٦٦] تفسیر القرطبی، ئایەتی ٢٤ النساء, المسألة الاولی، والنهایة فی غریب الحدیث والاثر، ج١ مادة(حصن)، والرسالة للشافعی, الفقرة ٣٩٢، ولسان العرب والتفسیر الکبیر، ج ١٠, ص٣٩.

[٢٦٧] تفسیر الجلالین، قورتوبی, ئایەتی ٢٤ النساء.

[٢٦٨] صحیح مسلم، کتاب الرضاع، باب/ جواز وطء المسبیة بعد الاستبراء........رقم(١٤٥) .

واتە: "ئەو ئافرەتانەی، کە مێردیان هەیە لێتان حەرامن، جگە لە وانەیان نەبێ، کە لە شەڕدا دەگیرێن".[٢٦٩]

١٦٠– لە لاپەڕە (٢٩٠)دا، لە بارەی "موتعە"وە, دەنوسێت: "هەر کات خاوەندار, ویستی موتعە لەگەڵ کەنیزەکێکی خۆی بکات پێویستی بە مە نەبووە بزانێ داوێن پاکە، یان نا، تەنها ئەوەندە بەس بوە کە کەنیزەک بوە، کچ بێت یا کوڕ، مێردی هەبێت یان نا........".

دواتر وەك سەرچاوە دەنوسێت (صحيح البخاري وتفسير الجلالين وابن كثير......).

دەڵێین:

ئەگەر مەریوان وا بزانێت, کاتێك خەڵکی ئەم دەستەواژانەیان بینی, ناگەڕێنەوە سەر ئەو سەرچاوانە، ئەوا خەیاڵی, نەك خاوە، بەڵکو بابزانێ، خەڵکی سەیریشیان دەکات و بە درۆکانی هەڵناخەڵەتێن، ئەوە بۆ مەریوان ئەو ئەرکەشی نەکێشا، تەنها نمونەیەکی لەو سەرچاوانەدا, بۆ خوێنەر نەهێناو نەنوسی, کە "خاوەندار موتعە لەگەڵ کوڕدا بکا"؟!

من دەڵێم, لەوانەیە ئەم نوسینانەی کاتێك نووسی بێت، کە لەوپەڕی مەستی و خەیاڵی سێکسیدا بوو بێت, دەنا کەسی ژێر شەکری وا قەت ناتوێنێتەوە!.

١٦١– لە لاپەڕە (٢٩١)دا, دەنوسێ: "بەپێی ڕاوییەکان, هەر کەنیزەکێك لە بازاڕەکاندا بفرۆشرێت، بەو فرۆشتنە تەڵاقی لە مێردەکەی کەوتووە".

پاشان لە پەراوێزەکەدا, ئەم دەقەی نووسیوە: "اذا بيعت الامة ولها زوج فسيدها احق ببضعها".

دەڵێین:

١– "بەپێی ڕاوییەکان..". ئەمە تەنها قسەی خەیاڵدانی پڕ سێکسیی مەریوان خۆیەتی، چونکە:

أ– ئەم بابەتە واتە: تەڵاق کەوتنی کە نیزەك بە فرۆشتن، لە نێوان زانایاندا جیاوازی هەیە، کە ئایا بە تەڵاق دادەنرێ یان نا؟، کەواتە, بابەتەکە بەو ڕەهاییەی مەریوان نییە, کە باسی کردووە.

ب– جەماوەر (جمهور)ی زانایان لە سەر ئەوەن, کە بە فرۆشتنی کەنیزەك تەڵاقی پێناکەوێ, ئەمە بۆچوونی گەلێك لە هاوەڵانیشە، وەك (عمر بن خطاب), (عبدالله ی کوڕی عومەر), (عروة بن مسعود) و کەسانی تر, ئەم بۆچوونەش پەسەندە.

ج– هەتا پێشەوا (بخاری) لە صەحیحەکەیدا, سەر باسێکی نووسیووە, بە ناونیشانی: (لايكون بيع الامة طلاقاً) بە هیچ جۆرێك فرۆشتنی کەنیزەك تەڵاق ناگەیەنێت. پاشان بەسەرهاتەکەی (بريرة) دەهێنێ.[٢٧٠]

٢– ئەو دەقەی، کە مەریوان نوسیویەتی, لەگەڵ نووسینەکەیدا یەك ناگرێتەوە, چونکە واتای دەقەکە ئاوایە: "ئەگەر کەنیزەك فرۆشراو مێردی هەبوو, ئەوا خاوەن (سيد)ەکەی شیاوترە بەو مارەییەی بۆی دادەنرێ".

١٦٢– لە هەمان لاپەڕەدا، دەنوسێ: "(ابن عباس) دەڵێ: بە پێنج شت تەڵاقی کەنیزەك لە مێردەکەی دەکەوێت....".

پاشان وەك سەرچاوە, ئەمە دەنوسێ: (صحيح البخاري، كتاب النكاح, الطلاق)....تاد).

دەڵێین:

١– بەڕێزان باوەڕ بکەن (صحيح البخاري), تەنانەت بە شەرحە گەورەکەی (ابن حجر)یشەوە لەسەری گەڕاوم, شتی وام نەبینی، کە مەریوان نوسیویەتی, جا نازانم تۆ بڵێی (مەریوان) خۆی "صحيح"ێکی خۆی هەبێت، بە سیلسیلەی سەنەدی خۆی, بچێتەوە سەر (بخاری)؟!، پەنا دەگرم بەخوا, لەوەی کە نەزانێکی وەك مەریوان, هەر بشزانێ "سەنەد" چییەو چۆنە؟!.

---

[٢٦٩] ابن كثير، جلالين، قرطبي و مختصر تفسير الطبري, ئایەتی٢٤ النساء.

[٢٧٠] بڕوانە: صحيح البخاري، بشرح فتح الباري، ج٩، باب/ لايكون بيع الامة طلاقاً, والمحلى لابن حزم، ج١١, المسالة (١٩٤٤).

٢ – بەڵکو ئەو وتەیەی (ابن عباس)، (ابن جریر)دەیهێنێ و(ابن كثیر)یش لە تەفسیرەکەیدا بەم جۆرە دەینوسێ: "وقال ابن جریر: حدثني یعقوب، حدثنا ابن علیه عن خلید، عن عكرمة، عن ابن عباس، قالَ: طلاق الامة ست". پاشان تەنها پێنجیان باسدەکات.[٢٧١]

دەڵێم، زۆر شوورەییەو نەنگییە، کەسێك بە ناو، خۆی بە نووسەر بزانێ، شتی وا قێزەونی لێبوەشێتەوە، زۆر حەیفە، کەسێکی دەروون ڕووخاو و نەخۆش، تا سەر ئێسقان ئالوودە بەسێکسەوە و فاشل لە ژیاندا، قەڵەم دەخاتە سەر کاغەزو خۆی بە شت بزانێ، ئاخر ئەوە تواناو ویژدانی مەریوانە، لەم سەردەمەدا، خەڵکی بە جۆرێکە، کە جوڵەی لێو دەخوێننەوە، کەچی تازە نەفامێکی وەك مەریوان دێت و دەیەوێت "خۆڵ بکاتە چاوی خەڵکی"و شیری "بەراز" بە شیری "مەڕەسپی" بە خەڵکی بفرۆشێت!.

١٦٣– لە لاپەڕە (٢٩٢)دا، لە باسی هۆی نازڵبوونی ئایەتی (٢٤/النساء)دا دەنوسێ: "هۆکاری دەرکەوتنی ئەم ئایەتە (اسباب النزول) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوانەی، کە لەمەو پێش باسمان کردوون، کە گرنگترینیان دووخاڵە". پاشان دووخاڵەکە دەنووسێ، کە بە کورتی یەکێکیان "سروشتی سێکسیی مرۆڤە"، دووەمیشیان "گەرمی شوێنەکە".

دەڵێین:

زانینی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی قورئان، دەبێت لە ڕێی گواستنەوە (نقل)ی ساغ و دروستەوە بێت لەو کەسانەوە، کە ئاگاداری هاتنە خوارەوەی قورئان بوون و ئاگاداری هۆیەکەی بوون، کەواتە، ڕەوا و حەلاڵ نییە، قسەکردن لە هۆی هاتنە خوارەوەی هەر ئایەتێك، گەر بەم جۆرە نەبێت، وەك (واحیدی) دەڵێ.[٢٧٢]

کەچی مەریوان، هاتووە باسی ژینگەو سروشتی مرۆڤ دەکات، کە ئەمە ئەوەندە لاوازە، ئەوەی سەرەداوێك، شارەزایی لە قورئان و زانستەکانی هەبێت، پەی پێدەبات.

١٦٤– لە لاپەڕە (٢٩٣)دا، ئەم دەقە دەنووسێ: "وكان ابن عباس وابي بن كعب وسعد بن جبیر والسدی) یقرؤن (فما استمتعتم به منهن الی اجل مسمی فاتوهن اجورهن فریضة) وقالَ مجاهد: نزلَت فی نکاح المتعة". هەروەها وتەیەکی تری (مجاهد)یش دەنوسێ، دواتر وەك سەرچاوە دەنوسێ: "هەمان سەرچاوەو ناونیشان".

دەڵێین:

١–مەبەست لەوەی، کە نووسیویەتی "هەمان سەرچاوەو ناونیشانی پێشوو"، واتە (صحیح البخاری، کتاب/ نکاح، الطلاق)، چونکە لە لاپەڕە (٢٩١)دا، ئەم ناونیشانەی داوە.

٢– ئەم جارەش، وەك جارەکانی تر دەقی واو شتی وا لە (صحیح البخاری)دا نییە.

٣– ئەو دەقە لە تەفسیری (ابن كثیر)دا هەیە، بەڵام (ابن كثیر) دەنوسێ: "بەڵام جەماوەری زانایان بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونەوەن، واتە ئەوەی، کە دەڵێ: ئەم ئایەتە لە بارەی موتعەی نیکاح هاتووە".[٢٧٣]

٤– ڕاستیی نازڵبوونی ئایەتی (٢٤/النساء):

ئەوەی فەرموودەی ڕاست و دروست پشتگیریی دەکات ئەوەیە، کە ئەم ئایەتە دەربارەی "موتعە" نەهاتۆتە خوارەوە، بەڵکو:

أ– لە جەنگی (اوطاس)دا، کاتێك چەند ئافرەتێك دەگیرێن و دەکەونە دەستی موسوڵمانان، هەندێك لە هاوەڵان بە لایانەوە گران دەبێت بچنە لایان، چونکە خاوەنی مێردن (مێردەکانیان بێباوەڕ بوون)، کە لەو بارەیەوە پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، ئایەتی﴿والمحصنات من النساء الا ماملکت ایمانکم....﴾ دادەبەزێ.[٢٧٤]

---

[٢٧١] ابن كثیر، ئایەتی ٢٤ النساء.

[٢٧٢] عومەر کەمال: پوختەیەکی بە سوود لە زانستەکانی قورئان، لاپەڕە ٤٤–٤٥.

[٢٧٣] ابن كثیر، ئایەتی٢٤ النساء.

[٢٧٤] صحیح مسلم، کتاب الرضاع، باب/ جواز وطء المسبیة بعد الاستبراء... رقم (١٤٥٦) ورواه ابو داود والترمذی والنسائی.

ب- له وەشدا, كه خوا دەفەرموێت ﴿ولا جناح عليكم فيما تراضيم به بعد الفريضة﴾ هەندێك له پیاوان هەبوون، كه مارەییان دیاری دەكرد بۆ ژنەكانییان، لەوانه بوو گران بكەوتایه له سەریان و بۆیان نەدرایەوە, ئەوە بوو, ئەمە نازڵبوو ﴿ولا جناح عليكم فيما تراضيم به بعد...﴾.[٢٧٥]

١٦٥- له لاپەڕە (٢٩٤)دا، چەند ئایەتێك دێنێ، كه وشەكانی "متاع " و "تمتع" و داتاشراوەكانی ئەم وشانەی تێدایه, له سەرەتاوه دەنوسێ: "بەپێی دەق هەموو ئەو شتانەی، كه موتعەیان تێدایه كاتین و بۆ ماوەیه، نەك هەتا سەر بێت, ئینجا ئەو چەند ئایەته دەهێنێتەوه".

دەڵێین:

ئەگەر مەبەست لەو قسەیه دونیا بێت, ئەمە وەهایه, چونكه شتەكانی دونیا هەمووی كاتین, قورئانیش جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوه, بەڵام گەر مەبەستی به ڕەهایی هەموو شتەكان بێت, ئەوە مەریوان درۆی كرد, چونكه (بەهەشت) خۆشییەكانی نەبڕاوەیەو بێكۆتایه, دەقیش تەنها له بارەی خۆشیی دونیاوه هاتووه, كه (كاتی)یه, نەك دواڕۆژ، ئەمەش زۆر بەڕوونیی لەو ئایەتانەدا دیاره, كه باس له خۆشییەكانی بەهەشت دەكەن.

١٦٦- له لاپەڕە (٢٩٥)دا، له باسی مەرجەكانی "موتعه"دا, له پاش باسكردنی وتەی ژن و پیاوەكه, دەنوسێ: "بەم جۆره ئەو ژن و پیاوه دەبنه حەڵاڵی یەكتری و مەرج نییه، هیچ شاهیدێك لەو كاتەدا ئامادە بێت, یا ژنەكه ئارەزوی خۆیەتی پرس به كەسوكاری بكات، یان نەیكات".

دواتر سەرچاوەیەكی (شیعه) به بەڵگه دەهێنێتەوه.

دەڵێین:

ئەگەرچی, ئێمه له دواتر باس له حەرامێتی "موتعه" دەكەین, بەڵام لێرەدا ئەوەی, كه مەریوان نوسیوویەتی:

"مەرج نییه هیچ شاهیدێك...". ئەمه وانییه، چونكه (ابن عطية) باسی "موتعه" دەكات, دەڵێ: "موتعه وەختی خۆی بەم جۆره بووه، پیاوەكه ئافرەتەكه مارە دەكات به شاهیدی دوو شاهید وبه ئیزنی كەس و كار.......".[٢٧٦]

ئەوەی مەریوان باسی لێوه كردووه، داوێنپیسیی تەواوه!, ئەمەش هیچ كات ڕۆژێ له ڕۆژان له ئیسلامدا ڕەوانه بووه, هەر بۆیه (عومەر) دەیوت: "هەر كەسێك بهێنن و موتعەی كرد بێت له ژێر بەردا دەیشارمەوه".[٢٧٧]

١٦٧- له لاپەڕە (٢٩٢)دا، ئەم دەقه دەنوسێ: "ايما رجل وامراة توافقا فعشرة ما بينها ثلاث ليال فان احبا ان يتزايدا او يتتاركا تتاركا". بەم جۆره دەیكات به كوردی "هەر پیاو و ژنێك ڕازی بن بۆ یەكتر بن له سەر درێژی كاتەكه ڕێك نەكەوت بوون نەیان توانی، یاخود نەیان زانی كاتەكەی دیاری بكەن، ئەوا من بۆیان دیاری دەكەم كه (سێ) شەوەو دوای ئەوە ئەگەر ویستیان و ئارەزویان كرد زیاد یان كەمی بكەنەوه".

دەڵێین:

١- دەقەكه زیادەیەكی هەیه, مەریوان نەیهێناوه, فەرموودەكه له (سەلەمە)وه دەیگێڕێتەوه, كه پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی "ايما رجل وامراة توافقا فعشرة ما بينها ثلاث ليال فان احبا ان يتزايدا او يتتاكا تتاركا, فما ادری اشی كان لنا خاصة ام للناس عامة قالَ ابوعبدالله وبينه علي عن النبی (ﷺ) انه منسوخ".[٢٧٨]

واته: هەر پیاو و ژنێك ڕێككەوتن، ئەوا ماوەی پێكەوه مانەوەیان (سێ) شەوه، جا ئەگەر پێیان خۆشبوو له دوای تەواو بوونی ئەو ماوەیه, ماوەكه زیاد بكەن, یا زیادی بكەن, یان ئەگەر ویستیان جیا ببنەوه, با جیا ببنەوه, (سەلەمە)دەڵێ: جا نازانم, ئەوە شتێك بوو, تەنها تایبەت بوو به ئێمەوه, یان گشتی بوو بۆ خەڵكی تریش؟ (بوخاری)

---

[٢٧٥] بڕوانه: اسباب النزول للسيوطی، بزيل تفسير الجلالين.

[٢٧٦] القرطبی, ئایەتی٢٤/ النساء, المسالة الحادية عشرة.

[٢٧٧] القرطبی، ج٥, ص ١٣٢ المسالة الحادية.

٢٧٨رواه البخاری, باب/ نهی رسول الله عن نكاح المتعه اخيراً, رقم (٥١١٩).

کە کونییەکەی (ابوعبدالله)یە دەڵێ: عەلی ڕوونی کردۆتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ), کە نیکاحی موتعە هەڵوەشێنراوەتەوە, واتە منسوخە.

٢ – لە گێڕانەوەیەکی (بەیهەقی)دا، بەڕاشکاوانە لە (ابوذر)ەوە باس لەوە دەکات, کە (ابوذر) وتویەتی: "نیکاحی موتعە، تەنها بۆ ئێمەو هاوەڵان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ حەڵاڵ بوو, پاشان پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێکرد". (انما احلت لنا اصحاب رسول الله (ﷺ) متعة ثلاثة ايام, نهى عنها رسول الله (ﷺ).[٢٧٩]

کەواتە:

١ – "لە سەردرێژی کاتەکە ڕێك نەکەوتن...". خەیاڵی مەریوان خۆیەتی و لە دەقەکەدا شتی وانە هاتووە.

٢ – لەدەقەکەدا, هاتووە لە دوای تەواو بوونی ماوەی سێ شەو, گەر ویستیان ماوەکە زیاد بکەن, بەڵام مەریوان شتێکی تری نوسیووە.

٣ – "یتتارکا" واتە جیاببنەوەو وازبهێنن لە یەکتر, کەچی مەریوان بە "کەم کردنەوە" واتای کردووە!.[٢٨٠]

١٦٨ – لە هەمان لاپەڕەدا (٢٩٢)، مەریوان, لە پەراوێزەکەدا، وتەیەکی (سُدی) دێنێ و دوایی دەنوسێ: (صحیح البخاری، کتاب الحج, باب/التمتع: ١٥٧١).

دەڵێین:

١ – ئەوەی، کە مەریوان لە (سدی)یەوە نوسیویەتی لە (صحیح البخاری)دا نییە, بەڵکو لە تەفسیری (ابن کثیر)دایە, لە ڕاڤەی ئایەتی (٢٤/النساء) دەیهێنێ.

٢ – ئەوەی لە (صحیح البخاری)دا, بەژمارە (١٥٧١) باسی جۆرێ لە جۆرەکانی حەج دەکات، کە پێی دەوترێ: "تەمەتوع" کە لە پێشەوە لەسەر ئەمە قسەمان کرد.[٢٨١]

١٦٩ – لە لاپەڕە (٢٩٧)دا, دەنوسێ: "دەبینین موتعە, یان زەواجی کاتی شەرعی و حەڵاڵەو هەتا مردنی پەیامبەریش ئەم جۆرە زەواجە حوکمی شەرعی ئایەتی هەیەو پەیڕەو کراوە". پاشان ئاماژە دەدات بە (صحیح البخاری) فەرموودەی ژمارە(١٥٧٧).

دەڵێین:

١ – نەفامیی, سەرلێشێواویی, نەخۆشی دەروونیی و فاشلبوون لە ژیاندا, چی ناودەنێی لە مەریوان ناوی بنێ!, مەریوان, پێموایە بە هۆی زاڵبوونی سێکسەوە بە سەریدا، ئەگەر سەیری ئاوو ئاگریش بکات، تەفسیری دەکات بە ئەندامێکی سێکسیی ئافرەت, بۆ نا, ئەوە تا (ئیحرام شکاندن بە عەمرە و پاشان ئیحرام بەستنەوە بەحەج) بەکاری سێکسیی لە قەڵەم دەدا!.

٢ – ئەوەی مەریوان ئاماژەی پێکردووە لە(صحیحی البخاری)دا، لەگەڵ قسەکەیدا یەك ناگرێتەوە, چونکە ئەوەی لە (بوخاری)دا هەیە، باس لە "تەمەتوعی" حەج دەکات، کە لە پێشتر بە ڕوونیی باسی ئەوەمان کرد.[٢٨٢]

١٧٠ – لە لاپەڕە (٢٩٧)دا، لە بارەی ئەوەی چەند جار "موتعە" حەڵاڵ وحەرام کراوە, مەریوان سێ جاری نوسیوە:

١ – فەتحی مەککە. ٢ – شەڕی (اوطاس). ٣ – حجة الوداع.

دواتر دەنوسێ "بەم پێیە چەندین جار حەرامکراوەو حەڵاڵ کراوەتەوە .... شافعی و کۆمەڵێك لەزانایان وای بۆ دەچن دووجار حەڵاڵ و حەرام کراوەتەوە ...".

[٢٧٩] فتح الباري، شرح صحيح البخاري، ج٩، ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە(٥١١٩).

[٢٨٠] بۆ ڕاڤەی فەرموودەکە بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢٨١] بڕوانە: بڕگەی ١٤٥و دواتر.

[٢٨٢] بڕوانە: بڕگەی ١٤٥ودواتر .

دەڵێین:

پێویستە لێرەدا, زۆر بە پوختیی لە سەر ئەم باسە بدوێم، داواشم لە خوێنەران ئەوەیە، کە ئەوەی ئێستا لە بارەی "نیکاحی موتعە"وە دەینوسم, زۆر بەوردیی و وریاییەوە بیخوێننەوە, چونکە هەوڵمداوە لێرەدا باسی "موتعە" ڕوون بکەمە, ئەوەش لە پێناو ئەوەدا, کە دواتر چوومە سەر تەواوی وەڵامەکانی تری مەریوان, خوێنەر وەڵامەکانی بە لاوە گران نەبێت.

**نیکاحی موتعە**

پێناسەکەی: "بریتییە لەو گرێبەستی هاوسەرییەی بۆ ماوەیەك دەکرێت, گەر ئەو ماوەیە تەواو بوو, ئیتر جیابوونەوەش لە نێوان ژن و پیاوەکەدا ڕوودەدات".[٢٨٣]

**حوکمەکەی:**

یەکدەنگیی زانایانی لە سەرە، کە "نیکاحی موتعە" لە سەرەتادا بۆ ماوەیەك ڕەوا بووە, پاشان حەرام کراوە, تا ڕۆژی دوایی, هەرکەس ئەو جۆرە نیکاحە بکات, نیکاحەکەی بەتاڵە, هەندێ لە زانایانیش بە (زینا)ی دادەنێن.[٢٨٤] هەروەها کردنی ئەم کارە یەکێکە لە گوناهە گەورەکان.[٢٨٥]

**کەی و چەند جاریش حەڵاڵ وحەرام کرا؟**

زانایان قسەیان لە سەر ئەم باسە زۆر کردووە, بەڵام لە هەموویان وردترو گشتگیرتر (ابن حجر)ە، لەویش ڕوونتر، کە قسەی لە سەر کرد بێت (ابن القیم)ە, کە بەڕاستی مافی تەواوی بەم بابەتە داوە.

من هەوڵ دەدەم, زۆر بە پووختیی, وتەو قسەکانی ئەم دوو کەڵە زانایە لەو بارەیەوە بهێنم, کە پێموایە تا ئێستا کەس بەم جۆرەی ئەم دوو بەڕێزە, لەسەر ئەم بابەتە شتەکانیان شی نەکردۆتەوە, بۆیە دەڵێم:

١- پێغەمبەر (ﷺ) لە ساڵی فەتحی مەککەدا، فەرمووی: "ئەی خەڵکینە, من لەمەو پێش مۆڵەتم دابوون, کە (موتعە) بکەن لەگەڵ ئافرەتاندا, بەڵام ئێتر ئەوە خوای گەورە تا ڕۆژی دوایی حەرامی کرد".[٢٨٦]

کەواتە, لە ساڵی (فەتحی مەککە)دا, حەرام و قەدەغەکرا بۆ هەتا هەتایە, واتە لە سەرەتادا ڕێدراوەو یەکجاریش بۆ هەتا هەتایە قەدەغە کراوە, ئەمە لە هەموو بۆچوونەکانی تر, ڕاستترە.[٢٨٧]

**پرسیار:**

گەر بوترێت، ئەی چی دەکەیت لەو فەرموودەیەی لە (بخاری و مسلم)دایە، کە (عەلی) بە (ابن عباس) دەڵێ: "پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کرد لە موتعەی ئافرەتان و خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵیی لە ڕۆژی خەیبەردا". "ان النبي (ﷺ) نهى عن متعة النساء وعن لحوم الحمر الاهلية زمن الخيبر".[٢٨٨]

زانایان لە وەڵامی ئەم فەرموودەیەدا, دەڵێن:

---

[٢٨٣] فتح الباري, ج٩, باب/ نهی رسول لله (ﷺ) عن نكاح المتعة اخيراً. رحمة الامة, ص٣٩٨, المحلى/ مسالة (١٨٥٨).

[٢٨٤] رحمة الامة، ص٣٩٨, المحلى, المسالة (١٨٨٥), فتح الباري، ج٩، ص ١٩٩, مذكرة اصول الفقه، ص١٦٤.

[٢٨٥] الزواجر عن اقتراف الكبائر، ج٢, الكبيرة (٣٦٣-٣٦٨) .

[٢٨٦] رواه مسلم (١٤٠٦), ٢١.

[٢٨٧] زاد المعاد، ج٣، ص ٤٥٩ -٤٦٠ .

[٢٨٨] رواه البخاري, (٥١١٥), (مسلم (١٤٠٧) .

ئەوەی وا دەردەكەوێ, وەها نییە, چونكە ئەوانەی وا دەڵێن و پێیانوایە "زمن خیبر" دەچێتەوە بۆ هەردوو كارەكە, بەڵام لە ڕاستیدا "زمن خیبر" یان "یوم خیبر"، وەك لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە, تەنها دەگەڕێتەوە بۆ "لحوم الحمر الاهلية".

(سفيان بن عيينة)، كە ساڵی(١٠٧ك) لە دایكبووە (١٩٨ك) مردووە, دەڵێ: "یوم خیبر" پەیوەستە بە گۆشتی گوێدرێژەوە, نەك موتعە.

(سوهەیلی) دەڵێ: ئەوەی، كە دەوترێ لە ڕۆژی خەیبەردا, نەهی لە موتعە كراوە, ئەمە شتێكە هیچ یەكێك لە زانایان بە سیرەو ڕاوی گێڕانەوەكان لە لایان زانراو نییە.

(ابن عبدالبر) لە ڕێگەی (قاسم بن اصبغ)ەوە, ئەوە باس دەكات، كە (حومەیدی) لە (ابن عيينة)ەوە باسی دەكات, كە وتویەتی: نەهییەكە لەسەردەمی خەیبەردا لە گۆشتی گوێدرێژبووە, بەڵام نەهی موتعە لە غەیری ڕۆژی خەیبەر بووە.

هەروەها (ابن عبدالبر) دەڵێ: "زۆربەی هەرە زۆری خەڵكی لە سەر ئەم بۆچوونەن (وعلى هذا اكثر الناس)".

(ابوعوانة) لە (صەحیحە)كەیدا, دەڵێ: "گوێم لە ئەهلی (عیلم) بووە، كە وتویانە: فەرموودەكەی (عەلی) باسی نەهییە لە گۆشتی گوێدرێژ, بەڵام نەهی لە موتعە ئەوە لە ڕۆژی فەتحی مەككەدا بووە".[٢٨٩]

گەر بوترێت: ئەی بۆچی هەردوو بابەتەكەی پێكەوە باس كردووە؟

وتراوە: كاتێ, كە (ابن عباس) لەگەڵ (عەلی)دا، لە سەر ئەو دوو بابەتە موناقەشە دەكەن, (عەلی) بە (ابن عباس) دەڵێ: "تۆ كەسێكی سەرت لیشێواوەو سەر لە بابەتەكە دەرناكەیت, پێغەمبەر (ﷺ) موتعەی حەرام كردووەو گۆشتی گوێدرێژی ماڵیشی لە ڕۆژی خەیبەردا, حەرام كردووە, ئەوەتا (عەلی) باسی موتعەكە تایبەت ناكات, بەڵام خواردنی گۆشتەكە دیاری دەكات, جا هەندێك خەڵك وا تێدەگەن، كە مەبەست هەر دووشتەكە بێت لە یەككاتدا, بەڵام عەلی وەك موناقەشە ئەم دوو بابەتەی باسكردووە".

ابن القيم, دەڵێ: "زۆربەی خەڵكی لە سەر ئەو بۆچوونەن".[٢٩٠]

**ڕوونكردنەوەیەك**

هەندێك كاتیتر باسكراوە لە بارەی حەرامبوونی "موتعە", بەڵام هیچیان لە ڕەخنە بەدەر نین، بە گشتی پێنج جێگەیان باسكردووە:

١- هەندێك وتویانە گوایە لە (تەبوك)دا، حەرامكرا, بۆ ئەمە لە (ابوهريرة)وە فەرموودەیەك ڕاگوێز دەكەن، بەڵام (ابن حجر) جگە لەوەی وەڵامی دەداتەوە, ئاماژەش بەوە دەكات، كە فەرموودەكە لاوازە (ضعیف)ە، چونكە لە ڕێگەی (مؤمل بن اسماعيل) لە (عكرمة بن عمار)ەوەیە، كە هەردووكیان قسەیان لەسەرە.[٢٩١]

دەڵێم، ئەوەی كە (ابن حجر) لە بارەی ئەو كەسەوە وتویەتی, مەبەستی لەوەیە كە:

أ- (مؤمل بن اسماعيل) كەسێكی لاوازە, چونكە وەك (ابن حجر) خۆی لە (التقريب)دا، دەڵێ: "صدوق سيء المحفظ" واتە: ڕاستگۆیە, حیفزی خراپە, (ابو حاتم)و كەسانی تریش دەڵێن: هەڵەی زۆرە (كثير الخطأ).[٢٩٢]

ب- (عكرمة بن عمار )یش, كەسێكی زۆر لاوازە (ضعيف جداً) وەك (ابن حزم) دەڵێ.[٢٩٣]

---

[٢٨٩] فتح الباري، ج٩, ڕاڤەی فەرموودەی (٥١١٥), زاد المعاد، ج٣, ص٤٦٠-٤٦١.

[٢٩٠] زادالمعاد، ج٣، ص٤٦٦ .

[٢٩١] فتح الباري، ج٩، ص١٩٥.

[٢٩٢] سلسلة الاحاديث الضعيفة والموضوعة للالباني، ج١، ص ١٣١ و ج٤، ص، ٤٥٥ .

[٢٩٣] المحلی، ج١٣، ص١٣ .

تێبینی: ئەم دەستەیە فەرموودەیەکی تر دەهێننەوە، کە (جابر) ڕیوایەتی دەکات، بەلاّم ئەمیش لاوازە, چونکە لە ڕشتە (سند)ەکەیدا (عباد بن کثیر)ی تێدایە, کەسێکە زانایان وازیان لە گێڕانەوەی هێناوە (متروك)، وەك (ابن حجر) دەڵێ.[٢٩٤]

(بخاری) لە بارەیەوە, دەڵێت: "وازیان لێهێناوە (ترکوه)", (نەسائی) دەڵێت: "متروك", (طبرانی) دەڵێ: "متروك الحدیث", (احمد) دەڵێ: "فەرموودەی درۆ دەگێڕێتەوە (روی احادیث کذب)".[٢٩٥]

٢- هەندێك دەڵێن لە (حجە الوداع)دا حەرامکراوە، بەلاّم ئەمەش زانایان قسەیان لە سەر کردووەو وەلاّمیان داوەتەوە، کە (ربیع بن سبرة) بە وەهم و هەڵەدا چووە لە جیاتی بڵێ: سەردەمی (فەتحی مەککە) وتویەتی (حجة الوداع) وەك (ابن حجر، ابن القیم و ئەلبانی) ئاماژەیان پێداوە.[٢٩٦]

ئەوەی، کە جاریوایە (ڕاوی) بە هەڵەدا دەچێ، سەردەمێك دەگوێزێتەوە بۆ سەردەمێکی تر, جێگەیەك دەکات بە جێگەیەکی تر, یان ڕووداوێك بە ڕووداوێکی تر, ئەمە زۆرێك لە شارەزایان تووشی دەبن, چ جای ئەوەی کەسانێك, کە لە پلەدا لە خوار ئەمانەوە بن، وەك (ابن القیم) دەڵێ.[٢٩٧]

٣- هەندێکی تر دەڵێن: لە جەنگی (اوطاس)دا حەرامکراوە، کە (مسلم) دەیگێڕێتەوە, ئەمەش زانایان وەلاّمیان داوەتەوە, بەوەی، کە مەبەست لە (عام اوطاس) (عام الفتح)ە، چونکە هەموو لایەك دەزانن، کە جەنگی (اوطاس) ڕاستەوخۆ بە دوای فەتحی مەککەدا هات، هەروەها ئەوەش دوورە، چونکە وەك لە فەرموودەی ساغدا هاتووە، کە لە فەتحی مەککەدا لە بارەی (موتعە)وە, پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: "هەتا هەتایە تا ڕۆژی دوایی حەرامە".[٢٩٨]

بۆیە جێی خۆیەتی (عام اوطاس) مەبەست لە (عام الفتح) بێت.[٢٩٩]

٤- هەندێك دەڵێن: لە (عمرة القضاء)دا حەرامکراوە، بەلاّم ئەم گێڕانەوەیە لاوازە, لە (مراسیل)ی حەسەنی بەسرییە, مەعلومیشە، کە هەموو (مراسیل)ەکانی (حسن) لاوازن.[٣٠٠]

کەواتە:

ئەوەی، کە لە ڕەخنە دەربازی بووە و ڕەخنەی زانستیی زانا بەڕێزەکان نایگرێتەوە، تەنها (فەتحی مەککە)بوو، ئەو گێڕانەوەیەی, کە دەڵێت "موتعە لە فەتحی مەککەدا حەرامکرا". ڕاشکاوەو بێ پێچ وپەنا دەرچوو.

(ابن القیم) لە سەر "موتعە" لە ڕۆژی خەیبەردا دەڵێ: "لە ڕۆژی خەیبەردا بەهیچ جۆرێ هاوەلاّن لەگەڵ ئافرەتە جوولەکەکاندا موتعەیان نەکردووە. وەداوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) نەکردووە, کە مۆڵەتیان بدات, وە هیچ کەسێکیش شتی وای لەم جەنگەدا نەقڵ نەکردووە".[٣٠١]

بۆ درێژەی ئەم بابەتە: بڕوانە: فتح الباری، ج٩، باب/نهی رسول (ﷺ) عن نکاح المتعة اخیراً, زاد المعاد, ج٥، ص١١١-١١٢، وە ج٣, ص٣٤٣-٣٤٥, ٤٥٩-٤٦٤ .

---

[٢٩٤] فتح الباری، ج٩، ص١٩٥ .

[٢٩٥] سلسله الاحادیث الضعیفة، ج٤، ص ١١,١١٤, ٢٤٢, ٣٢٥ .

[٢٩٦] زاد المعاد، ج٣، ص٤٥٩, فتح الباری، ج٩، ص١٩٥, ضعیف سنن ابی داود رقم (٤٤٧).

[٢٩٧] زاد المعاد،ج٣، ص٤٥٩ .

[٢٩٨] رواه مسلم باب/ نکاح المتعة .

[٢٩٩] زاد المعاد، ج٣, ص٤٦٢, فتح الباری، ج٩، ص١٩٥ .

[٣٠٠] فتح الباری، ج٩، ص١٩٥ .

[٣٠١] زادالمعاد، ج٣، ص٣٤٤-٣٤٥.

پاش ئەمە، ئێستا دێینەوە سەر وەڵامەکانی (مەریوان)، کەواتە قسەکەی مەریوان، کە دەڵێ: "چەندین جار حەڵاڵ کراوەو حەرام کراوە"، وانییە، ئەوەشی لەو بارەوە دەوترێت، دەبێت بەو جۆرە لێك بدرێتەوە، کە زانایانی وەك (ابن حجر و ابن القیم) لێکیان داوەتەوەو ئێمەش پوختەکەیمان نووسی.

هەر لێرەوە، مەریوان، هەرچییەك بنووسێت و بڕیاری لێدەربهێنێ، هەواڵەی ئەم وەڵامەی دەکەین، کە پێشتر نووسیمان.

١٧١- لە لاپەڕە (٢٩٩)دا، فەرموودەکەی خەیبەر باس دەکات.

دەڵێین: لە بڕگەی (١٧٠)ودواتر، زۆرمان لە سەر نوسیووە، دەتوانن بگەڕێنەوە سەری.

١٧٢- لە هەمان لاپەڕەدا(٢٩٩)، ئەم قسەیەی (جابر)و (سەلەمە) دێنێ، کە دەڵێن: "کنا فی جیش فاتانا رسول رسول الله (ﷺ) فقال: انه قد اذن لکم ان ستمتعوا فاستمتعوا". پاشان ئاوا ڕاڤەی دەکات: "لە ناو سوپاکەدا وەستا بووین، پەیامبەر هاتە لامان وتی: ڕێگەم پێدان کە موتعە بکەن... بڕۆن ڕابوێرن".

دەڵێین:

مالی دڕۆت کوێر بێتەوە بۆ خۆت و چ درۆ کردنێکت، دەزانم خەڵکانێك، کە وەك مەریوان نەزانن و کتێبەکەی دەخوێننەوە، ئیتر چوزانن شتەکانی ڕاستە یان نا، باوەڕ ناکەم مەریوان بە خەیاڵیدا هاتبێت، ڕۆژێك لە ڕۆژان، ئاوا سڕی هەڵماڵدرێت!.

ئەمە ڕاستەکەیەتی:

"ئێمە لە نێو سوپاکەدا بووین، نوێنەرەکەی پێغەمبەر(ﷺ) هات بۆ لامان وتی: ڕێگەتان پێدراوە، کە موتعە بکەن، کەوایە بچن موتعە بکەن".

ئەو سوپایەی ئەو دوو هاوەڵەی تێدا بوون، هەرچەندە نازانرێ بە تایبەتی لە چ غەزایەکدا بووە، بەڵام لەوانەیە غەزای (اوطاس) بوو بێ، چونکە وەك لە (صحیح مسلم)دا هەیە، سەلەمە دەڵێ: پێغەمبەر لەو ساڵەدا سێ ڕۆژ مۆڵەتیدا موتعە بکرێ، دواتر نەهی لێکرد.[٣٠٢]

(ابن حجر)یش ئاماژە بەمە دەکات.[٣٠٣]

ساڵی (اوطاس)، کە پێشی دەوترێت (حنین)، چونکە کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) لە فەتحی مەککە بووەوە، لە بەرە بەیانی (١٧)ی ڕەمەزانی ساڵی (٨-ك)دا، چووە ناو مەککەوە، پاشان لە (٦)ی مانگی شەوالی ساڵی (٨) کۆچی بەرەو (حنین) کەوتە ڕێ، هەندێکیش دەڵێن: دوو شەوی مابوو لە مانگی ڕەمەزان، کە تەواو ببێ، وە بە غەزای (حنین)یش دەوترێت غەزای (اوطاس)، چونکە کاتێ (هوازن) تێکشکان، بەشێکییان پەنایان بردە بەر (دۆڵی اوطاس).[٣٠٤]

مەبەست:

مەبەستم لە باسکردنی ئەمە، بە هێزکردنی ئەو ڕاستییەی پێشەوە بوو، کە ئاماژەمان بۆ کرد، لە بارەی (موتعە)وە، کە لە جەنگی (اوطاس)دا، حەرامکراوە، مەبەست لێی ساڵی فەتحی مەککەیە، چونکە (موتعە) لە فەتحی مەککەدا، بە هەتا هەتایی حەرامکرا.

١٧٣- لە لاپەڕە (٢٩٩)دا، ئەم دەقە دەهێنێت "سمعت ابن عباس سئل عن متعة النساء، فرخص، فقال لە مولی لە انما ذلك في الحال الشدید وفی النساء قلّة او نحوه، فقال ابن عباس نعم".

---

[٣٠٢] صحیح مسلم، باب/ نکاح المتعة.

[٣٠٣] فتح الباری، باب/ نهی رسول (ﷺ) عن نکاح المتعة، رقم(٥١١٧-٥١١٨).

[٣٠٤] فتح الباری، ج٨، باب/ قول الله تعالی (ویوم حنین اذ اعجبتکم....) وباب/ غزوة اوطاس، زاد المعاد، ج٣، ص٤٦٥، غزوة حنین، الرحیق المختوم، ص٤٢٨-٤٢٧.

ئاوهاش دەیکات بە کوردی: "پرسیاریان لە (ابن عباس) کرد, دەربارەی (متعة) لە وەڵامدا وتی: ڕێگەی پێدراوە، بەڵام لە کاتی ناچاری و کەمی ژندا".

دەڵێین:

بە کوردی کردنی دەقەکە بە ڕاستیی، وەك خۆی ئاوەهایە: "ابی جمرة (کە ڕاوی ئەم باسەیە) دەڵێ: گوێم لێبوو پرسیار لە (ابن عباس) کرا, لە بارەی موتعەی ئافرەتان, ئەویش ڕووخسەت و مۆڵەتیدا, جا خزمەتکارێکی (ابن عباس) هەبوو بە (ابن عباس)ی وت: ئەم ڕووخسەتدانە تەنها لە حاڵەتی زۆر زەرووریدا دەبێ و کاتێکیش ئافرەتان کەم بن؟, یان هاوشێوەی ئەم قسەیەی پێوت, (ابن عباس)یش پێیوت: بەڵێ".

<u>ڕوونکردنەوەیەکی پێویست:</u>

ئەم فتوایەی، کە (ابن عباس) داوێتی لە حاڵی زۆر ناچاریدا دەبێت, وەك چۆن لە حاڵەتی زۆر برسێتیدا دروستە (مردارەوەبوو) و(خوێن)و گۆشتی (بەراز) بخورێت, ڕیوایەتەکان ئەمە لە (ابن عباس)ەوە پشتڕاست دەکەنەوە.

(بەیهەقی) بەراشکاویی لە (ابن عباس)ەوە دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی: "موتعە ڕووخسەتێك بووە لە سەرەتای ئیسلامەوە بۆ کەسێك کە ناچاربێت بۆی, وەك ناچاری (مردارەوەبوو) و (خوێن) و (گۆشتی بەراز) خواردن. "انما كانت (يعنى المتعة) رخصة فى اول الاسلام لمن اضطر اليها كالميتة و الدم والخنزير".[٣٠٥]

هەتا (سعيد بن جبير)، وەك سەرزەنشتێك پێی دەڵێت: "کە بە هۆی فتواکەی تۆوە, خەڵکی دەستیان کردووە بە (موتعە)"، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: "سوێند بە خوا من فتوای وام نەداوە, بەڵکو موتعە وەك گۆشتی (مردارەوەبوو) وەهایە، ڕەوانییە, تەنها بۆ کەسێك کە ناچار بێت.[٣٠٦]

بە پوختیی, وەك (ابن حجر) دەڵێ: "موتعە، تەنها کە ڕێگەی پێدرابوو, سەرەتا بە هۆی بێ ژنییەوە بوو لە کاتی سەفەر کردندا, وە ئەمەش (موافيق)ی فەرموودەکەی (ابن مسعود)ە".[٣٠٧]

فەرموودەکەی (ابن مەسعود)یش, ئەمەیە "وەختی خۆی کە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەچووین بۆ غەزا, هیچمان نەبوو، (خێزانمان نەبوو) وتمان بۆ خۆمان نەخەسێنین, ئەوەبوو ئەم کارەمان لێ قەدەغە کرا، پاشان ڕێگەمان پێدرا, کە (ئافرەتان) مارە بکەین بۆ کاتی دیاریکراو".[٣٠٨]

کەواتە:

ئەوەی (ابن عباس) تەنها بۆ کاتی ناچاریی فەتوای داوە, بەڵام کاتێك خەڵکی ئەو سنوورەیان شکاندو تێیانپەڕاند, وازی لەم فتوایە هێناو پەشیمان بووەوە لێی.

١٧٤– لە هەمان لاپەڕەدا, فەرموودەکەی (صحيح البخاری) بە ژمارە (٥١١٩) دەنوسێ.

دەڵێین: ئەو فەرموودەیە لە بڕگەی (١٦٧)دا, قسەمان لێکردووە.

١٧٥– لە لاپەڕە (٢٩٩)دا, ئەو فەرموودەیە دەنووسێ و دەڵێ: "کە ئایەتی موتعە لە قورئاندا نازڵ بووە لەگەڵ پەیامبەردا کردوومانە...".

دەڵێین:

ئەو فەرموودەیە (عمران بن حصين) دەیگێڕێتەوە لە (صحيح البخاری)دا بە ژمارە( ١٥٧١) وە (٤٥١٨), بەڵام باسی موتعەی سێکسیی نییە, بەڵکو باس لە "تەمەتوع"ی حەج دەکات, لە بڕگەی (١٤٥)دا و دواتر بە درێژیی باسی ئەو شێوە حەجەمان کردووە, بگەڕێرەوە سەری .

---

[٣٠٥] فتح البارى, ج٩, ڕاڤەی فەرموودەی ٥١١٦.

[٣٠٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٠٧] سەرچاوەی پێشوو.

[٣٠٨] رواه البخاری (٥٠٧٥)وە مسلم (١٤٠٤) .

نەفامیی مەریوان و بێشەرمییەکەی لە خەڵکی و دەوروبەری وای کردووە هەر چۆنێك بێت, شتێك بێنێتە ئاراوە, کە درۆکانی پێپینە بکات, وە خەڵکی نەزانی وەك خۆی پێهەڵبخەڵەتێنێت, ئاخر ئەندازەی گەردیلەیەك هەستی ڕاستی تێدا بوایە, خۆ بێگومانم لەوەی شەرحە بەناو بانگەکەی (صحيح البخاري, واتە فتح الباري) لابووە, سەیرێکی بکردایە, لەوەش دڵنیام سەیری کردووە, بەڵام کە سەرنجی داوە "تمتع"ی حەجە, هەوڵیداوە کە لەو ڕاستییە ڕابکات و ئەو دەقە بشێوێنێت!.

١٧٦ – ئێستا یەکێکی تر لە هەرە ناپاکیەکانی مەریوانتان بۆ دەنووسم, کە کردوویەتی, جا خۆتان چی پێدەڵێن سەر پشك بن, چونکە هەڵدەگرێ, چی سیفەتی دوور لە نووسەرو ئەهلی قەڵەمە بیدرێتە پاڵی.

لە لاپەڕە (٢٩٩–٣٠٠)دا, دەنوسێت: "(عبدالله بن عباس) دەگێڕێتەوە لەگەڵ پەیامبەردا لە جیهاد بووین, وە ژنەکانمان لەگەڵ نەبوو نەمان دەزانی بەچی خۆمان خاڵی بکەینەوە, بە پەیامبەرمان وت, کە خۆمان خاڵی بکەینەوە؟, سەرەتا ڕێگری لێکردین, دوای کەمێك هاتە لامان و وتی بڕۆن خۆتان خاڵی بکەنەوە لە بری پارە, جل وبەرگیان پێبدەن, دوای ئەوە ئەم ئایەتەی بۆ خوێندینەوە: (ياايها الذين امنوا لاتحرموا طيبات ما احل الله لكم...".

دەڵێین:

ئەو فەرموودەیە لە (بوخاری و مسلم)دایە, کە (عبد الله بن مسعود) دەیگێڕێتەوە: "كنا نغزو رسول الله (ﷺ) ليس لنا نساء فقلنا الا نستخصي؟, فنهانا عن ذلك، ثم رخص لنا ان ننكح المراة بالثوب الى اجل, ثم قرأ عبدالله: (ياأيها الذين آمنوا لاتحرموا طيبات ماا حل الله لكم ...)".[٣١٠]

واتە: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) غەزامان دەکرد, ئافرەتیشمان نەبوو, واتە (ژنمان نەبوو) وتمان: ئەوە بۆ خۆمان نەخەسێنین, ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لێکرین لە خۆخەساندن, پاشان مۆڵەتیداین ئافرەتان مارە بکەین, تا ماوەیەکی دیاریکراو, بەرامبەر بە پۆشاك و جلوبەرگ, پاشان (عبدالله) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ياأيها الذين آمنوا لاتحرموا طيبات ماا حل الله لكم..).

جا بەڕێزان سەرنج بدەن, مەریوان چەند ناپاکیی کردووە, کە من زۆر بە خێرایی هەندێکی دەست نیشان دەکەم:

أ– "عبدالله بن عباس" نییە, بەڵکو (عبدالله بن مسعود)ە.[٣١١]

جگە لەو بەڵگەیە, ئەوەی, کە بچوکترین ئاشنایی بە ژیانی هاوەڵان هەبێت, دەزانێت, کە (عبدالله بن عباس) بە سێ ساڵ پێش کۆچ بۆ شاری مەدینە لە دایکبووە, کاتێکیش پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کرد, تەمەنی ١٣ ساڵان بوو.[٣١٢]

لە کاتی (فەتحی مەککە)دا, تەمەنی (١١) ساڵان بووە, لەو ساڵەشدا "موتعە" حەرام کرا, دەی ئەو کاتە زۆر منداڵ بووە, کە (موتعە) ڕەوایی هەبووە, مەریوان چاك دەزانێ, منداڵێ کەمتر لە (١١) ساڵ تەمەنی بوو بێت, ئایا کاری سێکسیی پێکراوە؟ ئەمە ئەگەر دابنێین, کە ڕاوییەکە (ابن عباس)ە, بەڵام ڕاوییەکە (عبدالله بن مسعود)ە.

ب– "نەمان دەزانی بە چی خۆمان خاڵی بکەینەوە...". درۆی مەریوان خۆیەتی, لە دەقەکەدا شتی وای تێدا نییە!.

ج– "سەرەتا ڕێگری لێکردین.." ئەمەش وانییە, بەڵکو ئەوەی, کە ڕێگرییان لێکراوە لە (نەکردنی خۆخەساندن) بووە.

د– "دوای کەمێك هاتە لامان..." درۆیەکی ئاشکراو ڕوونە, سەرنج بدە.

هـ– "دوای ئەمە ئایەتی بۆ خوێندینەوە..." وا دەردەخات, کە پێغەمبەر (ﷺ) خوێندبێتییەوە, بەڵام خوێندنی ئایەتەکە (عبدالله) خۆی بووە, نەك پێغەمبەر (ﷺ), ئەمەش لە دەقەکەدا بە ئاشکرا دیارە.

بەڕێزان, خۆ نەفامیی و خەیاڵپڵاویی مەریوانتان بۆ دەرکەوت, کە چەندە کەسێکی نزمە لە هەموو بوارێکی زانستیی و ڕەوشتدا!.

---

[٣١٠] رواه البخاري (٥٠٧١ و ٥٠٧٥) وە مسلم (رقم(١٤٠٤) / نكاح المتعة.

[٣١١] بڕوانە: فتح الباري, ج٩, ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (٥٠٧٥) باب/ مايكره من التبتل والاخصاء .

[٣١٢] بڕوانە: صفة الصفوة, م١/ ژیانی عبدالله بن عباس .

١٧٧- لە لاپەڕە (٣٠٠)دا، دەنوسێ: "(عبدالله بن عباس) دەگێڕێتەوە لەگەڵ پێغەمبەردا لە غەزادا بوون...".

دەڵێین:

ئەم فەرموودەیە، هەمان ئەوفەرموودەیەیە، کە لە بڕگەی (١٧٦)دا بە درێژیی قسەمان لێکردووە، بگەڕێرەوە سەری.

١٧٨- لە لاپەڕە (٣٠٠)دا، دەنوسێ: "دەفەرمووێت لەگەڵ پێغەمبەردا زەواجی موتعەمان کردووە، بەڵام عومەر حەرامی کرد". پاشان ئاماژە بە (صحيح مسلم) دەدا.

دەڵێین:

ئەم ڕیوایەتە دەقەکەی ئاوهایە: ﴿كنا نستمتع بالقبضة من التمر والدقيق، الايام، على عهد رسول الله (ﷺ) وابوبكر حتى نهى عمر﴾.[٣١٣]

واتە: "ئێمە (ئەمە قسەی جابرە) موتعەمان دەکرد، بە مشتێ خورماو ئارد بۆ چەند ڕۆژێ، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺو ئەبوبکردا، تا ئەوەبوو عومەر نەهی لێکرد".

ڕوونکردنەوەیەك:

(ابن القيم) دەڵێ: "ئەوەی جابر وتویەتی ئەوەیە، کە نەهییەکەی پێغەمبەری ﷺپێنەگەیشتووە، بەڵکو موتعە تا سەردەمی عومەر زۆر بڵاونەبۆوە، بەڵام کاتێك بڵاوبووەوە، جیاوازی کەوتە نێوان خەڵکەوەو جارێکی تر حەرامییەکەی ئاشکراو بڵاوبۆوە".[٣١٤]

هەروەها (عومەر) لە خۆیەوە نەهی لێنەکردووە، بەڵکو پشت بەستوو بە نەهی پێشتر، کە لە پێغەمبەرەوە ﷺدەرچوو بوو، تەنها (عومەر) لە سەردەمی خۆیدا تازەی کردەوەو بڵاوتری کردەوە، بە بەڵگەی:

١- (ابن عمر) دەڵێ: کاتێ عومەر دەستەڵاتی گرتە دەست، وتاریدا، وتی: "پێغەمبەر ﷺبۆ ماوەی سێ ڕۆژ مۆڵەتی موتعەی بۆ ئێمەدا، پاشان قەدەغە و حەرامی کرد".[٣١٥]

٢- (ابن المنذر) و (بيهقی) لە (ابن عمر)ەوە، ڕاشکاوانەتر ئەم باسە دەگێڕنەوە، کە (ابن عمر) وتویەتی: (عومەر) سەرکەوتە سەر مینبەرەکەو پاش سوپاس وستاییشی خوا، وتی: "ئەوە چیانە! هەندێك پیاوان دەچن ئەم جۆرە موتعەیە دەکەن، لە پاش ئەوەی، کە پێغەمبەر ﷺنەهی لێکردووە".[٣١٦]

١٧٩- لە هەمووی خۆشترو سەیرتر، (مەریوان) خۆی لەو خەڵکە دەکات بە فەرموودەناس و قسە لە (تضعيف وتصحيح) دەکات، وا دەزانێ، کە ئەمەش دروستکردنی (شهادة)ی تەزویری پۆلی سێی ناوەندییە، تا لە جێگەیەك خۆی پێدابمەزرێنێت، لە لاپەڕە (٣٠١)دا، لە بارەی فەرموودەکەی، کە باس لە حەرامییەتی موتعە دەکات لە فەتحی مەککە و لە (صحيح مسلم)دا هاتووە، مەریوان بەدڵی نییەو ئاوا ڕەخنەی لێدەگرێت و دەنووسێت:

"بەڵام لەم ڕیوایەتەدا یەکەم: باوکی ڕاوی بۆ ئەو گوتەیەی (محمد) دیارنییەو ئێمەش ناتوانین بیکەینە دەستەواژەیەکی ڕەسمی، دووەم: ڕاویەکە دەڵێت باوکم بۆی باس کردووم، ئەم جۆرە ڕیوایەتانەش بە هەند وەرناگیرێ، سێهەم: ئەم ڕیوایەتە ووتراوە ئینجا ئایەتەکە دەرکەوتووە".

دەڵێین:

بیانووەکانی مەریوان، دەربارەی ئەم فەرموودەیە ناتەواوەو ئەوەندە بەسە، کە کەڵەزانایەکی وەك (مسلم) بە چەندین ڕێگە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، جگە لەوەی مەریوان هیچ پێشینەیەکی نییە لە وتەی زانا بەڕێزەکان، بەدەر لە خەیاڵی سەقەتی خۆی، هیچی دیکە نییە، دەربارەی ئەو سێ بڕزکاندنەشی دەڵێم:

---

[٣١٣] (صحيح مسلم) باب/ نكاح المتعة.

[٣١٤] زاد المعاد، ج٣، ص٤٦٣-٦٤، فتح الباری، ج٩، ص١٩٨.

[٣١٥] رواه ابن ماجه. هەروەها فتح الباری، ج٩، ص١٩٨.

[٣١٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١– کە دەڵێ: "باوکی ڕاوی بۆ ئەو گوتەیەی (محمد) ﷺ دیار نییە, ئەمە هەر زۆر ناتەواوە، چونکە ئەگەر مەبەستی لە (محمد) پێغەمبەرە ﷺ, کە من وای بۆ دەچم، چونکە مەریوان زمانی لاڵە لە بەڕێز ڕاگرتنی ئەو سەروەری مرۆڤایەتییە ﷺ، ئەگەر مەبەستی ئەو بێت، ئەمە وانییە، چونکە ڕاوییەکە کە (ربیع)ی ناوە, باوکی ناوی (سبرة بن معبد)ە، کە بە ئاشکرا لە ڕشتەکەدا هەیە، چونکە (مسلم) بە چەند ڕێگەیەك تا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر ﷺ گێڕاویەتییەوە، بۆ نموونە:

لە ڕشتە (سند)ێکیا (مسلم) دەڵێ: "حدثنا محمد بن عبدالله بن نمير حدثنا ابى، حدثنا عبدالعزيز بن عمر، حدثني الربيع بن سبرة الجهني ان باه حدثه، انه كان مع رسول الله ﷺ...........". [٣١٧]

٢– لە بارەی ڕەخنەی دووەمی مەریوانیش، کە دەڵێ: "باوکم بۆی ......ئەم دەستەواژەیەش........" ئەم قسەیە سەد لە سەد, پێچەوانەی زانستی فەرموودەناسییە، چونکە لە زانستی فەرموودەناسیدا, کە (بەرزترین پلە لە گێڕانەوە لە کەسێکی ترەوە ئەوەیە, کە ڕاویەکە دەڵێت: "سمعت، حدثنا، حدثني" واتە: "بیستم، بۆی گێڕاینەوە، بۆی گێڕامەوە"، وەك (خەطیبی بەغدادی) و (ابن کثیر) دەڵێن: "بەڵکو بەرزترین دەستەواژە لەم سیانەدا دەستەواژەی (حدثني)یە (بۆی گێڕامەوە)". [٣١٨]

٣– کە دەشڵێت: "ئەم ریوایەتە ووتراوە، پاشان ئایەتەکە دەرکەوتووە". ئەمەش وانییە, چونکە:

أ– گەر مەبەست ئایەتی (٢٤)ی سورەتی﴿النساء﴾ە، وانییە, چونکە هەتا زانایان ڕاجیاییان هەیە, کە ئەو ئایەتە, ئەو ئاماژەیەی تێدابووە لە سەرەتاوە بە کردنی موتعە یان نا؟ هەتا زانایەکی وەك (خووەیز مەنداد) دەڵێ: "دروست نییە ئەم ئایەتە ئاوا لێکبدرێتەوە، کە بووترێت بەڵگەیە لە سەر ڕەوایەتی موتعە". [٣١٩]

ب– هیچ ئاماژەیەکی ڕاشکاو و دروست نییە باس لەوە بکات، کە ئەو ئایەتە لە دوای فەرموودەکەوە دەرکەوتووە، هیچ شتێکیش بە گومان ناچەسپێت، ئەوە تەنها بۆچوونی سەقەتی پڕ لە سێکسیی مەریوانە بۆ شتی وا دەچێت، گەر نا, بۆ نەیتوانیوە لە سەر ئەم درۆیانەی، گەر بە فێڵیش بێت, (وەك هەمووجارەکانی تر) ئاماژەی دەدا بە سەرچاوەیەك، بەڵام کە نەیکردووە، پێی نەکراوە!.

<u>تێبینی:</u>

مەریوان، لە لاپەڕە (٣٠١–٣٠٢)دا، ناوی چەند سەرچاوەیەکی نووسیوە، منیش لێرەوە, داوا لە هەموو ئەو کەسانە دەکەم، کە توانایەکی زانستییان هەیە, بگەڕێنەوە سەر ئەو سەرچاوانە, تا لەوێدا ریسوایی و شەرمەزاریی مەریوانتان بۆ ئاشکرابێت.

١٨٠– لە لاپەڕە (٣٠٣)دا, لە بارەی "موتعە"وە, دەڵێ: "ئوممەی ئیسلام بە (فیقە) و زانایان و مەزهەبەکانەوە لە سەر ئەوە هاوڕان، کە ئەم جۆرە زەواجە.....خوا شەرعیەتی پێداوە و ئەم زەواجە شەرعیەو یەکێکە لە حوکمە چەسپیوەکانی قورئان".

دەڵێین:

ئەو قسەیە وەهانییە بەو ڕەهاییە، چونکە خیلاف و ڕاجیایی هەیە, کە ئایا لە قورئاندا باسی "موتعە" هاتووە، یان نا؟ ئەمەش لە ئایەتی (٢٤/النساء)دا, سەرچاوە دەگرێ, کە هەندێك دەیکەنە بەڵگە بۆ ڕەوایی و باسکردنی "موتعە"، بەڵام لە بەرامبەردا دەستەیەکی زۆر لە زانایان ئەمە ڕەتدەکەنەوە, کە مەبەست لێی "موتعە" بێت، گەورەترین بەڵگەش هۆی هاتنە خوارەوەکەیەتی, کە بە هیچ جۆرێك باس لە "موتعە" ناکات.

---

[٣١٧] صحيح مسلم (١٤٠٦)، ٢١.

[٣١٨] تدريب الراوى، ج١، ص٤١٩/ اقسام طرق تحمل الحديث، الباعث الحثيث، ص٣٢٨–٣٢٩ تعليق/محمد ناصرالدين الالباني وتحقيق/عبدالحميد على حسن: انواع تحمل الحديث.

[٣١٩] القرطبي، ج٥، ص١٢٩ المسألة التاسعة.

ا – (ابوسعیدی خدری) دەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی (حنین)دا, دەستەیەك لە سوپاكەی نارد بۆ (اوطاس) و لەوێ تووشی دوژمن دەبن و لەگەڵیاندا بە شەڕدێن و سەردەكەون، چەند ئافرەتێكیان لێ بەدیل دەگرن، هەندێك لە هاوەڵان بە لایانەوە گران بوو, بچنە لای ئەو ئافرەتانە، چونكە خاوەنی مێرد بوون لە بێباوڕان، ئیتر ئەم ئایەتە (والمحصنات من النساء الا ما ملكت ايمانُكم) دابەزی".[٣٢٠]

ب – هەندێك لە پیاوان مارەیان دانابوو بۆ ژنەكانییان، جا ئەوەكو لە دوایدا تووشی هەژاریی ببن و نەتوانن ئەو مارەییە بدەن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿ولا جناح عليكم فيما تراضيتم به﴾النساء/[٣٢١] ٢٤.

ج – (ابن كثير) لە تەفسیری ئەم ئایەتەی سورەتی (النساء)دا, وتەیەكی (مجاهد) دێنێ، كە دەڵێ: "ئەم ئایەتە لە بارەی نیكاحی (موتعە)وەیە"، بەڵام (ابن كثير) وەڵامی دەداتەوەو دەڵێ: "بەڵام جەماوەری زانایان بە پێچەوانەی ئەمەوەن".[٣٢٢]

د – (ابن خويز منداد) دەڵێ: "دروست نییە ئەم ئایەتە وا لێكبدرێتەوە، كە بوترێت بەڵگەیە لە سەر دروستی موتعە".[٣٢٣]

ه – هەتا پێغەمبەر ﷺ زۆر بەڕوونیی لە فەتحی مەككەدا بە خەڵكی دەڵێت: "ئەی خەڵكینە من لەوەو پێش مۆڵەتمدان (موتعەی) ئافرەتان بكەن، وەخوای گەورە تا ڕۆژی دوایی ئەمەی حەرام كرد"، (يا ايها الناس اني قد اذنت لكم في الاستمتاع من النساء، وان الله قد حرَّم ذلك الى يوم القيامة).[٣٢٤]

و – (ابن المنذر) دەڵێ: "لە هەندێك لە پێشینەكانەوە گێڕدراوەتەوە, كە (موتعە) رووخسەت دراوە، بەڵام ئەمڕۆ كەسێك نازانم ڕێ بەم (موتعە)یە بدات، جگە هەندێك لە (رافيزى)یەكان، هەر وتەیەكیش پێچەوانەی قورئان وسوننەت بێت بێمانایە".[٣٢٥]

مەبەست:

مەبەست لە باسكردنی ئەمانە ڕەتكردنەوەی ئەو قسەیەیە، كە مەریوان نووسیویەتی گوایە یەكدەنگی هەیە, كە لە قورئاندا باسی (موتعە) هەبێ.

كەواتە ئەو بانگەشەیە وا دەرنەچوو، هەر شتێكیش جیاوازی تێدا بوو, بانگەشەكردنی كۆدەنگی لە سەری, كارێكی نادروست و نازانستییە، بەڵكو ئایەتەكە لە سەر بۆچوونی (جەماوەر)ی زانایان باس لە مارەیی و هێنانی ئافرەتێك دەكات، كە لە جەنگدا دەگیرێت، وەك لە هۆی نازڵبوونەكەیدا زۆر بە ڕوونی دیارە.

هەروەها بەڵگەی تر لە سەر ئەوەی، كە ئەو ئایەتە مەبەست لێی "نیكاحی موتعە" نییە:

ا – خاوەنی (تفسير الواضح) كە یەكێكە لە زانا بەناوبانگەكانی ڕاڤەی قورئان, لە تەفسیرەكەیدا, ئەو ئایەتەی سورەتی (النساء) بەوە لێك دەداتەوە, كە باس لە نیكاحی دروست "صحيح" دەكات نەك "موتعە".[٣٢٦]

ب – خاوەنی تەفسیری (ايات الاحكام) –شێخ محمد علی السایس–ی بەناوبانگ, دەڵێ: "وتەی پەسەند ئەوەیە، كە ئەم ئایەتە لە بارەی (موتعە)وە نییە (والراجح ان الاية ليست فى المتعة)".[٣٢٧]

---

[٣٢٠] صحيح مسلم باب/ جواز وطء المسبية بعد الاسبراء(١٤٥٦).

[٣٢١] لباب النقول في اسباب النزول، للسيوطى بزيل تفسير الجلالين.

[٣٢٢] ابن كثير, تەفسیری ئایەتی(٢٤)النساء.

[٣٢٣] القرطبى، ج٥، ص١٢٩.

[٣٢٤] صحيح مسلم، باب/ نكاح المتعة و بيان انه اُبيح ثم نسخ..... .

[٣٢٥] فتح البارى، ج٩، ص١٩٩.

[٣٢٦] تفسير الواضح، ج٥، ص٣ –٤ محمد محمود حجازى.

[٣٢٧] تفسير ايات الاحكام، ص٧٦, محمد علی السایس.

ج- (ابن الجوزی) کە یەکێکی ترە لە کەڵەزاناکانی تەفسیر, دەڵێ: "بە ڕاستی هەندێك لە موفەسیرین زۆریان لە خۆیان کردووە، کە وتویانە ئەم ئایەتە مەبەست لێی "نیکاحی موتعە"یە، پاشان بە سوننەت نەسخ بۆتەوە، بە ڕاستی ئەمە زۆر لە خۆکردنێکە، کە پێویست بەوە ناکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ سەرەتا ڕێی بە موتعەدا، پاشان قەدەغەی کرد، کەواتە وتەکەی نەسخ کردووە بە وتەکەی خۆی، بەڵام سەبارەت بە ئایەتەکە, ئەوە بە هیچ جۆرێك دروستی (موتعە) لە خۆ ناگرێت, بەڵکو مەبەست لە ئایەتەکە, چێژ وەرگرتنە لە نیکاحێکی (صحیح)".[328]

د- هەروەها خاوەنی تەفسیری (خازن)یش باس لەوە دەکات, کە ئەم ئایەتە باس لە "نیکاحی شەرعی" دەکات و دواتر وتەکەی (ابن الجوزی) کە پێشتر نووسیمان، ئەویش دەهێنێ و دەیکاتە بەڵگە.[329]

هـ- (فەخری رازی) کە مەریوان وەك سەرچاوە ئاماژەش بەمە دەدات، لە تەفسیرەکەیدا زۆر بە درێژیی و بەڵگەی جوان لە سەر ئەو ئایەتە دەدوێ و دەربارەی ئایەتەکە, دەڵێ: "وتەی زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئوممەتی ئیسلام, لە سەرئەوەیە، کە مەبەست لەو ئایەتە ئەوە بێت، کە بچن بە دوای ژندا بگەڕێن و پارەی تێدا خەرج بکەن بە ڕێگەی هاوسەرگیریی (النکاح) پاشان باسی مارەی دەکات".[330]

و- (مازەری) وەك لە شەرحی (صحیح مسلم)دا, پێشەوا (نەوەوی) وتەکەی دەهێنێ، دەڵێ: "جێگیرو یەکلابۆتەوە کە (نکاح المتعة) لە سەرەتای ئیسلامدا هەبووە، پاشان بە چەندین فەرموودەی ساغ ودروست یەکلابۆتەوە، کە هەڵوەشاوەتەوە، پاشان یەکدەنگی لە سەر حەرامێتییەکەی کراوە، کەس پێچەوانەی ئەمە نییە، جگە لە دەستەیەك لە بیدعەچییەکان......، وە ئەوانەی ئەو ئایەتە (فما استمتعتُم....) دەکەنە بەڵگەو بە خوێندنەوەی (ابن مسعود) کە خوێندویەتییەوە (الی اجل مسمی) ئەمە شازەو ناکرێتە بەڵگە, نە وەك قورئان، نە وەك هەواڵ، نە وەك کار پێکردن".[331]

ز- خاوەنی (سبلُ السلام) دەڵێ: "ئەم فەرموودەیەی (سەلەمە)، -واتە ئەوەی لە (صحیح مسلم)دایەو و باس لە جەنگی (أوطاس) دەکات، کە لە پێشەوە باسمان کرد- ئەوە دەگەیەنێت, کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی (موتعە)ی داوەو پاشان نەهی لێکردووە، وە ئەم نەهییەش بەردەوام بووەو ڕێپێدانەکە نەسخ بۆتەوە، کە ئەمەش نەسخ بۆتەوە, جەماوەری زانایان لە پێشینەو پاشینەکان لە سەرئەمەن".[332]

ح- هەروەها خاوەنی (الفقه الواضح)یش وای بۆچووە، کە ڕەوایی و قەدەغەکردنی "موتعە" بە سوننە بووە، واتە پێغەمبەر ﷺ خۆی, سەرەتا بە ڕەوای بینیوە لە کاتی ناچاریدا بۆ خەڵکی و دوایی قەدەغەی کردووە.[333]

ط- هەروەها (سیوطی) لە تەفسیرەکەیدا, پشت بەستوو بە سێ هۆکاری هاتنە خوارەوەی دروست، ئەو ئایەتە بە (نیکاحی ئاسایی) تەفسیر دەکات.[334]

ی- (ابن الحزم) لە (المحلی)دا، لە باسی "موتعە"دا, ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ڕەوابووە، بەڵام پاشان خوا لە سەر زاری پێغەمبەرەکەیەوە هەڵیوەشاندۆتەوە بە هەتا هەتایی، تا ڕۆژی دوایی، بە بێ ئەوەی باسی ئەو ئایەتەی (النساء) بکات.[335]

- لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، کە لە (المحلی)دا (ابن حزم) لە (١٥) جێگەدا, ئەو ئایەتەی (النساء)ی هێناوەو کردویەتییە بەڵگە بۆ بابەتی جیا جیا، بەڵام بە هیچ جۆرێك نەیکردۆتە بەڵگە، یان تەنانەت هەر باسیشی نەکردووە بۆ

---

[328] روائع البیان، ج١، ص٤٦٠, محمد علی صابونی.

[329] تفسیر الخازن المسمی، لباب التأویل في معاني التنزیل: علاءالدین علي بن ابراهیم البغدادي المعروف بالخازن, ج١, ص٣٤٣-٣٤٤.

[330] التفسیر الکبیر، ج١٠، ص٤٩.

[331] شرح مسلم، باب/ نکاح المتعة و بیان انه أبیح ثم نسخ....للنووی.

[332] سبل السلام/ نکاح المتعة حرام، ج٦، ص ٦١-٦٢.

[333] الفقه الواضح، ج٢، ص٨٥، د.محمد بکر اسماعیل.

[334] تفسیر الجلالین و بزیله لباب النقول فی اسباب النزول.

[335] المحلی، ج١١، مسألة (١٨٩٨).

باسی "نكاحی موتعە"، پێموایە، ئەگەر بە ئەستەمیش بیزانیبایە، ئەو ئایەتە دەستدەدا بۆ كردنە بەڵگەیەك، یەك چركە لێی ڕانەدەوەستاو دەیكردە بەڵگە، یان هیچ نەبێت لەو بابەتەدا باسی دەكرد.

ك- (نەوەوی) لە سەر فەرموودەكەی (فەتحی مەككە)، كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "خەڵكینە من كاتی خۆی ڕێگەم دابوون "موتعە" بكەن، بەڵام ئیتر وا حەرامم كرد....". دەڵێ: "ئەم فەرموودەیە بە ڕاشكاوانە ئەوەی تێدایە، كە (ناسخ و منسوخ)ەكەش لە وتەی پێغەمبەرن ﷺ". [٣٣٦]

ئەمە كورتەیەكی پوخت بوو، لە سەر ئەو گومانانەی، كە مەریوان لە سەر ئایەتی (٢٤)ی سورەتی (النساء) هێنابووی، كە گوایە "یەكدەنگی لەسەرە". ڕاستی ئەوەش دەردەخات، كە بە هیچ جۆرێك پەیوەندی بەو بابەتەوە نییە، ئەگەر چی هەندێكیش وا گومان بەرن!.

١٨١- سەبارەت بە هەندێك گومانی تریش، كە گوایە (عومەر) دواتر "موتعە"ی قەدەغە كردووە، لە لاپەڕە (٣٠٣) بەدواوە، چەند شتێك لەو بارەیەوە دەهێنێت، كە گوایە یەكەم كەس "موتعە"ی حەرام كرد (عومەر) بووە، ئەمەش وانییە، چونكە:

١- چەندین دەق لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە، كە "موتعە"ی حەرام كردووە، كە لە (صحیح البخاری ومسلم)دا، باسیان هاتووەو هەندێكیشمان لەپێشەوە نووسی.

٢- ئەوەی كە دەووترێ: "لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ و أبوبكرو عومەردا موتعەكراوە"، بەو جۆرە لێك دەدرێتەوە كەسانێك كردوویانە، كە نەسخەكەیان پێنەگەیشتووە، وەك (نەوەوی) و دواتریش (ابن الحجر)و پێش ئەویش (ابن القیم) ئاماژەیان بۆ كردووە. [٣٣٧]

زۆر ئاساییە، كە چەندین كەس هەبێ، پاش ماوەیەكی دوور، ئینجا بڕیارێكی پێگەیشتبێ، بۆ نموونە: ئەوەتا (عمر)، پاش چەندین ساڵ و تا سەردەمی خەلافەتی خۆی، ئەو فەرموودەیەی نەبیستبوو وەپێی نەگەیشتبوو، كە باس لە دەستووری ئەوە دەكات: "گەر سێ جار لە دەرگاتاندا كەس وەڵامی نەدانەوە، بڕۆن"، تا (ابو موسی) و دەستەیەك لە هاوەڵان پێی دەڵێن. [٣٣٨]

٣- بەڵكو ئەوەی (عومەر) كردوویەتی، تەنها زیاتر توندكردنی بڕیارەكە بووەو بڵاوبوونەوەی زیاتری بووە لە ناو خەڵكیدا، ئەوەتا بە ڕاشكاوانە (عومەر) لە وتارەكەیدا بۆ خەڵكی، دەڵێت: "أن رسول الله ﷺ أذن لنا في المتعة ثلاثا ثم حرمها والله لا اعلم احدا تمتع وهو محصن الا رجمته بالحجارة". [٣٣٩]

واتە: "پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتیدا بۆ ئێمە، كە تا سێ ڕۆژ موتعە بكەین، بەڵام دواتر حەرامی كرد، سوێند بە خوا، هەر كەسێك بزانم كاری وا دەكات و خێزانی هەبێت، ئەوا بەرد بارانی دەكەم".

ئەمە، زۆر بەڕوونیی ئەوەی تێدایە، كە عومەر دەڵێ: "دواتر حەرامی كرد".

هەتا لە گێڕانەوەی كوڕەكەیدا، هاتووە: كاتێ عومەر دەچێتە سەر مینبەر، دەڵێ: "ئەوە چییە هەندێك لە پیاوان (موتعە) دەكەن، لە پاش ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێكردووە". [٣٤٠]

كەواتە، عومەر، پشتبەستوو بە نەهیەكەی پێغەمبەر ﷺ نەهی لە خەڵكەكە كردووە، دەبێ بەم جۆرە لێك بدرێتەوە، دەنا دژایەتی لە نێوان دەقەكاندا ڕوودەدات.

شتێكی زۆر سەیرە، (عومەر) خۆی بە دەمی خۆی، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەهی لێكردووە، كەچی خەڵكیكی عەقڵبەستوو بڵێن (عومەر) بووە!.

---

[٣٣٦] شرح صحیح مسلم، باب/ نكاح المتعة.....

[٣٣٧] شرح صحیح مسلم، باب/ نكاح المتعة......، زاد المعاد، ج٣، ص٤٦٣، فتح الباری، ج٩، ص١٩٨، ڕاڤەی فەرمووده (٥١١٧-٥١١٨).

[٣٣٨] صحیح مسلم/ كتاب الاداب، باب/ الاستئذان.

[٣٣٩] سنن ابن ماجه، رقم(١٩٦٣).

[٣٤٠] رواه ابن المنذر البیهقی، فتح الباری، ج٩، ص١٩٨، ڕاڤەی فەرمووده (٥١١٧و٥١١٨).

٤ – خستنەپاڵی نەسخی "موتعە" بۆ لای (عومەر)، بە بێئەوەی عومەر ئەمەی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگرتبێ، کافر کردنی (عومەر) دەگەیەنێت، شتی واش هەرگیز نابێت، چونکە (عومەر) لە هەموو کەس دوورترە، گەر شتێ لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبیستێ، لە خۆیەوە حەرامی بکا.[٣٤١]

کەواتە، عومەر تەنها بابەتەکەی ئاشکراتر و بڵاوترو توندتر کرد.

**حەرامییەتی "موتعە" یەکدەنگییەو بایەخ بە جیاوازیی (شیعە) نادرێ**

وەك ئەهلی سوننە "موتعە" حەرام و قەدەغەیە، تا ڕۆژی دوایی، ئەمە وەك یاسایەك دەبێ پەیڕەویی لێبکرێ، گەرچی، لە سەرەتاوە، جیاوازییش هەبوو بێ، دواتر بەیەکدەنگیی هەموو زانایانی ئیسلام (بەدەر لە شیعە، کە شیعە بایەخ بە بۆچوونەکانییان، لەو بارەوە نادرێت) لە سەر ناڕەوایی "موتعە" دامەزراون.

(مازەری) دەڵێ: "یەکدەنگیی لە سەر حەرامییەتی (موتعە) هەیە، کەس پێچەوانەی ئەمە نییە، جگە لە دەستەیەك لە (بیدعەچییەکان)".[٣٤٢]

(قاضی عیاض) دەڵێ: "یەکدەنگیی زانایان لە سەر حەرامییەتی هەیە، جگە لە (ڕافیز)ەکان".[٣٤٣]

(خەطابی) دەڵێ: "حەرامبوونی (موتعە) وەك یەکدەنگیی وایە، تەنها هەندێك لە (شیعەکان) نەبێت، کە لایان ڕەوایە".[٣٤٤]

(قورتوبی)دەڵێ: "گێڕانەوەکان هەر هەموویان لە سەرئەوەن، کە زەمەنی (موتعە) زۆری نەخایاند، کە دوایی حەرام بوو، پاشان یەکدەنگیی پێشینەو پاشینە (السلف والخلف) لە سەر حەرامییەتی دامەزراوە، جگە لە هەندێك لەو کەسانەی، کە ئاوڕ لە بۆچوونەکانییان نادرێتەوە لە (ڕافیزە)کان".[٣٤٥]

(صدیق حەسەن خان) دەڵێ: "لە (شرح السنة)دا هاتووە، کە حەرامێتی (موتعە) وەك یەکدەنگیی هەموو موسوڵمانان وەهایە".[٣٤٦]

تێبینییەك:

ئەوەی، کە گوایە (ابن عباس) بە ڕەوای بینیووە، زۆرێك لە سەرچاوە ڕەسەنەکان باس لەوە دەکەن، کە دوایی پەشیمان بۆتەوە

بۆ ئاشنابوونی زیاتر لە سەر "موتعە" بڕوانە:

١ – فتح الباری شرح البخاری، ج٩، ص ١٩١–٢٠٠، باب/ نهی رسول ﷺ عن نكاح المتعة اخيراً.

٢ – شرح صحيح مسلم للنووي، باب/ نكاح المتعة و بيان انه ابيح ثم نسخ...، ص٣٠٠–٣٠٨.

٣ – تفسير القرطبي، ج٥، ص١٢٩–١٣٥.

٤ – ابن كثير، ج١، ئايەتی (٢٤)ی النساء.

٥ – تفسير الجلالين.

٦ – مختصر تفسير الطبري، ج١، ص١٤٧.

٧ – تفسير الخازن، ج١، ص٣٤٣–٣٤٤.

٨ – التفسير الكبير، ج١٠، ص٤٨–٥٣.

[٣٤١] التفسير الكبيرج١٠، ص٥٠.

[٣٤٢] شرح مسلم، باب/ نكاح المتعة..... .

[٣٤٣] هەمان سەرچاوە.

[٣٤٤] فتح الباری، ج٩، ص١٩٩.

[٣٤٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٤٦] الروضة الندية شرح الدرر البهية، ص٣٤، فصل الثانی الانكحة المحرمة.

٩– تفسير الواضح، ج٥، ص٣–٤.

١٠– تفسير ايات الاحكام، ص٧٦.

١١– روائع البيان تفسير ايات الاحكام، ج١، ص٤٥٧–٤٦٠.

١٢– بداية المجتهد, ج٢، ص٦٨، ابن رشد.

١٣– زاد المعاد في هدى خير العباد، ج٣، ص٣٤٣–٣٤٥ و ص٤٥٩–٤٦٤ و ج٥, ص١١–١١٢.

١٤– المحلى لابن حزم، ج١٤١، المسألة (١٨٥٨).

١٥– الفقه الواضح، ج٢، ص٨٥–٨٦.

١٦– سبل السلام الموصلة الى بلوغ المرام، ج٦، ص٦١–٦٢.

١٧– وبل الغمام على شفاء الاوام، ج٢، ص٢٣–٢٥.

١٨– الروضة الندية شرح الدرر البهية، ج٢، ص٣٤–٣٦.

١٩– رحمة الامة في اختلاف الائمة، ص٣٩٨.

٢٠– الآم، م٣، ج٥، ص٨٥–٨٧، نكاح المحلل ونكاح المتعة.

پاش ئەمە, ئێستا دەگەڕێینەوە سەر وەڵامەکان، کە پێموایە لە بارەی "موتعە"وە, مافی خۆیمان دابێتێ, بۆیە گەر زۆر پێویست نەکات, ناچمەوە سەر ئەو چەمکە.

١٨٢– لە لاپەڕە (٣٠٣–٣٠٤)دا, دەنوسێ: "یەکەم بەڵگەی حاشا هەڵنەگر ئەوەیە کە خەلیفەی دووەم لە تەمەنی شەش ساڵەی خەلیفایەتی خۆیدا ئەم دیاریدەیەی حەرام کرد, (سیوطی) دەڵێ: یەکەم کەس (موتعە)ی حەرام کرد عومەر بوو". پاشان وەك سەرچاوە ئاماژە بە (تأريخ الخلفاء)ەکەی (سیوطی) دەدا.

دەڵێین:

ئەمە وەها نییە, چونکە:

أ– لە (تاريخ الخلفاء)ەکەی (سیوطی)دا, ساڵەکە دیاری ناکات.

ب– (سیوطی) لەو کتێبەیدا, (فصل)ێکی نوسیووە, دەربارەی ئەوانەی (عومەر) دەستپێشخەریی تێدا کردووە, پاشان لە (العسكري)یەوە دەگێڕێتەوە... یەکەم کەسیش "موتعە"ی حەرام کرد (عومەر) بوو.[٣٤٨]

ئەوەی لاوازیی ئەم گێڕانەوەی (العسكري) دەردەخات ئەوەیە، کە باسی دوو شتی زۆر دیاری کردووە, کە گوایە (عومەر) یەکەم کەس بووە ئەنجامی داوە:

١– چوار (الله اكبر) کردن لە نوێژی مردوو.

٢– وتنی: "اطال الله بقاءك" گوایە کە (عومەر) بە (عەلی) وتووە.[٣٤٩] أ – سەبارەت بە یەکەمیان، وەهانییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ, نوێژی مردووی لە سەر چەندین کەس کردووەو چوار (الله اكبر)یشی کردووە, بۆ نموونە: کاتێ نوێژی لە سەر گۆڕی ئافرەتێك کرد, کە نەخۆشییەکی درێژ خایەنی هەبوو, پاشان مرد.[٣٥٠]

یان کاتێ, کە نوێژی مردووی بە غائیبی کرد بۆ (نەجاشی) چوار (الله اكبر)ی کرد.[٣٥١]

یان ئەو پیاوەی, کە پێغەمبەر ﷺ سەردانی دەکردو کاتێ مرد، لە نوێژەکەیدا, چوار (الله اكبر)ی لە سەر کرد.[٣٥٢]

هەروەها چەندین فەرموودەی تر لەم بارەوە، کە ئەو قسەیەی (العسكري) پووچ دەکەنەوە.[٣٥٣]

---

[٣٤٨] تاريخ الخلفاء, فصل في اوليات عمر.

[٣٤٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٥٠] رواه (البيهقي والنسائي)، احكام الجنائز، ص١١٥، للالباني.

[٣٥١] صحيح مسلم (٩٥١) باب/ في التكبير على الجنازة.

[٣٥٢] احكام الجنائز، ص١١٢.

ب – وتنی "اطال الله بقاءك" ئەمە باش نییە بوترێ، وەك (ابن القيم) باسی دەكات، كە یەكێكە لەو لەفزانەی كەراهەتی هەیە بوترێ، هەتا(اسماعيل بن اسحاق) دەڵێ: "یەكەم كەسێك كە (اطال الله بقاءك)ی نووسیووە و دایهێنا بێدینەكان (زەندیق) بوون". [٣٥٤] جا وشەیەك كە باش نەبێت، چۆن كەسێكی وەك عومەر بەكاری دێنێت، بە تایبەت كە بێدین بەكاری بێنێت

١٨٣ – لە لاپەڕە(٣٠٤)دا، ئەم دەقە دەنوسێ: "عن بن عباس: ان عمر بن ﷺالخطاب نهى عن المتعة، و قال انما احل الله ذلك للناس على عهد رسول الله". پاشان دەیكات بە كوردی، وەكو سەرچاوەش ئاماژە بە (سنن الدار قطنى) –دەدات.

دەڵێین:

ئەمەش یەكێكیترە لە چەواشەكارییەكانی، ئەو دەقەی مەریوان هێناویەتی و دەیكاتە بەڵگە، گوایە (عومەر) "موتعە"ی حەرام كردووە، ئەمە وانییە، چونكە ئەو دەقە لە (سنن الدار قطنى)دا، بڕگەی تری لە گەڵدایە، كە مەریوان بە درۆ دەخاتەوە، بەڵام مەریوان بە مەبەست نەیهێناوە، ئەمە تەواوی دەقەكەیە:

"عن ابن عباس ثم ان عمر نهى عن المتعة التي في النساء، وقال: انما احل الله ذلك للناس على عهد رسول الله ﷺ، والنساء يومئذٍ قليل، ثم حرم عليهم بعد....". [٣٥٥]

واتە: عومەر، نەهی كرد لە "موتعە"ی ئافرەتان، وە دەیوت: خوا ئەمەی لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺحەڵاڵ كرد، وە ئافرەتیش كەمبوو لەو ڕۆژەدا، بەڵام دوایی حەرامی كرد لە سەریان. . .

جا بەڕێزان:

ئەمە ناپاكیی نییە بەرامبەر بە مێژوو، مەریوان، لەم قسەیەی (عومەر)دا وەك ئەو كەسەی لێهات، كە لەگەڵ كەسێكی تردا موناقەشەی دەكرد، بەرامبەرەكەی ویستی بڵێ: "لا الە الا الله"، كاتێ كە وتی "لا الە...". هێشتا تەواوی نەكردبوو، كابراكە پێیوت: تۆ كافر بوویت، چونكە وتت: "هیچ خوایەك نییە"، كابراكەش پێی دەڵێ: ئاخر تۆ ماوەت نەدام، وشەكە تەواوكەم، من دەمویست بڵێم: "لا الە الا الله"، بەڵام تۆ لە "لا الە"دا ، منت ڕاوەستان!.

١٨٤ – لە هەمان لاپەڕەدا، خەڵكی بەشتێكی تر چەواشەكردووە، كە دەنووسێ: "هەروەها (ڕازی) باسی ئەوەی كردووە، كە عومەر موتعەی حەرام كردووە". پاشان ئاماژە بە تەفسیرەكەی (ڕازی) دەكات.

دەڵێین:

(ڕازی)، لە تەفسیرەكەیدا بە دوورو درێژیی، باسی "موتعە"ی كردووە، زۆر بە ڕێك و پێكی وەڵامی ئەو گێڕانەوەی (عومەر) دەداتەوە، كە ئەوەی پێیوایە (عومەر) موتعەی حەرام كردووە، ئەوە تۆمەتی كافركردن دەداتە پاڵ (عومەر)، چونكە (عومەر) شتێ لە خۆیەوە حەرام ناكات، ئەگەر ڕابووردوویەكی لە پێغەمبەرەوە ﷺنەبێ، بە درێژیی باسی ئەوە دەكات، كە "موتعە" لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺحەرام بووە، وە بەو جۆرەش وتەكەی (عومەر) ڕاڤە دەكات و دەڵێ: واتە منیش نەهی لێدەكەم، چونكە لە لام یەكلابۆتەوە، كە پێغەمبەر ﷺنەسخی موتعەی كردۆتەوە. كەواتە، بەم جۆرە ئەمە دەبێتە بەڵگە بۆ ئێمە. [٣٥٦]

تەفسیری (ڕازی)، هەموو بۆچوونەكانی هێناوەو گفتوگۆی كردووە، كەچی مەریوان، هاتووە لە ناو هەموو بەڵگەكاندا ئاماژە بە(ڕازی) دەكات، كە باسی كردووە، ئەی بۆچی بۆ خەڵكی ڕوون نەكردۆتەوە، كە ئایا (ڕازی) چۆن وەڵامی داوەتەوە؟!، یان ئەوەتا پیلانەكەی مەریوان سەری نەدەگرت، وەك سەریشی نەگرتووە!.

---

[٣٥٣] بروانە: احكام الجنائز (الصلاة على الجنازة).

[٣٥٤] زاد المعاد،ج٢، ص ٤٧٣، الاذكار، ص٢٢٥، (للنووي) تحقيق/ بشير محمد عيون.

[٣٥٥] سنن الدار قطنى، ج٣، ص٢٥٨ رقم(٥٣).

[٣٥٦] التفسير الكبير، ج١٠، ص٥٤، ئایەتی٢٤ النساء .

١٨٥ – لە لاپەڕە(٣٠٤)دا، بەڵگەیەکی تر دەهێنێتەوە، کە عومەر نەهی لە موتعە کردووە. لە پێشەوە بە ڕوونیی وەڵامی ئەوەمان دایەوە، لە بڕگەی (١٨١) بەدواوە، بەڵام مەریوان ئاماژە بە سەرچاوەی (سنن الكبرى)ی (بەیهەقی) دەکات، وەك سەرچاوەی قسەکەی.

دەڵێین:

١ – خۆ هەر لە هەمان باس و لاپەڕەدا، (بەیهەقی)باسی ئەوەی کردووە، کە نەهییەکەی (عومەر) موافیق و هاوتای نەهییەکەی پێغەمبەر ﷺبووە، وەك بە دەق دەڵێ: "فكان نهى عمر بن الخطاب (رضى الله عنه) عن نكاح المتعة موافقا لسنة رسولﷺ ".[٣٥٧]

٢ – هەروەها (بەیهەقی) وتەکەی (ابن عمر) باس دەکات، کە باوکی، واتە (عومەر) لە سەر مینبەر دەڵێ: "ئەوە چییە پیاوانێك موتعە دەکەن، کە پێغەمبەر نەهی لێکردووە، سوێند بە خوا هەر کەس ئەمە بکات، ڕەجمی دەکەم".[٣٥٨]

کەواتە، مەریوان ویستویەتی خوێنەر بەوە چەواشە بکات، کە شتی لەم جۆرە هەیە، بێئاگا لەوەی، کە کەسانێك دەچنەوە سەر ئەو سەرچاوانە فێڵەکانی پووچ دەکەنەوە!.

نموونەی مەریوانم، وا دێتە پێش چاو، وەك کەسێك بچێتە نێو باخێك سێوەوە، بگەڕێ، کامەی نەخۆش و ڕزیوە، ئەوە بهێنێت و دوایی بە خەڵکی بڵێ: ئەو باخە هەر ئەم سێوانەی تێدایە!.

لە سەر موتعەو بۆچوونەکان، قسەمان زۆر کرد، بۆیە بە پێویستم نەزانی لەوەو دوا درێژەی پێبدەم، چونکە ئەوانەی مەریوان دواتر هێناونی، هەندێ شتی هەر دووبارەیە.

١٨٦ – لە لاپەڕە (٣٠٥)دا، دەنوسێ: "(خولة بنت حكيم)، کە یەکێکە لەو ژنانەی خۆیان پێشکەش بە پەیامبەر کردبوو، دەچێتە لای عومەرو پێی دەڵێ: (ربیعة) موتعەی کردووەو ئێستا حەرامم بکردایە، ڕەجمم دەکرد". دواتر ئاماژە بە (الموطأ) و (سنن البیهقی) دەدات.

دەڵێین:

١ – (خەولە)، ڕاستە خۆی پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺکرد، بەڵام خۆ پێغەمبەرﷺ، نەیویست و پێشکەش کردنەکەی، ڕەتکردەوە، دواتر (عثمان بن مضعون) مارەی کرد.[٣٥٩]

مەبەستی مەریوان، کە نووسیویەتی "یەکێکە لەو ژنانەی...". ڕوون و ئاشکرایە مەبەستی بووە، کە بڵێ هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺبووە، بەڵام نازانێ، خەڵکێکی زۆر لەو زیرەکتر هەن، کە ئەو دەیەوێت چەواشەیان بکات، هەر زوو دەچنە بنج و بناوانی ئەو بابەتە و دەگەڕێن، بزانن پێشکەش کردنەکە چۆن بووە، دواتر چی بەسەر هاتووە.

٢ – دەقەکە ئاوەهایە "ان خولة دخلت على عمر بن الخطاب، فقالت: ان ربيعة استمتع بأمراة، فحملت منه، فخرج عمر فزعا يجر رداءه، فقال: هذه المتعة، ولو كنت تقدمت فيها لرجمت".[٣٦٠]

واتە: "خەولە، چوو بۆ لای عومەر و پێی وت: (ڕەبیعە) موتعەی لەگەڵ ئافرەتێکدا کردووەو سکی پڕ کردووە، عومەریش بە پەلەو شڵەژاوییەوە، چووە دەرەوەو پۆشاکەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا، وتی: ئەم کارە موتعەیە، ئەگەر من پێشتر لە بارەی موتعەوە بڕیارم بدایە، ئەوا ڕەجمم دەکرد".

کەواتە، لەبەر ئەوەی "موتعە" لە پێش عومەردا حەرام و قەدەغە کراوە، کە پێغەمبەرە ﷺو ئەویش هیچ سزایەکی دیاری کراوی بۆ دانەناوە، بۆیە عومەر وا دەڵێ. جا سەرنج بدە!.

١٨٧ – لە لاپەڕە (٣٠٦–٣٠٧)دا، دەنوسێ: "(عومەری کوڕی خەتتاب) دوو دڵ بوو لەوەی، کە لەدوای مردنی پەیامبەر بهێڵێت ژنەکانی پەیامبەر بچن بۆ عەمرەو حەج...، ئەوەی شایەنی باسە لە هەموو ساڵەکانی خەلافەتیدا تەنها ڕێگەی لە دوو ژنی پەیامبەر نەگرتووە، کە حەج و عەمرەو سەفەر بکەن، ئەو دوانەش (زەینەب)ی خۆشەویست

[٣٥٧] سنن الكبرى، ج٧، ص٢٠٦ رقم (١٣٩٤٩).

[٣٥٨] سنن الكبرى، ج٧، ص٢٠٦ رقم(١٣٩٤٩).

[٣٥٩] تفسير القرطبي، ج١٤، ص ١٦٩.

[٣٦٠] الموطأ، ص٥٤٢، رقم (١١٣٠) سنن الكبرى، ج٧، ص ٢٠٦ رقم(١٣٩٥٠).

بوو, لەگەڵ (سەودە)ی پیرو پەککەوتە, ئەوانیش سەفەریان نەدەکرد". (فکان کلهن یسافر الا زینب وسودة فانهما قالتا لاتحرکنا دابة) سوێندیان خواردبوو لە دوای پەیامبەر هیچ حەیوانێك نەیان جوڵێنێت, واتە: "لە دوای محمد کەس جووتیان نەبێت" ئەمەش وای کرد لە عومەر, کە مۆڵەتیان بداتێ هەر ساڵێك بیانەوێت, ئازادن لەوەی سەفەر بکەن, یان حەج وعەمرە بەجێ بهێنن, جگە لەو دوو ژنە, هەتا دواین ساڵەکانی خەلافەتیش هەر نەیهێشتووە ژنەکانی دیکە بچن بۆ عەمرەو حەج و سەفەر, بۆ ئەوەی کەس لەگەڵیان جووت نەبێت....,عوسمان و عبدالرحمن لەکاتی عەمرەدا هاواریان بۆ ئیمانداران کردووە, کە هیچ کەسێك موتعەی دایکانی باوەڕداران نەکات, "جووتیان نەبن"و کەسیش نزیکیان نەبێتەوە, کەسیش سەیریان نەکات". دواتر ئاماژە بە( صحیح البخاری) و( سنن الکبری)ی بەیهەقی دەدات.

دەڵێین:

لە سەر ئەم باسە, ئەم چەند ڕەخنەیەمان هەیە:

١-ئەوەی لە (صحیح بوخاری)دا هاتووە, بەو درێژییە نییە, کە مەریوان نووسیویەتی, بەڵکو هەر ئەوەندەیە:

"اذن عمر (رضی الله عنه) لازواج النبي ﷺ فی آخر حجة حجها, فبعث معهن عثمان بن عفان وعبدالرحمن بن عوف".[٣٦١]

واتە: عومەر, لە کۆتا حەج کردنی خۆیدا ڕێگەیدا بە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ, کە بچن بۆ حەج, (عوسمان و عبدالرحمن)ی لەگەڵدا ناردن.

٢- کە مەریوان دەنووسێ: "تەنها ڕێگەی لە دوو ژنی پەیامبەر نەگرتبوو...". ئەمە قسەی خۆیەتیو شتی وا لە گێڕانەوەکەدا نییە, بەڵکو ئەوەی, کە هاتووە ڕاوی, دەڵێ: "هەموو هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ حەجیان دەکرد, جگە لەو دوانەیان نەبێت".[٣٦٢]

کەواتە, ئەو دوانە, هەر بۆ خۆیان بڕیاریاندا بوو, کە هەر بۆ هیچ جێگەیەك سەفەر نەکەن, نە وەك ئەوەی مەریوان نووسیویەتی!.

پاشانیش, ئەوە گێڕانەوەکەی (بەیهەقی) کوا شتی وادەڵێ؟؟!, کە بە دەق دەڵێ: "فکان کلهن یسافرن الا زینب وسودة, فانهما قالتا: لا تحرکنا دابة". ئیتر لە کوێدا مۆڵەتی عومەر باس دەکات؟!.

٣- لێکدانەوەی "لە دوای محمد کەس جووتیان نابێت" بۆ " لا تحرکنا دابة". زۆر سەقەتەو تەنها بیری سێکسیی مەریوانە, شتی وا قبوڵ دەکات, ئەوان دەڵێن: "هیچ گیانلەبەرێك لە جێگەی خۆمان (ماڵ وشوێنی خۆمان) نامان جوڵێنێ بۆ سەفەر". دەی ئیتر باسی جووتبوون و لێکدانەوەی سێکسیی, بە ڕاستی هەم بوختانە، هەم نەخۆشی دەروونییە!, ئاخر تاکە یەك سەرچاوەی ڕەسەن و دروست و شارەزا بە زمانی عەرەبی, لێکدانەوەی وای تا ئێستا نەکردووە."ان هذا لشيء عجاب".

٤- "ئەمەش وای کرد عومەر مۆڵەتیان بداتێ....". لە کوێدا ئەمەی تێدایە, یان ئەمەش تێچەنە چەواشەکارییەکانی مەریوان خۆیەتی!.

٥- "بۆ ئەوەی کەس لەگەڵیان جووت نەبێت". تەنها بۆچوونە سێکسییەکانی مەریوانە, دەنا (عومەر) کاتێ, کە نەیهێشتووە, هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ سەفەر بکەن, لەناویشیاندا چوون بۆ حەج, چونکە ئەو پێی وابووە, کە ئەم ئایەتەی فەرمان دەکات بە مانەوەی هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکانی خۆیاندا, کە دەفەرمووێ: "وقرن في بیوتکن) الاحزاب/٣٣. گشتییەو نابێت بچنە سەفەریش, بەڵام پاشان کە بۆی دەرکەوتووە وەها نییە, ڕێگەی پێداون.

---

[٣٦١] صحیح البخاری, باب/ حج النساء, رقم(١٨٦٠).

[٣٦٢] فتح الباری, ج٤, ص٨٦.

هەتا (سودە)، یەکێکە لەو کەسانەی، کە ئەم ئایەتەی "وقرن في بيوتكن...) الاحزاب/٣٣، دەکردە بەڵگە، کاتێك پێیانوت ئەوە تۆش بۆ وەکو دەستە خوشکەکانت حەج ناکەیت؟ ئەویش دەڵێ: "من حەج و عەمرەشم کردووە، خوای گەورەش فەرمانم پێدەکات لە ماڵی خۆمدا ئۆقرە بگرم".[٣٦٣]

کەواتە، تێگەیشتنەکەی (عومەر)یش، وەك ئەوەی (سودة) وابووە، بەڵام عومەر دواتر بۆی دەرکەوتووە، کە ئایەتەکە بەو جۆرە گشتی نییە، نەك خەیاڵە سەقەتەکەی مەریوان!.

٦- "هیچ کەسێ موتعەی دایکانی.... جووتیان نەبن". لە دەقە عەرەبییەکەدا شتی وای تێدانییە، بەڵکو ئەوەی هەیە "کەس لێیان نزیك نەبێتەوە". (لا يدنوا منهن احد).

ئەمەش کارێك بووە، هەر تایبەت نەبووە بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە (سەلامی خوای لێبێت)، بەڵکو عومەر نەهی کردبوو، لەوەی پیاوو ژن پێکەوە تەوافی بەیت بکەن، هەتا جارێك، پیاوێك دەبینێ لەگەڵ ئافرەتەکاندا تەوافی بەیت دەکات، بە (گۆپاڵ)ەکەی دەستی لە پیاوەکە دەدات.[٣٦٤]

ئەم دەستوورەی عومەر (واتە بە جیا تەوافکردنی ژن و پیاو)، کەسانی تریش لە خەلیفەو دەستەلاّتدارەکانی دوای عومەر، پەیڕەوییان لێکردووە، بۆ نموونە: (ابن هشام) کە (خاڵی هشام بن عبدالملك) بوو لە سەردەمی خەلافەتی (هیشام)ی خوشکەزایدا ئەمیری حەج بوو، ئەوەی قەدەغەکردبوو، کە ئافرەتان بە شێوەیەکی ڕەها لەگەڵ پیاواندا تەوافی بەیت بکەن.[٣٦٥]

یەکێك لەو کەسانەی پەیڕەوی ئەمەی کردووە (خالد بن عبدالله القسري) بوو، کاتێ کە ئەمیری مەککە بوو لە سەردەمی خەلافەتی (عبد الملك بن مروان)، کە ئەمەیان زۆر پێشتر بووە لە سەردەمی (ابن هشام).[٣٦٦]

١٨٨- لە لاپەڕە (٣١١)دا، دەنوسێ: "زەواجی کاتی بۆماوەیەکی دیاری کراو بە پارەیەکی دیاری کراو... لە ئاینی ئیسلامدا دیاریدەیەکی شەرعی و حەلاڵە (فما استمتعتم به فهن فاتوهن اجورهن فريضة) النساء/٢٤، گرنگ ئەوەیە ژن ڕازیبێت و پیاویش کرێکەی بدات، لەلای ئیسلام موتعە نیکاحێکی حەلاڵە وەك لە پێشدا بە فەرموودەو دواجاریش بە قورئان شەرعییەتی پێدراوە". پاشان ئاماژە بە (تفسير القرطبي، ج٥، ص١٣٠) دەکات.

دەڵێین:

١- لەوەو پێش، زۆر لە سەر موتعە ڕۆیشتین، بۆیە بە پێویستی نازانم قسەکان دووبارە بێتەوە. (بڕوانە بڕگەی١٧٧و دواتر).

٢- ئەوەی مەریوان ئاماژەی پێکردووە لە (تفسير القرطبي)دا، وانییە و بە هیچ جۆرێك (قورتوبی) قسەی وا ناکات، بەڵکو (قورتوبی) بەڵگە لە سەر ناشەرعیی بوون و نەسخی موتعە دەهێنێتەوە، هەر بۆ نموونە: لە (سەعید بن المسيب) دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی: "ئایەتی (٢٤ النساء) بە ئایەتێ، کە باس لە میرات دەکات، هەڵوەشاوەتەوە، واتە بە ئایەتی(١٢/النساء)".[٣٦٧]

هەتا لە (عائشة و قاسم بن محمد) دەنووسێ: "کە ئەم دووانە وتویانە بە ئایەتی (والذين هم لفرجهم حافظون الا على ازواجهم او ماملكت ايمانهم فانهم غير ملومين) المؤمنون/٥-٦، نەسخ بۆتەوە".[٣٦٨]

ئیتر کەی (قورتوبی) ئەو قسە لووس و چەواشەکارییانەی نوسیووە؟!.

٣- هەتا پێغەمبەر فەرموویەتی: "بە نیکاحو طلاق و عیددەو میرات، (موتعە) حەرام بوو، یان ڕووخا".[٣٦٩]

---

[٣٦٣] تفسير القرطبي، ج١٤، ص١٨٠-١٨١.

[٣٦٤] فتح الباري، ج٣، ص٥٤٤، ڕاڤەی فەرموودەی ژمارە (١٦١٨)باب/ طواف النساء مع الرجال.

[٣٦٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٦٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٦٧] تفسير القرطبي، ج٥، ص١٣٠.

[٣٦٨] سەرچاوەی پێشوو.

**بە کورتی:**

مەریوان, لە لاپەڕەکانی دوایی, هەمان چەواشەکاریی و بزڕکاندنەکانی دووبارە دەکاتەوە, کە گوایە موتعە ڕەوایە, ئێمەش لە پێشتر وەڵامی ئەمانەمان داوەتەوە, پێموایە بۆ کەسی ژیرو فامیدە, ئەوەندە بەسە, گەر بە وردیی سەرنج لەو باسە بدات, کە نوسیوومە, جا ئیتر مەریوان هەر بە زۆری هێزی سێکسیی‌و نەفامیی هەر سوور دەبێت لە سەر ئەو گومانە سێکسییەی خۆی, ئەوە تەنها بۆچوونی پەتیی خۆیەتی‌و هەموو ئەو سەرچاوانەش, کە مەریوان ئاماژەی پێدەکات, تەنها بۆ چەواشەکردنی هەندێ لە خوێنەرە لاوازو بیر تەسکەکانی وەکو خۆیەتی, دەنا گەر دەچیتەوە سەر ئەو سەرچاوانە, بە پێچەوانەی مەبەستە ئاوەژووەکانی مەریوانەوەیە!.

**بەسەرها تێك**

بیرم دێت, شەوێك گەنجێك لە مزگەوت دانیشت بوو, چەند لاوێکی لە دەوروبەربوون, باسی (عوزەیر)ی بۆ دەکردن, کە سەرنج دەدەم, خۆش خۆش, دەڵێ: "عەزیز" وای کرد "عەزیز" وا چوو. منیش زۆرم پێ سەیربوو, دەموت داخۆ "عەزیز" و گوێدرێژەکەی, بۆ وا باس دەکات!, چاوەڕوانیم کرد, تا لێبۆوە, بانگم کردو لێم پرسی: ئەوە باسی "عەزیز" بوو, یان "عوزەیر"؟ وتی: "عەزیز", وتم جا شتی وا هەیە؟ وتی: بەڵێ: مامۆستا ئەوە (ابن کثیر)ە, سەیری بکە!, خۆش لەوەدا بوو, تەفسیری (ابن کثیر)یشی پێبوو لە دەرسەکەیدا کردبوویەوەو قسەی دەکرد, منیش سەیرمکردو وتم: برا ئەوە نووسراوە "عوزەیر" نەك "عەزیز", کاتێ سەیری کرد, وتی: وەڵڵا ڕاست دەکەی وایە, تومەز, چاوی ڕەشکەو پێشکەی کرد بوو,"عوزەیری" لێبوو بوو بە "عەزیز"!.

مەریوانیش, هەر هەمان شتم دێنێتەوە یاد!.

١٨٩ – لە هەمووی خۆشتر, هەر بۆ نووکتە, ئەم نەفامییەی مەریوانتان بۆ دەنوسم, لە لاپەڕە(٣١٨)دا, دەنوسێ: "لە شاری مەککە ژنێك بەناوی (صفية) کە قوڕەیشی دەبێت ماڵەکەی خۆی تەرخان کرد بوو بۆ ئەم جۆرە لەش فرۆشییە....". دواتر وەك سەرچاوەی ئەم قسەیە, ئاماژە بە (اخبار النساء)ی (ابن القیم) دەکات.

دەڵێین:

بەڕێزان, زۆر ورد سەرنج بدەن, (ابن القیم) لە کتێبی (اخبار النساء)ەکەیدا, ئاوها دەنوسێ: "کان بمکة (سفيه) يجمع بين النساء والرجال على اقبح الريب, وكان من قريش, ولم يذكر اسمه....".[٣٧٠]

(ابن القیم) قسەی (ابوالحسن المدائني) دەگێڕێتەوە, کە وتویەتی: "لە مەککە کەودەن (کاڵفام)ێك دەبێ, ئافرەتان و پیاوان لە سەر ناشرینترین شێوە کۆ دەکاتەوە, ئەم کەسە لە هۆزی قوڕەیش بوو, وە(ابوالحسن) ناوی ئەم کەسەی باس نەکردووە".

بەڕێزان:

ئاگاتان لێیە چۆن "سفيه" دەکات بە "صفية"!, نێر دەکات بە مێ, ئاخر سەد ڕەحمەت لە کوڕەی لاو, کە"عوزەیری" دەکرد بە "عەزیز", بەس نەبوو, هەر بە نێرینەیی دەیهێشتەوە, ئەمەیە سەرئەنجامی نەزانیی و نەفامیی‌و نەخوێندەواریی!.

"سفيه", بە کەسێك دەڵێن: "کەداناو ژیر نەبێت, واتە عەقڵ سووك (کاڵفام, کەودەن) بێت".[٣٧١]

---

[٣٦٩] سنن الدار قطني, ج٣, ص٢٥٩, رقم(٥٤), تفسير القرطبي, ج٥, ص١٣٠.

[٣٧٠] اخبار النساء, من احاديث المؤلفين, ص٢٠٨ .

[٣٧١] مختار الصحاح, مادة / س ف ه.

بەڕێزان:

تا ئێرە, ئەمە ئەو جێگەو شوێنانە بوون, کە مەریوان دەستکاریی دەقەکانی کردبوو, جا یان لە خۆیەوە لێی زیاد کردبوون, یان لێی قرتاندبوون, یاخود بە جۆرێك واتای لێکدابوونەوە, کە لە بنەمادا وانییەو بە پێچەوانەی مەبەستە ناڕاستەکانی مەریوانەوە بووە!.

مەبەستیشم:

دەرخستنی ئەندازەی پلەی "زانستیی", "ئەمانەت نەپارێزیی" و "هەڵخەڵەتاندنەکان"ی مەریوانە, تا خوێنەر بزانێت, کەسێك ئەوەندە کلۆڵ و چاونەترس بێت لە ناپاکیی کردن لە گواستنەوەی شتەکان, شیاوی ئەوەیە, قسەو بۆچوونەکانی وەرنەگیرێت و لەڕووی "زانستیی" و "ئەخلاقی "ەوە, متمانەی پێنەکرێ, چونکە لەم بەشەدا, نەك هەر دەردەکەوێت, کە "زۆر نەزان"ە, بەڵکو دەریشکەوت, کە "چەواشەکار", "ناڕاست" و "بوختانچی "یشە. کوردیش دەڵێ: "دار هەڵبڕە سەگی دز بۆ خۆی دیارە!".

هیوادارم, ئەم بەشەتان زۆر بە وردیی خوێندبێتەوە, چونکە زۆر گرنگە, بۆ کەسی ژیر, گەر بەشەکانی تریشی نەبینیبێت, ئیتر دەزانێ "مەریوان" کێیە!!.

سەرەتا, بەم وتەیەی پێشەوا مالیك دەست پێدەکەم, کە دەڵێ: زانست لە چوار کەس وەرناگیرێ:

١ – لەو کەسە وەرناگیرێ, کە لە دیندا شتی تازە دادەهێنێت و بانگەشەی بۆ دەکات "مبتدع".

٢ – کەسێ, کەودەن و کاڵفام و عەقڵسووك بێ, بە جۆرێ, کە ئاشکرا بێت. ٣ – کەسێك درۆ بە دەم خەڵکییەوە بکات، ئەگەرچی لە وتەکانی پێغەمبەریشدا (ﷺ) ڕاست بکات.

٤ – کەسێك, کە لەم بوارەدا شارەزا نەبێت (واتە زانستیی فەرموودە).

"لا يؤخذ العلم عن أربعة، لا يؤخذ عن مبتدع يدعو إلى بدعته، ولا عن سفيه يعلن بالسفه، ولا عمن يكذب في احاديث الناس، وإن كان يصدق في أحاديث النبي (ﷺ)، ولا عمن لا يعرف هذا الشأن".[٣٧٢]

مەریوان, دەکەوێتە بەر جۆرەکانی (٤,٣,٢) خۆ گەر بڵێین: هەموو ئەو سیفاتانە لەودا بوونی هەیە, هیچ دوور نییە، چونکە ئەو سیفەتانە لە بەشی یەکەمی نووسینەکانیدا, زۆر بە ڕوونیی دیاربوو.

ئەوەی لەم بەشەدا, دەمەوێ بیخەمە بەرچاوی خوێنەران ئەوەیە, کە مەریوان هەندێ شتی هێناوەو کردوونیەتە بەڵگەسازیی بۆ نووسینەکانی, کە یان "لاوازن" یان "بێبنەمان" و شتی واش, لە لای ئیسلام بێبایەخەو نرخی نییە، هەرچەندە باسکردنیشی لە زۆر شوێندا هاتبێت, ئەوەی تاڕادەیەك جێی سەرنج بوو لە لام, ئەوەبوو, کە مەریوان لەیەك دوو جێگەدا, باس لەوە دەکات, کە فلانە شت زەعیفە, بۆیە نایکەینە بەڵگە, بۆ نموونە: وەك لە لاپەڕە (٣٦)دا, باسێك لە بارەی خوشکی عومەرەوە دێنێ ودواتر دەنووسێ: "بەڵام ئەم ڕیوایەتە لە مەنهەجی ئیسلامدا زەعیفە و ئێمە پشتی پێ نابەستین".

کەواتە, مادەم مەریوانیش باوەڕی بە شتی "زەعیف" نییە، من ئەو شتانەی کە "زەعیف"ن و مەریوان هێناونی, لێرەدا دەست نیشانییان دەکەم, تا هەموو لایەك پشتییان پێ نەبەستن.

١ – لە لاپەرە (١١٧)دا, دەنووسێ: "وروى ابوداود عن أم عطية إن إمرأة كانت تختن النساء بالمدينة"، باس لەوە دەکەن کە لە شاری مەدینەدا ژنێك هەبوو تایبەت بووە بە خەتەنەکردنی ژنان . پاشان ئاماژە دەدات بە (تفسیر القرطبي,ج٢, ص١٠٠).

دەڵێین:

بەداخەوە!, ئەی بۆ وتەکەی (قورتوبی)ت نەنوسی, کە ئەم دەقە بە لاواز دادەنێت؟!.

(قورتوبی) لە پاش باسکردنی ئەم فەرموودەیە, کە (ابو داود) گێڕاویەتییەوە، وتەکەی (ابو داود) دەنوسێ و دەڵێ: (ابو داود) دەڵێ: ئەم فەرموودەیە لاوازەو ڕاوییەکەی نادیارە".[٣٧٣]

هەروەها (ابن حجر)یش, ئەم فەرموودەیە بە لاواز (ضعيف) دادەنێ.[٣٧٤]

دەبێ مەریوان گلەیی نەکات, چونکە ئەویش وەك ئێمە متمانەی بە شتی لاواز نییە!.

٢ – لە لاپەڕە (١١٧ – ١١٨)دا, هەمان فەرموودەی پێشووتر دەهێنێ و دەنوسێ: "هەر بۆیە پەیامبەر بەو ژنەی وتووە کەمێك دەست بەرز بکاتەوە". پاشان هەروەك سەرچاوە ئاماژە بە (تفسیر القرطبي, ج٢, ص١٠١).

دەڵێین:

١ – ئەوە هەمان فەرموودەی پێشوترە.

٢ – پاشانیش (ص١٠١) نییە، بەڵکو (ص١٠٠)ەو یەك دێڕ خوار فەرموودەکەی پێشووترە.

---

[٣٧٢] سير اعلام النبلاء, ج ٨/ص٦٨للذهبي.

[٣٧٣] تفسير القرطبي, ج ٢, ص ١٠٠.

[٣٧٤] تلخيص الحبير, ج ٤, ص٨٣.

٣ – لە لاپەڕە (١١٩)دا, دەقێك دێنێ بەم جۆرە: "ان النبي (ﷺ) ولد مختوناً". دەنوسێ: "تەنانەت خودی پەیامبەریش خەتەنە کراوە".

دەڵێین:

ئەو فەرموودەیە لە ڕشتە (سند)کەیدا (محمد بن سليمان الباغندي) تێدایە، کە زانایان بە لاوازیان داناوە، (دار قطني) دەڵێ: "کەسێك بووە چەواشەکاریی زۆر بووە (وەك مەریوان) کە گوێی لێ نەبووەو گێڕاوییەتەوە، زۆر جارانیش فەرموودەی دزیوە".[375]

پاشانیش, هەر فەرموودەیەك باس لەوە بکات, کە پێغەمبەر (ﷺ) بە خەتەنەکراوی لە دایکبووە "دروستکراوە" یان "زۆر لاوازە".[376]

٤ – لە هەمان لاپەڕەدا, ئەم فەرموودەیە دەنوسێ: "الختان سنة للرجال، مكرمة للنساء ". پاشان ئاماژە بە (تفسير القرطبي, ج٢, ص١٠٠ دەکات).

دەڵێین:

(قورتوبی) دەڵێ: "لە ڕشتە (سند)کەیدا (حجاج بن ارطاة)ی تێدایە، ئەم کەسە لەو کەسانە نییە, کە بەڵگەسازیی پێ بکرێ".[377]

چونکە "(مدلس)ە، واتە چەواشەکارەو شت دەگۆڕێ".[378]

دەبوایە مەریوان, قسەکەی (قورتوبی) بهێنایە، بەڵام بۆیە نەیهێناوە, چونکە ڕیسەکەی دەبوەوە بە خوری!.

٥ – لە لاپەڕە (١٨٠)دا, ئەم دەقە دەنوسێ: "عن عائشة قالت: قدم زيد بن حارثة المدينة و رسول الله (ﷺ) في بيتي فقرع الباب فقام اليه رسول الله (ﷺ) عريانا يجر ثوبه، والله ما رأيته عريانا قبله ولا بعده فاعتنقه وقبله". پاشان ئاماژە بە (تفسير القرطبي) دەدات.

دەڵێین:

ئەم دەقەی مەریوان هێناوییەتی, لە ڕووی زانستی فەرموودەناسیەوە "زۆر لاوازە, ضعيف جدا"، چونکە سێ هۆی لاوازیی لە ڕشتەکەیدا هەیە.[379]

٦ – لە لاپەڕە (١٨٢)دا, چەند ڕیوایەتێك باس دەکات, کە گوایە پێغەمبەر (ﷺ) جوانییەکەی (زینب), سەرسامی کردووە, کە بیخوازێت، بۆ نمونە دەنوسێ: "پەیامبەر زەینەبی زۆر خۆش دەویست, ئەگەر ماوەیەك دیار نەبوایە هەواڵی دەپرسی، جارێکیان دوا دەکەوێت و پەیامبەر بۆ هەواڵ پرسین دەچێت بۆ ماڵی (زید) لەو کاتەدا (زینب) لە ناوەڕاستی ژورەکەی خۆیاندا دانیشتووە، خەریکی کوتینی گیای بۆن خۆشە، کە پەیامبەر دەچێتە ژورەوەو بەو شێوەیە دەیبینێ دەڵێت: (سبحان الله خالق النور تبارك الله احسن الخالقين)". هەروەها ڕیوایەتێکی دیکەش دێنێ, کە لەویاندا وتویەتی: "سبحان الله مقلب القلوب".

دەڵێین:

---

[375] تحفة المودود, ص١٦٢, الفصل الثالث عشر.

[376] زاد المعاد, ج١, ص٨١ فصل ختان (ﷺ)، تحفة المودود الفصل الثالث عشر، الاستيعاب, ج١, ص١٥ رقم (٢٢٤).

[377] تفسير القرطبي, ج٢, ص٩٩.

[378] سلسلة الاحاديث الضعيفة والموضوعة, ج٤ , ص١٣١ و١٦٢ و ٤٠٧، والمحلى, ج٢, ص ١٢, ج ٥ , ص٢٨ و ١٥١.

[379] ضعيف الترمذي رقم (٥١٦) للالباني.

ئەم گێڕانەوانە, سەراپا هەمووی لاوازە و لە ڕووی زانستییەوە متمانەی پێناکرێ، گەرچی هەندێ لە ڕاڤەکارانیش هێناویانە, لە ناویاندا, (زمخشری) و (طبری) و (قوتوربی) و کەسانی تر، کە بوار بۆ مەریوان خۆش بووە (نانی بە سەرەوە پەیدا بکات).

(ابن حجر) لە (تخریج الکشاف)دا, باس لەو گێڕانەوەیە دەکات و دەڵێ: "ئەم ڕیوایەتە (ثعلبی) بە بێ ڕشتە (سند) باسی کردووە". [٣٨٠]

پاشان:

١– ریوایەتەکەی (ثعلبی) مادەم بە بێ ڕشتە باسی کردووە, بێبایەخەو لە ڕووی زانستی فەرموودەناسییەوە هیچ نرخێکی نییە.

ب– لە گێڕانەوەیەکی تردا, بە ڕشتە (سند)ەوە هاتووە, بەڵام لە نێو ڕشتەکەیدا (عبدالرحمن بن زید بن أسلم)ی تێدایە، ئەم کەسەش زۆر لاوازەو پێشەوایان (ئەحمەد) و (نەسائی) و (ابن المدینی) و کەسانی تر بە لاوازیان داناوە و هیچ کەسێ بە متمانەداری نەزانیوە. [٣٨١]

ج– هەروەها (سیوطی) لە (الدر المنثور) ئەم باسە دێنێ لە دوو ڕێگاوە:

یەکەم, دەڵێت: "(ابن سعد) و (حاکم) لە ڕێگەی (محمد بن یحی بن حبان)ەوە, گێڕاویانەتەوە".

دووەم, دەڵێ: "(عبد بن حمید) و (ابن المنذر) لە (عکرمە)ەوە, گێڕاویانەتەوە". [٣٨٢]

منیش دەڵێم:

یەکەمیان: (محمد بن یحی بن حبان) ئەم گێڕانەوەیە زۆر لاوازە, چونکە (مرسل)ە, (مرسل: بریتییە لەوەی کە (تابیعی)یەك شتێك دەداتە پاڵ پێغەمبەر, صەحابی باس ناکرێ, ئەم جۆرە بە (ضعیف) دادەنرێ). [٣٨٣]

هەروەها لە ڕشتەکەیدا (محمد بن عمرو الواقدی) تێدایە، کە ئەمەش کەسێکی زۆر لاوازە، بە کەسێکی درۆزن لە لای زانایان ئەژمارکراوەو هیچ دڵ بەگێڕانەوەکانی خۆش ناکرێ. [٣٨٤]

دووەم گێڕانەوەشیان هەر لاوازە, چونکە گێڕانەوەیەکی (مرسل)ە.

پاشانیش ئەو دوو گێڕانەوەی, کە (سیوطی) باسی کردووە, واتە: سەنەدەکەی (عبد بن حمید) و (ابن المنذر), هەردووکیان وون بوون و ئێستا لە هیچ جێگەیەکدا دەست ناکەون, تا زیاتر سەرنج لە نێو کەسی ڕشتەکەی بدرێت, وەك (بشیر محمد عیون)دەڵێ. [٣٨٥]

هەروەها (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا, لە باسی ئەم ڕووداوەدا, دەڵێ: "(ابن ابی حاتم و(ابن جریر) لێرەدا هەندێك گێڕانەوەیان باس کردووە, ئێمە پێمان خۆش بوو ڕووی لێوەرگێڕین, چونکە ڕاست نین بۆیە نایان هێنین". [٣٨٦]

(ابن حجر)یش, هاوشێوەی قسەکەی (ابن کثیر) دەکات و دەڵێ: "پێویست نییە خۆ سەر قاڵکردن بەو جۆرە گێڕانەوانەوە". [٣٨٧]

---

[٣٨٠] تفسیر الکشاف, ج٣, ص٤٢٧, للزمخشری، تخریج ابن حجر العسقلانی, ئایەتی ٣٧ الاحزاب.

[٣٨١] بۆ زانیاری زیاتر سەر ئەم کەسە, بڕوانە: سلسلة الاحادیث الضعیفة, ج١, ص٣٩ و ٤٠ و ٣٤٠ و ج٤. ص٦٢ و ١١٢ – ١١٣, المحلی, ج٢, ص١١٩ و ج٥, ص١٥٣.

[٣٨٢] الدر المنثور, ئایەتی ٣٧ الاحزاب.

[٣٨٣] تدریب الراوی, ج١, ص٢١٩– ٢٢٠.

[٣٨٤] سلسلة احادیث الضعیفة, ج٩, ص١٣,١٨٥, المحلی, ج٩, ص١٤٩, ج١٣, ص٩.

[٣٨٥] تحقیق کتاب الداء والدواء, ص٢٣٧.

[٣٨٦] ابن کثیر, ئایەتی ٣٧ الاحزاب .

[٣٨٧] فتح الباری, ج٨, ص٦١٤ .

٧ – لە لاپەڕە(١٩٣)دا, دەنووسێ: "لە (اخبار النساء)دا هاتووە: ڕۆژێك پیاوێكی كوێر بەناوی (ابن ام مكتوم) هاتە لای ماڵی پەیامبەر لەو كاتەدا دوو لەژنەكانی لەگەڵیدا دانیشتبوون, پەیامبەر پێی وتن هەستن بچنە ئەودیو, ژنەكانیش ووتیان ئەی پەیامبەر خۆ ئەوە كوێرە وچاوی نابینێت, پەیامبەریش پێی وتن: ئەو كوێرە خۆ ئێوە كوێر نین". پاشان ئاماژە بە (اخبار النساء)ی (ابن القیم) دەدات.

دەڵێین:

ئەم فەرموودەیە (ابوداود) ڕیوایەتی دەكات, بە ژمارە(٤١١٢), بەڵام فەرموودەیەكی لاواز (ضعیف)ە, لێكۆڵەرەوانی فەرموودەناسی بەلاوازیان لە قەڵەم داوە, چونكە لەڕشتەكەیدا (نبهان) خزمەتكاری (ام سلمة)ی تێدایە, ئەمەش كەسێكی نادیار (مجهول)ە لە لای زانایان.[388]

٨ – لە لاپەڕە(٢٣٩–٢٤٠)دا, دەنوسێ: "وقد جاء صریحا من حدیث عمرو بن شعیب عن ابیه عن جده عن النبی ﷺ اذا نكح الرجل المراة فلا یحل له ان یتزوج امها, دخل بالبنت اولم یدخل, واذا تزوج الام فلم یدخل بها ثم طلقها فان شاء تزوج البنت". دوایی ئاماژە بە تەفسیری (القرطبی) ئایەتی٢٣ سورەتی (النساء) دەكات.

دەڵێین:

ئەم ڕیوایەتە لە ئە صڵدا (طبرانی) ڕیوایەتی دەكات, بەڵام لاوازە(ضعیف)ە, چونكە ئەو ڕاوییەی لە عومەرەوە دەیگێڕێتەوە, كەسێكە بە ناوی (المثنی بن الصباح), ئەم كەسە, (ئەحمەد)و جەماوەری زانایانی فەرموودەناس بە لاوازیان داناوە, هەتا (یحی) و(عبدالرحمن) بە كەسێكی واز لێهێنراو (متروك) ناوزەدیان كردووە, (ابن حزم)یش دەڵێت زۆر لاوازە.[389]

٩ – لە لاپەڕە (٢٤٢–٢٤٣)دا, دەنوسێ: "پیاوێكی ئەنصاری و پیاوێكی (ثقفی) كە كۆچەری "مهاجر" بوو پەیامبەر لەمەدینە كردبوونی بەبرا, جارێكیان پەیامبەر دەچێ بۆ غەزا پیاوە (انصارییە)كە لەگەڵ خۆی دەبات, پیاوە كۆچەرییەكە لە لای ماڵو منداڵی ئەنصارییەكە جێدەهێڵێ ئاگای لەمناڵەكانی بێت و.... ڕۆژێك كۆچەرییەكە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە, دەبینێ ژنی براكەی خۆی شتووەو قژی بەڕەڵاكردووە, بەمەش ئارەزووی دەجووڵێو پەلاماری براژنەكەی دەداو دەست دەكات بەماچ كردنیو ئەم هەواڵەش دەگاتەوە بە پەیامبەرو ئایەتی: (والذین اذا فعلوا فاحشة....)آل عمران/١٣٥ی بۆ نازڵ دەكات". پاشان ئاماژە بە (اسباب النزول)ی (الواحدی) ص٣٠ دەكات.

دەڵێین:

ئەم گێڕانەوەیە, لە ڕێگەی گێڕانەوەی كەسێكەوەیە بە ناوی (محمد بن السائب), كە ناسراوە بە (الكلبی) و یەكێكە لەو كەسە لاوازانەی لە كتێبەكاندا, بە چەندین ناو و سیفەتی جیا ناوی هاتووە,[390] ئەم كەسە بە كەسێكی"درۆزن" ناسراوە لای زانایانی فەرموودەناس, هەتا (ابن حبان) لە بارەیەوە دەڵێ: "بۆچوون و ڕوونیی درۆكردنی لە دیندا زۆر ئاشكراترە لەوەی وردبینەوە لە وەسفیدا".[391]

هەتا (ابن حزم), دەڵێ: "(كەلبی) مەشهورە بە درۆكردن".[392]

١٠ – لە لاپەڕە (٢٥٩)دا, پاش ئەوەی باس لە بەسەرهاتێك دەكات, كە كوڕێك حەز لەژنی باوكی دەكات.... دواتر لە لاپەڕە(٢٠٦)دا, دەنوسێ: "صەحابەیەك بە ناوی (الاعصمی) باسی حاڵەتێكی تری لەم شێوەیە دەكات و دەڵێت: ئەگەر عومەر بە گەورەیی

[388] حجاب المراة المسلمة, ص٦٦, غاية المرام فی تخریج احادیث الحلال والحرام, ص١٣٩, ضعیف سنن ابی داود رقم(٨٨٧), المحلی, ج١٢, ص١٥٧.

[389] سلسلة الاحادیث الضعیفة والموضوعة, ج٤, ص١٥٣, المحلی, ج٩, ص٢٩١ .

[390] بڕوانە: تدریب الراوی, ج٢, ص ٧٤٦ –٧٤٧, النوع الثامن والاربعون.

[391] سلسلة احادیث الضعیفة والموضوعة, ج١, ص١٤٤, ج٤, ص٥٣و٢١٧ .

[392] المحلی, ج٨, ص١١٨, ج١٢ص٢٢٢.

خۆشەویستی نێوان ئەم دوانەی بزانیبایە, لێکی جیا نەدەکردنەوە". پاشان ئاماژە بە (اخبار النساء)ی (ابن القیم, ص١٣) دەکات.

دەڵێین:

١ – تەحەددای مەریوان دەکەم, کە لە (اخبار النساء)دا, چیرۆکی وای تێدا بێت.

٢ – دەقەکەی (اخبار النساء) بەم جۆرەیە: "عن ابو الحسن المداینی عن الاصمعی قال: عمر بن الخطاب (رضي الله عنه): لو ادرکت عفراء و عروة لجمعت بینهما".[٣٩٣]

واتە: (ئەصمەعی) دەڵێ: عومەر وتویەتی, گەر بگەیشتمایە بە (عفراء) و(عروة) پێکم دەگەیاندن و کۆم دەکردنەوە, بەڵام چیرۆکەکەیان چۆنە؟ باس نەکراوە.

٣ – (الاعصمی) نییە, وەك مەریوان دەڵێ, بەڵکو (الاصمعی)یە, لە هەموو (اخبار النساء)دا, ناوی (الاعصمی) گەر بەر چاوکەوت, ئەوە مەریوان ڕاستی نووسیوە, بەڵام شتی وای تێدا نییە!.

٤ –(صەحابی) نییە, وەك مەریوان نووسیویەتی, ناوی تەواوەتی (عبد الملك بن قریب بن عبدالملك بن علی بن اجمع), کەسناو(کنیة)ەکەی (ابوسعید)ە, یەکێکە لە زاناو ئەدیب و شارەزاکانی زمانی عەرەبی ومێژوو, لە ساڵی (١٢٠ك) لەدایکبووە و (٢١٦ك) وەفاتی کردووە.[٣٩٤]

٥ – شتێکی زانراویشە, کە چینی (صەحابە) بە ڕەهایی بە مردنی (ابو الطفیل) کۆتایی دێت, کە لە ساڵی (١٠٠ك) وەفاتی کردووە, هەندێکیش دەڵێن (١٠٢ك) وەفاتی کردووە, هەندێکی تر دەڵێن: کەمێك زیاتر, درێژترین ماوە, کە وتویانە لە سەر مردنەکەی (١١٦ك) بووە.[٣٩٥]

کەواتە:

هەر چۆنێك بێت, (الاصمعی) (تابعی)یش نەبووە, چ جای صەحابی, ئەمەش لاوازیی تێگەیشتنی مەریوان دەردەخات, لە باسکردن و نووسینی شتەکاندا, کە چەندە ئاستی زانستیی ئەو کەسە لاوازو سەقەتە, وەك کوردیش دەڵێت: "جام چی تێدا بێت, هەر ئەوەی لێدەڕژێت", من لەو باوەڕەدام, کەسێك ئەوە ئاستی خوێندنەوەو نوسین و تێگەیشتنی بێت, ئەستەمە ناوی لێبنرێت "قەڵەمبەدەست", بەڵکو گەر وردتر هەڵیبسەنگێنین, دەتوانم بڵێم: مەریوان, کەسێکە پیتە کوردییەکان دەناسێتەوە, نەك پیتە عەرەبییەکان!.

١١ – لە لاپەڕە (٢٧٨)دا, دەنوسێ: "مێژوونووسەکان دەڵێن (عمر بن لحی الخزاعی) ناوێك, گەشتێکی بۆ شام کردووەولەوێ بینیوێتی, کە خەڵکی خوایەکی لە بت دروستکراو وەك هێما دەپەرستن, ئەویش لەگەڵ خۆیدا سێ بت دەباتەوە بۆ مەککە, بە ناوەکانی (اساف, نائلة, هبل), "هبل" لە ناو کەعبەدا دادەنێ, "اساف" لە بەرزایی صەفا و "نائلة" لە بەرزایی مەڕوە جێگیر دەکات...".

دەڵێین:

ئەم وتەو باسە لە هەر کەسێکی وەرگرت بێت, لاوازە, چونکە:

١ – (عمرو بن لحی) کە سەفەری شام دەکات, دەگاتە (مەئاب) لە (بلتاء), کەسانێك دەبینێ, چەندین بت دەپەرستن, نەك وەك مەریوان دەڵێ "خوایەکی لە بت درووستکراو..".

٢ – (عمرو) داوایان لێدەکات, بتێك لەو بتانەی بدەنێ, ئەوانیش تەنها یەك بتی دەدەنێ, بە ناوی "هبل" نەك سێ بت!.

[٣٩٣] اخبار النساء, باب/ یذکر فیه من صیره العشق الی الاخلاط والجنون, ص٧٠.

[٣٩٤] سیر اعلام البنلاء, ج١٠, ص١٧٥.

[٣٩٥] تدریب الراوی, ج٢, ص ٦٩١-٦٩٢ معرفة الصحابة, فتح الباری, ج٧, ص٨ .

٣ – ئەمە گێڕانەوەی (ابن اسحاق)ی گەورە زانای مێژووناسە, لەگەڵ پێشەوا (ابن كثیر)دا, نەك وەك مەریوان, كە لە كەسی وەهاوە شت دەهێنێ, كە وەك خۆی سێكس پەرستن!.[٣٩٦]

٤– دەربارەی "اساف" و"نائلة", (عمرو بن لحی)ی نایانخاتە بەرزاییەكانی (سەفا) و (مەڕوە), وەك مەریوان نووسیویەتی, بەڵكو (عمرو) لە سەر بەرزاییەكان دایان دەگرێت و لەلای بیری (زمزم) دایان دەنێ.[٣٩٧]

١٢– لە هەمان لاپەڕەدا, لە سەر (اساف) و (نائلة) دەنووسێ: "گوایە (اساف و نائلة) دوو كەسی حەقیقی عاشق بوون, چوونەتە ناو كەعبەوەو مومارەسەی سێكسیان كردووە, لەبەر قووڵی‌و عەشقی زۆری نێوانیان, خوانەیهێشتووە بمرن, بەڵكو كردوونی بە بەرد, تا خەڵكی حیكایەتی خۆشەویستیان بگێڕنەوەو هەرگیزاو هەرگیز لە یادی نەكەن".

دەڵێین:

ئەمە درۆ و بوختانە بە دەم خواو پاشان مێژووەوە, (عائشة) دەگێڕێتەوە, دەڵێ: "بەردەوام ئێمە وامان بیستووە, كە (اساف) و (نائلة) پیاو و ئافرەتێك بوون لە هۆزی (جورهوم) و لە نێو كەعبەدا كاری خراپیان كردووەو خواش كردوونی بە دوو بەرد".

هەندێكیش وتویانە: "خوای گەورە مۆڵەتی پێنەداون, كە ئەو كارە خراپە بكەن, هەردووكیانی كردووە بە بەرد".[٣٩٨]

ئەمە ئەگەر ئەفسانەش بێت, سەرچاوە باوەڕ پێكراوەكان, ئەوەندەیان لە بارەوە وتووە, جا ئەوەی مەریوان بە دەم خواوە دروستی كردووە "كە خوا بۆیە نەیمراندوون و كردوونی بە بەرد تا....لە یادی نەكەن", بوختانە, چونكە خوای گەورە هیچ كات فەرمانی نەكردووە بە خراپەكاریی و داوێن پیسی, ئایە بۆ شتێ بە ناوی خواوە دەڵێن لە كاتێكدا هیچ زانستێكتان پێی نییە, خوا ئەو پەیامەی لە قورئانەكەیدا بۆ هەموو لایەك ڕوون كردۆتەوە, وەك دەفەرمووێت: (قل ان الله لا یأمر با لفحشاء اتقولون علی الله مالا تعلمون) الاعراف /٢٨.

١٣– لە لاپەڕە (٢٨٩)دا, دەنووسێ: "سعید بن جبریش دەڵێ: من ئایەتەكەم لە كاتی خۆیدا (واتە لە سەردەمی پەیامبەردا) بەم شێوەیە دەخوێندەوە: (فما استمتعتم به منهن الی اجل مسمی فاتوهن اجورهن)".

دەڵێین:

ئەگەر ئەو وتەیەی (سعید), مەبەستی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بێت, وەك مەریوان لێكی دەداتەوە, ئەوە بێگومان لاوازە, چونكە (سعید) لە ساڵی (٩٥)ی كۆچی بە دەستی (حجاج) كوژراوە.[٣٩٩]

تەمەنی (سعید) لای ژوورەكەی (٥٧) ساڵێك ژیاوە, هەندێك دەڵێن (٤٩)و هەندێكی تریش دەڵێن (٤٢).[٤٠٠] ئەگەر (٥٧) دابنرێت بە تەمەنی كەواتە ساڵی (٣٨ك) لە دایك بووە، ئاشكراشە كە پێغەمبەر ﷺ ساڵی (١٠ك) وەفاتی كردووە.

ئیتر كامە "سەردەمی پەیامبەر" وەك مەریوان دەڵێ؟!.

مەریوان, نەك هەر لە بواری ئایەت و حەدیس و ڕێزمانی عەرەبیدا كۆڵەوارە, بەڵكو لە بواری مێژووشدا هیچی پێنییە, "تووتی" ئاسا هەر دەڵێ‌و تێشناگات!, (سعید بن جبیر)ێك, تا ئەو ئەندازەیە ژیانی لای مەریوان نادیارو شاراوە بێ, ئەی ماڵوێرانی بۆ ئەو كەسەی, كە مەریوان دەكاتە پێشەنگ بۆ نووسینی تر دژی پەیامی خوا, "ظلمات بعضها فوق بعض".

بەڕێزان:

---

[٣٩٦] بڕوانە: البدایة والنهایة, م١, ج٢, قصة خزاعة (عمرو بن لحی) و (عبادة العرب للاصنام), مختصر سیرة الرسول, ص١٢.

[٣٩٧] البدایة والنهایة, م١, ج٢, باب/ جهل العرب.

[٣٩٨] البدایة والنهایة, م١, ج٢, باب/ جهل العرب.

[٣٩٩] سیر الاعلام النبلاء, ج٤, ص٣٢١ .

[٤٠٠] صفة الصفوة, م٢, ج ٣, ص ٤٣.

ئەم بەشەش تەواو, مەبەستیشم لەم بەشە زیاتر ئەوە بوو, کە بیسەلمێنم (مەریوان) ڕاستگۆ نەبووە لەو بانگەشەیەی, کە لە چەند جێگەیەك لە نوسینەکانیدا باسی لێوە کردووە, کە "فلاٌنە شت لاوازە, بۆیە متمانەی پێناکات" چونکە:

١ – لە زانستی ناسینی کەسەکاندا و لە فەرموودەناسیدا "گەردیلە "یەك زانیاری پێنییە, تا بتوانێ "زەعیف"و "صحیح" لێك جیا بکاتەوە!.

٢ – لە لای مەریوان گرنگ ئەوەیە, ئەو بابەتە لەگەڵ ویستە سێکسییەکانیدا یەکبگرێتەوە, جا زەعیف بێت, یان نا, مەبەست نییە بە لایەوە, لە بەشی یەکەم و ئەم بەشەشدا نموونەگەلێکی زۆر هەن, کە مەریوان دەربەستی نەبووە, چ لە باسکردنی, چ لە هێنانی!.

٣ – مەریوان نەخوێندەوارە بە واتا زانستییەکەی, ئەم بەشەش نموونەیەکی دیارە بۆ ئاشکراکردنی مەبەستە پلان بۆ داڕێژراوەکانی.

سەرەتا دەمەوێت لەوێوە دەست پێبکەم, کە مەریوان لە لاپەڕە (٣٢–٤٧)دا, باس لەوە دەکات, گوایە پێغەمبەرانی وەك (لوط) یان (ابراهیم) کاری سێکسییان کردبێت, سەرچاوەی ئەم بوختانەشی (تەورات)ە, (ئێمە قسەمان لەسەر تەوراتە, بۆیە باسی ئەو دەکەین, دەنا ئینجیل و زەبورو تەواوی کتێب و پەڕاوەکانی تر دەستکاریی کراون), جا پێش ئەوەی بچینە سەر باسی پێغەمبەران وخێزانەکانیان, دەبێ بپرسین, ئایا (تەورات)و تەواوی کتێبە ئاسمانییەکانی تر, تا چەند جێی متمانەن لە ئیسلامدا؟.

ئێمە وەك مسوڵمان باوەڕمان وایە, کە (تەورات) لە لایەن بەرژەوەندی پەرستەکان و شوێنکەوتوانی دنیا (جوولەکەکان) گۆڕانکاریی زۆری تێدا کراوە, خۆیان چۆن ویستیان لێی بووە, بەو جۆرە دەقەکانی نێویان گۆڕیوە.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قل من انزل الکتاب الذی جاء به موسی نوراً وهدی للناس تجعلونه قراطیس تبدونها وتخفون کثیرا......﴾ الانعام/٩١.

واتە: ئەی موحەمەد پێیان بڵێ: کێ ئەو تەوراتەی ناردۆتە خوارەوە, کە موسا پێی هات, کە ڕووناکیو ڕێنمونی بۆ خەڵکی تێدا بوو, ئەی کۆمەڵ ودەستەی (جوولەکە) ئێوە لە نێو پەڕاودا داتان دەناو دەتان نووسییەوەو ئاشکراتان دەکرد بۆ خەڵکی, وە زۆرێکتان لەو سیفەتانەی (محمد) و یاسایانەی, کە تیادا بوو, دەتان شاردەوە.[٤٠١]

ئەوەتا لێرەدا, خوای گەورە, بە ئاشکرا باس لەوە دەکات, کە (جوولەکە) تەوراتیان گۆڕیوە و شێواندویانەو بە دەم خواوە شت هەڵدەبەستن.

وە خوای گەورە بە باوەڕداران دەفەرموویت: ﴿افتطمعون ان یؤمنوا لکم وقد کان فریق منهم یسمعون کلام الله ثم یحرفونه من بعد ما عقلوه, وهم یعلمون﴾ البقرة /٧٥.

خوای گەورە, لێرەدا, باوەڕداران بێ هیوادەکات لەوەی, کە جوولەکە باوەڕ بهێنن و پێیان دەفەرمووێت: ئایا ئێوە چۆن هیواو ئومێدتان بەو جوولەکانە هەیە, کە باوەڕ بهێنن و گوێڕایەڵیتان بۆ دەر ببڕن, لە کاتێکدا ئەوانە دەستەیەکیان گوێبیستی وتەی خوا بوون "واتە تەورات", پاشان دەیان شێواندو بە پێچەوانەوە مەبەستەکەیان دەگەیاند, لە پاش ئەوەی, کە خۆیان لێی تێدەگەیشتن و دەشیانزانی, کە ئەمە وەها نییە.

ئەوەی جوولەکە دەیان گۆڕیو دەیان شێواند, زۆرشت بوو, لە هەموویان دیارتر "سیفەتی پێغەمبەر (ﷺ) و حەڵاڵ وحەرام بوون", (ابن ز ید) دەڵێ: "ئەو تەوراتەی, کە خوا بۆی ڕەوانە کردبوون, دەیان شێواند, حەڵاڵیان تێدا حەرام دەکردو حەرامیان تێدا حەڵاڵ دەکرد, ڕاستییان دەکرد بە بەتاڵ و بەتاڵیان دەکرد بە ڕاست, ئەگەر خاوەن مافێك بهاتایە بۆ لایان و ڕەشوەو بەرتیلی بە زاناکانیان بدایە, تەوراتیان بۆ دەهێنا, هەروەها گەر کەسێکیش لە سەر ناحەقی بوایە, هەر تەوراتیان بۆ دەهێناو پێیان دەوت, کە لە سەر حەقە, گەر کەسێکیش پرسیاری لێبکردنایە, کە حەق نەبوایەو بەرتیلی پێ نەبوایە, فەرمانیان بە ڕاستی پێدەکرد.[٤٠٢]

چەندین دەقی تر لە قورئاندا ئەوە دووپات دەکاتەوە, کە (تەورات) شێوێندراوە, وەك ئایەتی ﴿فَبِما نقْضِهِم میثَـاقَهم لَعناهم وجعلْنا قُلُوبهم قَاسِيةً يحرفُونَ الْكَلِم عن مواضِعِه ......﴾١٣/المائدة.

وە خوای گەورە دڵنیایی دەدات بە پێغەمبەرەکەی, کە دڵگران نەبێت بە بێباوەڕی هەندێك لە خەڵك, پاشان سەرزەنشتی جوولەکە دەکات, کە تەوراتیان شێواندووە, وەك دەفەرمووێت: ﴿یاأیها الرسول لایحزنك الذین یسارعون فی الکفر من الذین قالوا آمنا بافواههم ولم تؤمن قلوبهم ومن الذین هادوا سماعون للکذب سماعون لقوم اخرین لم یاتوك یحرفون الکلم من بعد مواضعه﴾ المائدة/٤١.

---

[٤٠١] مختصر الطبری, ج١, ص ٢٣٩, القرطبی, ج٧, ص٣٧ .

[٤٠٢] ابن کثیر, تەفسیری ئایەتی ٧٥ی البقرة.

زانا جوولەکەکان بەدەستی خۆیان شتیان دەنووسیی و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد, کە هی خوایە, خوای گەورەش هەڕەشەی توندی ئاڕاستە کردن, بۆیە ئەمەشیان دەکرد, تا هەندێ بە هاو نرخی کەمیی دنیایان دەست بکەوێت, وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فويل للذين يكتبون الكتاب بأيديهم ثم يقولون هذا من عندالله ليشتروا به ثمناً قليلاً...﴾ البقرة/٧٩.

پێغەمبەریش (ﷺ) ئەوەمان پێڕادەگەیەنێت, کە ئێمە وەك مسوڵمان نە باوەڕ بە ئەهلی کیتاب بکەین و بە درۆشیان بزانین. (ئەبو هورەیرە) دەڵێ: "خاوەننامەکان (واتە جوولەکەی مەبەستە تەوراتیان بە عیبرانی دەخوێندەوە و بە عەرەبی بۆ مسوڵمانانیان ڕاڤە و تەفسیر دەکرد, پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: قسەکانی ئەهلی کیتاب نە بەڕاست بزانن, نە بە درۆشیان بخەنەوە, وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿قولوا آمنا بالله وما انزل الينا ....﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە..".[٤٠٣]

(ابن حجر) لە ڕاڤەی: "نە بە ڕاستیان بزانن و نە بە درۆشیان بخەنەوە". دەڵێ: "بە درۆیان مەخەنەوە لە شتێکدا, کە لەوانەیە لە واقیعدا وا بێ, یان بڕوایان پێمەکەن لەوانەیە درۆ بێت, بەڵام بە هیچ جۆرێك نەهی کردن نەهاتووە لە بە درۆ خستنەوەیان لە شتێکدا, کە لە شەرعی ئێمەدا پێچەوانە بێت, ئەمەش پێشەوا شافیعی ئاگاداری لە سەر داوە".[٤٠٤]

مەبەست لەمە ئەوەیە, گەر شتێك باسکراو لە شەرعی ئێمەدا باسی نەهاتبوو, لەم کاتەدا دەبێت نە ئەو شتە ڕەت بکەینەوە نە بیچەسپێنین, دەبێت ئەوە هەڵوێستمان بێت.

(ابن کثیر) لە سەر گێڕانەوەی شت لە بەنی ئیسرائیلەوە, دابەش کردنێکی کردووە, بەم جۆرە:

١- گەر ئەو شتانەی, کە لە بەردەستی خۆماندان, بوونە بەڵگە بۆ ڕاستییەتی ئەو شتەی, کە لە بەنی ئیسرائیلەوە وەردەگیرێن, ئەوە ڕاستە.

٢- ئەوەی پێچەوانەی ئەو شتانە بێت, کە لای ئێمەیە ئەوە دیارە, کە درۆیە.

٣- ئەوەی, کە بێدەنگی لەسەر کراوە, نە لە بەشی یەکەمە و نە لە بەشی دووەمە, ئەوا نە بە درۆی دەخەینەوە نە بە ڕاستیشی دەزانین.[٤٠٥]

لە ئیسلامیشدا نەهی کراوە لەوەی پرسیار لە ئەهلی کیتاب بکرێت, بەتایبەتی جولەکە لەو شتانەی, کە لای ئوممەتی ئیسلام هەیەو باسکراوە. جارێکیان عومەر نووسراوێکی پێدەبێت, کە لە هەندێك خەڵکی ئەهلی کیتابەوە دەستی کەوتبوو, هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) بۆی خوێندەوە, پێغەمبەر (ﷺ) تووڕە بوو, فەرمووی: "بە ڕاستی من شتێکم بۆ هێناون سپیی و پاکو ڕوونە, پرسیار لە ئەهلی کیتاب مەکەن لە شتێ هەواڵتان بدەنێ, کە خۆی ڕاستەو ئێوە بە درۆی بزانن, یان خۆی درۆ بێت و ئێوە بە ڕاستی بزانن, سوێند بە خوا, گەر ئێستا (موسا) زیندوو بوایە, هیچ مۆڵەت و ماوەیەکی نەبوو, جگە لە شوێنکەوتنی من نەبێ". (ان عمر اتى النبي (ﷺ) بكتاب اصابه من بعض اهل الكتاب, فقراه عليه, فغضب, وقال: لقد جئتكم بها بيضاء نقية, لا تسألوهم عن شيء فيخبروكم بحق فتكذبوا به, او بباطل فتصدقوا به, والذي نفسي بيده, لو ان موسى كان حياً ما وسعه الا ان يتبعني). رواه احمد, وابن ابى شيبة.

(ابن حجر) لە سەر ئەم فەرموودەیە, دەڵێت: "هەموو کەسەکانی نێو ڕشتەکەی متمانەپێکراون, جگە لە "مجالد" نەبێ, کە لاوازییەکی تێدایە.[٤٠٦]

بەڵام, لاوازییەکەی زۆر نییە و لەو جۆرەیە, کە پڕدەکرێتەوە, هەر بۆیە زانای بەناوبانگی فەرموودەناس (محمد ناصرالدين الالباني) ئەم فەرموودەیەی بە پلەی "حسن" داناوە.[٤٠٧]

---

[٤٠٣] صحيح البخاري, باب / قولوا امنا بالله وما انزل الينا, رقم (٤٤٨٥).

[٤٠٤] فتح الباري, ج٨, ڕاڤەی فەرموودەی (٤٤٨٥).

[٤٠٥] بڕوانە: پێشەکی تەفسیری (ابن کثیر).

[٤٠٦] فتح الباري, ج١٣, باب/ قول النبي (ﷺ) لاتسالوا اهل الكتاب.

وە(عبدالله)[*] دەڵێ: "ئێوە پرسیار مەکەن لە ئەهلی کیتاب, چونکە ئەوان ڕێگەتان پێ نیشان نادەن و ڕێنمونیتان ناکەن, ئەوان بۆ خۆیان بە ڕاستی گومڕا بوون".[٤٠٨]

(ابن عباس) دەڵێ: "ئەی گرۆی مسوڵمانان, چۆن پرسیار لە ئەهلی کیتاب دەکەن, لە کاتێکدا ئەو پەڕاوەی, کە هاتۆتە خوارێ بۆ سەر پێغەمبەر (ﷺ), هەواڵەکانی لەلای خواوە زۆر نزیکە, کە خۆشتان دەیخوێننەوە, هیچ شتێکی تێکەڵاو نەبووە, بە ڕاستی خوا بۆی باس کردون, کە ئەهلی کیتاب نامەو پەڕاوی خوایان گۆڕیوەو ئەوان دەیانوت: ئەمە لەلایەن خواوەیە, تا هەندێ بەها و نرخی کەمی پێبکڕن, ئایە مەگەر نەهیتان لێنەکراوە, کە پرسیاریان لێنەکەن؟ سوێند بە خوا هیچ یەکێکمان لەوانە نەبینیوە, کە پرسیارتان لێبکەن لەوەی بۆتان ڕەوانە کراوە".[٤٠٩]

ئەوەتا (ابن عباس) سەرزەنشتی مسوڵمانان دەکات, کە پرسیار لە جوولەکە نەکەن, چونکە لەو پەڕاوەی, کە لە بەردەستیاندایە, کە (تەورات)ە, گۆڕانکارییان تێدا کردووە.

***بەکورتیی‌و پوختیی:***

زانایان هەموویان یەکدەنگن لە سەر ئەوەی, کە (تەورات) دەستکاریی کراوەو بە جۆرێك ڕاڤە کراوەو واتاکانی لێکدراوەتەوە, کە پێچەوانەی مەبەستەکانی خوایە, نموونەی زۆریش لەم بارەیەوە هەیە, هەر لە شاردنەوەی ڕەجم کردن, کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) یەك دوو حاڵەت ڕوویداو پێغەمبەر (ﷺ) ئەو نهێنییەی پێ ئاشکرا کردن, کەسێ, گەر خانەوادەو سەردار بوایەو دزی بکردایە, دەستیان نەدەبڕی, ئەمەش بە پێچەوانەی (تەوراتەوە)بوو. وەکردنی (اسحاق) بەو کوڕەی, کە (ابراهیم) ویستوویەتی سەری ببڕێ, لە بنەمادا (اسماعیل)ە, نەك (اسحاق) و چەندین شتی تر.[٤١٠]

کەواتە:

ئەوەی مەریوان, لە تەوراتەوە ڕاگوێزی کردووەو خوێنەری پێچەواشە کردووە لە سەر پێغەمبەران و هاوسەرانیان, سەراپا هەمووی لە ئیسلامدا ڕەتدەکرێتەوە و یەك پارچەیە لە درۆ و بوختان, ئێمە وەك مسوڵمان بڕوامان بە یەك پیتی نییە, چ جای باسەکە خۆی, چونکە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پاکی پێغەمبەردا, شتی وا باسی نییە و لەو ڕووەوە خۆیان و هاوسەرەکانیشیان زۆر پاکن, گەرچی هەندێکیشیان لە سەر دینی مێردەکانیان نەبوون, جا ئێمە وەکو مسوڵمان, پێمانوایە هەر شتێك لەگەڵ قورئان و فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەردا دژ بێت, ئەوە جگە لە درۆ و بوختان وچاوبەستەکی کردن لە خەڵکی, هیچی دیکە نییە, جا با هەندێك هەر کاری وا بکەن و شتی وا بڵێن, ئیسلام هیچ باکی نییە, ئەو کارانەی ئەوانیش, وەکو دەڵێن: "وەڕینی سەگە بە مانگە شەو".

**باسی پێغەمبەران (ﷺ) و هاوسەرەکانیان لە ڕوانگەی قورئان و سووننەتەوە:**

**١ – پێغەمبەر (ابراهیم)(سەلامی خوای لە سەر بێت)**

خوای گەورە, لە بارەی (ابراهیم)ەوە, دەفەرمووێت: ﴿واذا ابتلى ابراهيم ربه بكلمات فاتمهن قال اني جاعلك للناس اماماً قال ومن ذريتي قال لا ينال عهدي الظالمين﴾البقرة/١٢٤.

واتە: بیری ئەو کاتە بکەنەوە, کە خوای گەورە ئیبراهیمی بە چەند داوایەك تاقی کردەوە, پاشان (ابراهیم) لە سەر تەواوترین شێوە هەموویانی بە جێهێنا, پەروەردگاری پێی فەرموو: دەتکەم بە پێشەوا بۆ خەڵکی لە کاری چاکە و

---

[٤٠٧] بڕوانە: ارواء الغليل, رقم(١٥٨٩), سلسلة احاديث الصحيحة, رقم (٣٢٠٧).

[*] گەر ناو (عبدالله) بە ڕەهایی هات, مەبەست (عبدالله بن مسعود)ە, وەك مەعلومە لە زاراوەی فەرموودەناسیدا.

[٤٠٨] فتح الباري, ج١٣, باب/ قول النبي (ﷺ) لا تسالوا اهل الكتاب عن شيء.

[٤٠٩] صحيح البخاري, باب/ لايسال اهل الشرك عن الشهادة وغيرها, رقم (٢٦٨٥).

[٤١٠] بڕوانە: البداية والنهاية, م١, ج٢, تحريف اهل الكتاب وتبديلهم اديانهم, صحيح البخاري, باب/ اقامة الحد ورد على الشريف والوضيع, و باب/ الرجم فى البلاط, صحيح مسلم باب/ قطع السارق الشريف وغيره, وباب/ رجم اليهود, اهل الذمة فى الزنى.

باشەدا, تا چاوت لێبکەن و شوێن پێت هەڵبگرن, ئەویش فەرمووی: ئەی پەروەردگار لە نەوەکەشمدا, خوای گەورەش پێی فەرموو پێشەوایەتی و کاری چاکەو پێغەمبەرایەتی ئەو کەسانە بە دەستی ناهێنن, کە ستەمکارن.[٤١١]

خوای گەورە لەم ئایەتەدا, ئاگاداری لە سەر شەرەف و گەورەیی (ابراهیم) دەدا, کە خوا دەیکاتە پێشەوا بۆ خەڵکی و لە هەرچی تاقیکردنەوەدا هەیە, سەرکەوتوانە بڕی (لە سەر ئەم ئایەتە شتی زۆر جوان وتراوە, کە باسی ئێمە نییە لێرەدا, بڕوانە تەفسیری ابن کثیر).

وە لە چەندین جێگەی دیکەدا, خوای گەورە باسی (ابراهیم) دەکات بەوەی, کە (پشتی لە هەموو کوێرەڕێیەکان هەڵکردووە و رووی لە ڕێگەی ڕاست و پاك ناوەو لە بێباوەڕان نەبووە). ﴿ما كان ابراهيم يهودياً ولا نصرانياً ولكن كان حنيفاً مسلماً وما كان من المشركين﴾ آل عمران/٦٧.

"هەر لەمنداڵییەوە خوای گەورە سەلیقە و ژیریی و تێگەیشتنی پێبەخشیوە". (ولقد آتينا ابراهيم رشده من قبل) الانبياء/٥١. "ڕاستگۆ و پێغەمبەری خوابووە". (واذكر في الكتاب ابراهيم انه كان صديقاً نبياً) مريم/٤١. "ئاهو ناڵەو کڕوزانەوەی بۆ لای خوا زۆر بووە, کەسێکی ڕەوشت بەرز و هێمن و لە سەرخۆ بووە". (انه لأواه حليم) التوبة/١١٤. "بە تەنها خۆی بۆ خۆی ئوممەتێك بووە, گوێڕایەڵی خوای خۆی بووە". (ان ابراهيم كان امة قانتاً لله...) النحل/١٢٠. "خوا هەڵیبژاردووە بۆ کاری پێغەمبەرایەتی و ڕێنمویی کردووە بۆ ڕێگەی ڕاست". (اجتباه وهداه الى صراط مستقيم) النحل/١٢١, وە چەندین وەسف و پیاهەڵدانی تر.

کەسێ, خاوەنی ئەم هەموو وەسفە بەرز و پیرۆزە بێت, دەگونجێ "لاشیپان"ی خێزانی خۆی, وەك مەریوان ناماقوڵییەکەی کردووە, بە کاربهێنێت بۆ هەندێك ماڵ ودارایی دنیایی؟!, هەرگیز نەخێر, پاشان مەریوان تا چەند ئامادەیە ئەم کارە بە هاوسەری خۆی بکات؟!, لە کاتێکدا مەریوان لە هەموو ڕەوشتێکی بەرز و پاکو جوان زۆر بە دوورە!. دەنا چۆن ئەمە بۆ کەسێکی لەو پەڕی ئەندازەی پاکیدا, بە ڕەوا دەبینێت؟, جگە لە "تەورات"ە شێوێندراوەکە و بیری پڕ لە سێکسیی خۆی, چ شتێکی دیکە هەیە وا بکات, وەها بۆچوونێکی هەبێت؟, گەر دەڵێ: بەڵێ, بۆ هاوسەرەکەی شتی وا بە ڕەوا دەبینێ, کاری بەو جۆرەی پێوە بکات, ئەوە ویستی مەریوان خۆیەتی, ئەمە لە ڕەوشتی (ابراهیم)ەوە, زۆر دوورە.

سەبارەت بە خاتوو (سارە)ی هاوسەری بەڕێزیشی, پێغەمبەر تەنها یەك ڕووداو دەگێڕێتەوە, بەڵام نەك, وەك خەیاڵە سێکسییەکەی مەریوان, بەڵکو ڕاست, وەك خۆی دەیگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

"(ابراهیم) جگە لە سێ جار, قسەی ناڕاستی بە کار نەهێناوە, دوانیان لە بەر خوا و یەکێکیشیان لە بەر (سارە), یەکەم, کاتێ پێیانوت تۆش وەرە دەرێ, وتی: نەخۆشم. دووەم, لە بارەی شکاندنی بتەکانەوە, وتی: بتە گەورەکەیان وای لێکردوون. سێیەم, کاتێ لەگەڵ (سارە)ی خێزانی دەچنە وڵاتی یەکێك لە دەستەڵاتدارەکان, زۆردارێك لە زۆردارەکان, (سارە)ی زۆر بە جوان دێتە پێش چاو, لە ڕاستیشدا (سارە) هەر زۆر جوان بووە, دەچن بە پاشاکە دەڵێن پیاوێك هاتووە, ناوی (ابراهیم)ە, ژنێکی زۆر جوانی پێیە, پاشاش دەنێرێت بە شوێن (ابراهیم)داو لێی دەپرسێت ئەو ئافرەتە کێیە لەگەڵتا؟, دەڵێ: خوشکمە, پاشان (ابراهیم) دەگەڕێتەوە بۆ لای (سارە) وپێی دەڵێ: من بەمانەم وتووە, کە تۆ خوشکمی, گەر لەم بارەیەوە لێیان پرسی بە درۆم مەخەرەوە. تۆش پێیان بڵێ, کە خوشکی منی, چونکە لە ڕاستیدا بە ئیسلام تۆ خوشکی منی, خۆ گەر بزانن, کە ژنی منی, ئەوا لە منت داگیر دەکەن, مسوڵمانانیش هەموو براو خوشکی یەکترن, سوێند بە خوا, لەم سەر زەویەدا, جگە لە خۆم وخۆت, مسوڵمانێکی دیکە شك نابەم, پاشان پاشا دەنێرێ بە دوای سارەداو دەچێت بۆ لای, جا هەر کە (سارە) دەچێتە ژوورەوە, کابرای زۆردار خۆی پێناگیرێ ودەست دەبات بۆ دەستی, (سارە)ش لە خوا دەپاڕێتەوە, خوای گەورەش زۆردارەکە دەستبەجێ لە پەلوپۆ دەخات و هەناسەی دەگیرێ ودەست دەکات بە لرخە لرخ, تەنانەت دەست دەکات بە لینگە فرتێی مەرگ, کابرا بە (سارە) دەڵێ: داوا لە خوا

---

[٤١١] مختصر تفسير الطبري, ج١, ص٤٣ .

بکە چاکم بکاتەوە, پەیمان بێت زیانت پێنەگەیەنم, (سارە)ش لە خوا دەپاڕێتەوە و پاشا چاك دەبێتەوە, بەڵام عار نانێ و دیسانەوە دەست بۆ (سارە) درێژ دەکاتەوە, بەڵام دیسانەوە وای لێدێت, دەست دەکاتەوە بە لرخە لرخەکەی پێشوو, کابرا دەڵێت: لە خوا بپاڕێرەوە چاکم بکاتەوە, زیانت لێنادەم, ئەویش بۆی دەپاڕێتەوە و چاك دەبێتەوە, ئەم حاڵە سێ جار دووبارە دەبێتەوە, لە نێوان (سارە)و کابرای زۆرداردا, لە جاری سێهەمدا, کابرا دەڵێ: "بەخوا ئەمەی ئێوە بۆ منتان هێناوە, جنۆکەیە دەست لە مرۆڤ دەوەشێنێت, بیبەنەوە بۆ ابراهیم". تا درێژەی فەرموودەکە.[٤١٢]

کەواتە:

بە پێی سەرچاوەی ڕاست و دروستی ئیسلام, (سارە) خاتوون, یەك جار ڕووبەڕووی کاری وا بۆتەوە, بە بێ ویستی خۆی, بەڵام خوا پاراستویەتی و ڕزگاری کردووە, بە کوێرایی چاوی پادشای ستەمکارو مەریوان و هاوبیرەکانی, ئیدی هەر شتێکی دیکە بوترێت لە بارەی (سارە) خاتوونەوە, نەفامیی و چەواشەکارییە.

٢ – دەربارەی (لوط) پێغەمبەرش, خوای گەورە بە جوانترین شێوە دەربارەی دەدوێت, نەك وەك مەریوان, کە پێیوایە (لوط) لەگەڵ کچەکانیدا ڕاییبواردووە, وەك لە لاپەڕە (٣٨ –٣٩ )دا, خێزانەکەشی تاوانبار دەکات بە کاری بە دڕەوشتی, هەروەها لە لاپەڕە(٦٥ –٦٧) کتێبەکەیدا باسی لێوە دەکات.

أ– ئێمە وەك باسمان کرد (تەورات) ئەو شتانەی, کە تێیدایەو پێچەوانەیە لەگەڵ دەقێکی قورئان, یان سوونەت, ڕەتی دەکەینەوە بە بێ چەندوچوون, چونکە باوەڕی تەواومان هەیە بەوەی, کە پێغەمبەران زۆر لەو جۆرە کارانەوە دوورن, مەریوانیش بەو ختانەی, کە تەوراتی کردۆتە بەڵگە, ئێمەش لە سەر تەورات قسەی خۆمان کرد, ئەوەی, کە دەمێنێتەوە باسی (هاوسەرەکەیەتی), مەریوان لە ڕاڤەی ئەو ئایەتانەی قورئاندا, کە باس لە چیرۆکی هۆزەکەی (لوط)دەکەن, تەنها یەك تەفسیریشی بە کار نەهێناوە, جگە لە بیری پڕ سێکسیی و ئاژەڵپەرستیی و نەزانیی خۆی!.

خێزانەکەی (لوط), وەك گەلەکەی, تووشی سزای خوا هات و ئەویش, وەك ئەوان لە ناوچوو, چونکە گەر میوانێك بهاتایە بۆ ماڵی (لوط), خێزانەکەی دەچوو هەواڵی دەدا بە خراپەکاران, کە فلانە میوان هاتووە بۆ ماڵی ئێمە, بە تایبەت کاتێ, کە فریشتەکان هاتن و (لوط) پێشوازی لێکردن, خێزانەکەشی چوو هەواڵیدا بە خەڵکی, خەڵکەکەش بەرەو ماڵی (لوط) ڕۆیشتن, یان وەك هەندێك دەڵێن: هەندێ هێماو ئاماژە لە نێوان خێزانەکەی و گەلەکەیدا هەبوو, گەر کەسێك بهاتایە بۆ ماڵیان, بەو ئاماژە و هێمایە تێدەگەیشتن, کە ماڵەکەی (لوط) میوانی لێیە, جا کە خەڵکەکە دەچن, (لوط) ڕێگرییان لێدەکات و قسەیان لەگەڵ دەکات, یەکێك لەو قسانە ئەوەیە, کە پێیان دەڵێ: (هؤلاء بناتي هن اطهر لكم) هود/٧٨.

واتە: ئەوە ئافرەتان، ئەوە بۆ ئێوە پاکترە, بۆیە بە ئافرەتانی هۆزەکەی وتوە کچەکانم, چونکە ئەوان وەك کچی وەها بوون.

(موجاهد و قەتادە) و کەسانی تر دەڵێن: "مەبەست پێی ئافرەتی هۆزەکەی بووە, چونکە هەموو پێغەمبەرێك باوکی هۆزەکەیەتی".[٤١٣]

وە (سعيد بن جبير) هەمان بۆچوون و وتەی هەیە.[٤١٤]

هەروەها بۆچوونی پێشەوای موفەسیرین, (طبری)یشە.[٤١٥]

(ابن جريج) دەڵێ: "(لوط) فەرمانی پێکردوون, کە ژن بهێنن, نەك ڕێگەیان پیشاندا کاری خراپە بکەن".[٤١٦]

---

[٤١٢] صحيح البخاری, (٢٢١٧, ٢٦٣٥, ٣٣٥٧, ٣٣٥٨), ومسلم/ باب من فضائل ابراهيم الخليل .

[٤١٣] ابن كثير, ئایەتی/٧٨هود, تفسير القرطبی, هەمان ئایەت .

[٤١٤] تفسير القرطبی, ئایەتی ٧٨/ هود .

[٤١٥] مختصر تفسير الطبری, ج١, ص٣٨٢ .

[٤١٦] ابن كثير, هەمان ئایەت.

گەرچی هەندێك دەڵێن: "واتە ئەوە کچەکانی خۆم, وەرن با لێتان مارە بکەم, چونکە وەختی خۆی هەندێك لە سەردارەکانی هۆزەکەی, چوونە داوای کچەکانی (لوط), بەڵام ئەو ڕازی نەبوو بیانداتێ". وەك (ابن عباس) دەڵێ.[٤١٧]

ئەمە ڕاستی مەسەلەکەیە, نەك ئەوەی مەریوان بە عەقڵە شڵەقاوەکەی خۆی, لە بارەی ئەم ئایەتەوە نوسیویەتی.

سەبارەت بە ئایەتی ﴿انه مصيبها ما اصابهم﴾ هود/٨١.

واتە: "تەنها خێزانەکەی لەگەڵ ئێوەدا ڕزگای نابێت, چونکە لە سزاکەدا ئەویش, وەك هۆزەکەی تووش دەبێت".[٤١٨]

هەروەها (طبری) و تەواوی ڕاڤەکارانیش, هەمان بۆچوونی (قرطبی)یان هەیە.[٤١٩]

ب – دەربارەی هەردوو خێزانی (لوط) و (نوح), خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ:

"ضرب الله مثلاً للذين كفروا امراة نوح وامراة لوط كانتا تحت عبدين من عبادنا صالحين فخانتاهما فلم يغنيا عنهما من الله شيئاً وقيل ادخلا النار مع الداخلين" التحريم/١٠.

واتە: خوای گەورە نموونە دەهێنێتەوە بۆ ئەوانەی بێباوەڕ بوون بە ژنەکەی (نوح) و بە ژنەکەی ( لوط), کە هاوسەر و خێزانی دوو بەندەی چاکی ئێمە بوون, کە (نوح) و (لوط)ن, بەڵام ئەو دوو ژنە ناپاکییان لە دیندا کردووە و باوەڕیان بە خوا نەهێناوە, بەڵکو بێباوەڕ و موشریك بوون, (نوح) و (لوط) نەیانتوانی لە لای خوا سوودیان پێبگەیەنن, وە پێیان وتراوە (بەو دوو ئافرەتە) کە بچنە دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانی تردا.[٤٢٠]

مەبەستی سەرەکی لەم ئایەتە ئەوەیە, گەرچی ئەو دوو ژنە, هاوسەرەکانیان پێغەمبەر و کەسانی چاك بوون, بەلاّم چاکی ئەوان, سوودبەخش نەبووە بۆیان, گەر خۆیان باوەڕدار نەبن, واتە هەر کەسە و کردەوەی خۆی فریای دەکەوێت.

ئەوەی جێگەی مشتومڕی باسەکە بێت, وشەی "فخانتاهما"یە لە ئایەتەکەدا, کە مەبەست داوێنپیسییە, یان بێدینی؟.

(قورطبی) دەڵێ: واتە خیانەت کردنیان لە دیندا, نەك لە سەرجێیی, چونکە ژنەکەی (نوح) هەواڵی دەدا, کە (نوح) شێتە و پێیدەوت: دەی بۆ خواکەت یارمەتیت نادات؟ (نوح)یش دەیوت: یارمەتیم دەدا, پێیدەوت: جا کەی؟ (نوح) دەیوت: هەر کاتێك ئاو فوارەی کرد و لە ناو تەنورەوە هاتە دەرەوە, ژنەکەشی دەچووە دەرەوە و بە خەڵکەکەی دەوت: ئەی گەل سوێند بە خوا مێردەکەم شێتە, وا گومان دەبات, کە خواکەی یارمەتی نادات, تا ئاو لە تەنورەوە فوارە نەکات, دەی ئا ئەمە "خیانة" ناپاکییەکەی بوو, ژنەکەی (لوط)یش خەڵکی لە میوانەکانی ئاگادار دەکردەوە.[٤٢١]

(ابن کثیر)دەڵێ: "واتە لە باوەڕدا ناپاکییان لەگەڵ دەکردن, وەك ئەوان یەکدەنگ نەبوون لە باوەڕداو پەیامەکانیان بە ڕاست نەدەزانین... مەبەستی "فخانتاهما"ش ناپاکیی و داوێنپیسیی نییە, بەڵکو هی دینە, چونکە خێزانی پێغەمبەران, لە ڕوودانی کاری داوێنپیسیی پارێزراو و دوورن, لە بەر ڕێزی پێغەمبەران, وەك لە سورەتی (النور)دا باسەکەیمان ڕابوورد.[٤٢٢]

(شەوکانی) دەڵێ: "واتە ناپاکییان تیادا دەرکەوێت. (عکرمة) و (ضحاك) دەڵێن: واتە بێباوەڕ بوون. وتراویشە: ژنەکەی (نوح) بە خەڵکی دەوت, کە (نوح) شێتە, ژنەکەی (لوط)یش هەواڵی دەدا لە میوانەکان.

---

[٤١٧] تفسير القرطبی, ج٩, ص٧٦.

[٤١٨] تفسير القرطبی ج٩, ص٨١.

[٤١٩] تفسير الجلالين, ابن كثير, مختصر تفسير الطبری, ئایەتی ٨١/ هود .

[٤٢٠] مختصر تفسير الطبری.

[٤٢١] تفسير القرطبی, ج٩, ص٤٧ .

[٤٢٢] ابن کثیر, ئایەتی ١٠ / التحريم.

هەروەها یەکدەنگی زانایان هەیە لە سەر ئەوەی, کە هیچ یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەران, ڕۆژێك لە ڕۆژان, داوێنپیسییان نەکردووە.[٤٢٣]

(خازن) لە تەفسیرەکەیدا, دەڵێ: "(ابن عباس) وتویەتی: خێزانی هیچ پێغەمبەرێك داوێنپیسیی نەکردووە, بەڵکو خیانەت و ناپاکییەکەیان ئەوە بووە, کە وەك مێردەکانیان لە سەر دینی ئەوان نەبوون, (واتە ژنەکەی نوح و لوط). وتراویشە: بە سەر زارەکی باوەڕیان دەربڕیوە, بەڵام دووڕوو بوون".[٤٢٤]

(سیوطی) دەڵێ: "واتە خیانەتیان لە دینذا کردووە, کاتێك بێباوەڕ بوون, ئەویان بە خەڵکەکەی دەوت. کە (نوح) شێتە, ئەویتریان هەواڵی دەدا لە میوانەکانی (لوط), گەر بە شەو بهاتنایە, دەچوو ئاگری دەکردەوە, گەر بە ڕۆژیش بهاتنایە, بە (دووکەڵ) ئاگاداری دەکردنەوە.[٤٢٥]

خۆ گەر بوترێت: چۆن دەگونجێ خێزانی پێغەمبەرێك بێباوەڕ بێت و بەڵام کاری داوینپیسیی نەکردبێت؟.

دەڵێین:

مەرج نییە هەر کەسێك بێباوەڕ بێت, ئیدی دەبێت کاری داوێنپیسیی بکات, پاشانیش خوای گەورە پێغەمبەرانی بۆ لای بێباوەڕان ناردووە, تا بانگیان بکەن و دڵیان ڕابکێشن بە لای خۆیاندا, بۆیە پێویستە ئەو پێغەمبەرە شتێکی وای پێنەبێت, کە خەڵکی دوورەپەرێزیی لێبکەن و نامۆ بێت بە لایەنەوە, هەر لەبەر ئەمەشە, کە دەبینی پێغەمبەرێکی وەك (نوح) یان (لوط), خێزانەکانییان بێباوەڕ بوون, تا ئەوە لابچێت لە هزری خەڵکیدا, کە پێغەمبەران ناتوانن هەڵبکەن, لەگەڵ کەسێك, کە جیاواز بێت لە ڕووی هزر و بیرو باوەڕەوە, بۆیە بێباوەڕی لای ئەو هۆزانە, شتێك نەبووە لێی دوور بکەونەوە بە هۆیەوە لە پێغەمبەرەوە, بەڵام کاری داوێنپیسیی, ئەوە شتێکی زۆر گەورەیە و یەکێکە لەو تاوانانەی خەڵکی خۆی لێدەپارێزێت, پێشەوایان (زمخشری) و (رازی) و (نەسەفی)یش, ئاماژە بە وەڵامێکی هاوشێوەی ئەمە دەکەن.[٤٢٦]

**خێزانی هیچ پێغەمبەرێك داوێنپیسیی نەکردووە:**

(ابن عباس) دەڵێ:"ما بغت امراة نبي قط".[٤٢٧]

دەربارەی (یوسف) پێغەمبەر, خوا دانایی و زانستی پێداوە ﴿اتیناه حکماً و علماً﴾یوسف/٢٢.

خوا پاراستوویەتی لە هەموو کارێکی خراپ و داوێنپیسیی, چونکە ئەو یەکێك بووە لە بەندە چاك و هەڵبژاردەکانی خوا بۆ گوێڕایەڵیی و پێغەمبەرایەتی, ﴿کذالك لنصرف عنه السوء والفحشاء انه من عبدنا المخلصین﴾ یوسف/٢٤ .

خوا لە سەر زاری (ژنەکەی سەرداری میسر) یوسف, لە داوێنپیسیی وکاری خراپ بە دوور دەگرێت, وەك ژنەکەی دەڵێت: "ئێستا ڕاستی دەرکەوت من هەوڵی خراپەم لەگەڵدا داوە, ئەو ڕاست دەکات", ﴿قالت امراة العزیز الآن حصص الحق انا راودته عن نفسه وانه لمن الصادقین﴾یوسف/٥١. پێشتریش هەموو ئەو ئافرەتانەی دەستی خۆیان بڕی, کاتێ چاویان بە (یوسف) کەوت: وتیان: درورد و پاك و بێگەردی بۆ خوا, لە هەموو کەم و کورییەك, بە راستی هەرچی بوترێت خراپە لە (یوسف)دا شك نابەین, ﴿قلن حاشا لله ما علمنا علیه من سوء﴾ یوسف/٥١.

**بە کورتی**

---

[٤٢٣] فتح القدیر, ج٥, ص٢٤٨.

[٤٢٤] تفسیر الخازن, ج٤, ص٢٨٨.

[٤٢٥] تفسیر الجلالین .

[٤٢٦] بڕوانە: تفسیر الکشاف, التفسیر الکبیر, تفسیر النسفی, ئایەتی ١٠/ التحریم.

[٤٢٧] تفسیر القرطبي, ج٩, ص٤٦.

تەواوی پێغەمبەران و خێزانەکانیان دوور بوون لە کاری خراپەو پەیامی پیرۆزی ئیسلام, پێغەمبەران بە پیرۆزترین و پاکترین کەس دادەنێت, هەرچیش پێچەوانەی ئەم بۆچوونەیە, لە لای ئیسلام بێبایەخ و بێ بەهایە, جا هەر کەسێك بیڵێت, یان لە هەر جێگەیەکدا نووسرابێت.

لە بارەی پێغەمبەرانەوە (سەلامی خوایان لە سەر بێت) بە پێویستم نەزانی زۆر لە سەری بڕۆم, چونکە قورئان بە تایبەتیو فەرموودەی ساغی پێغەمبەر (ﷺ), لەم بارەوە گەلێك دەوڵەمەندە, ڕوون و ئاشکرایە لە بارەیانەوە چی هاتووە, بۆیە زیاتر بە وەڵامدانەوە و قسە کردن لە سەر "تەورات" کۆتایی بەم بەشەش هات.

لە کۆتاییدا دەڵێم, ئەم وەڵامە زیاتر وەڵامێکی زانستیانەیە لە ڕووی یەکلاکردنەوەی بابەتەکان, مەبەستی سەرەکیش لێی, دەرخستنی خودی تێگەیشتن و بۆچوونە سەقەت و خوارەکانی مەریوانە, هەروەها تاکو ئەم وەڵامە ببێتە بەر چاو ڕۆشنکەرەوەیەك بۆ هەموو لایەك, کە هەر کات نووسراوێك نووسرا, بە تایبەتی لەبارەی ئیسلام وموسوڵمانانەوە, یەکسەر باوەڕی پێی نەکەن, تا نەچنەوە سەر بنەماو سەرچاوەی بابەتەکە, مەبەستم نەبوو, کە دێڕ بە دێڕ, وەڵامی مەریوان بدەمەوە, چونکە بە پێویستم نەزانی, کە قسەی لە سەر بکەم لە بەر بێبایەخی باسەکە لە ڕووی زانست و ژیرییەوە, بۆ نموونە: ئەو ناماقوڵییەی, کە لە لاپەڕە (١٤٤)دا, نوسیویەتی: "مێژوو باسی سێکسی پەیامبەر پێش زەواجەکەی لە خەدیجە ناکات وپێم وایە مێژوونوسان درێغیان کردووە, کە ئەم باسەیان نەکردووە, چونکە جێی گومان و سەر سوڕمانە ئادەمیزادێك لە ناوچەیەکی ئاوەها گەرم و لە ناو کۆمەڵگایەکی ئاوەها سێکسسبازداو لە کەلتورێکی پڕ لەبێبەهای ژندا, جگە لە خەدیجە سێکسی نەکردبێت!!".

مەریوان, بە ئاشکرا دەڵێ: پێغەمبەریش (ﷺ) داوێنپیسیی کردووە!.

پەنا بە خوا, ئەمە ئەوەندە بێبایەخە, مەگەر تەنها هزرە پڕ لە سێکسییەکەی مەریوان قبوڵی بکات, دەنا ئەمە شتێکە, ئەوەی ئەندازەیەك ڕۆشنبیریی هەبێت باوەڕ بەمە ناکات!.

بۆیەش زیاتر ئەو لایەنانەی, کە رابورد ئاماژەم بۆیان کرد و قسەم لە سەرکردوون, تا ئەو شتانەی, کە مەریوان لە سەر دەقەکان دایڕشتووە, دەرکەوێ, کە دەقەکان بەو جۆرە نین, ئەو کات خودی مەریوان و نووسینەکەشی بێبەها دەمێنێتەوە.

بەم بەشە کۆتایی بە وەڵامەکانم دێنم, ئەم بەشە هەندێك شت لە خۆدەگرێ, کە دووفاقیی بە قسەکانی مەریوانەوە دەردەکەوێ و دژایەتییەکی زۆر و جیاواز لە نێو قسەکانیدا دەردەکەوێت, من تەنها وەك نموونە, هەندێکی دەخەمە ڕوو, کە سەرەتا قسەی یەکەمی دەهێنم, پاشان پێچەوانەکەی بە دوایدا دەنووسم, مەبەستیشم ئەوەیە, کە خەڵکی بزانن مەریوان لە نووسینی ئەو کتێبەدا بیر و هۆشی لای خۆی نەبووە!.

١- لە لاپەڕە (٦٥)دا, لە بارەی ژنەکەی (لوط)ەوە دەڵێ: "تەنانەت ژنەکەی خۆیشی لە دەست دەداو ئەویش فێری هەمان ڕەوشت دەبێ ...".

دژەکەی: کەچی لە لاپەڕە (١٣٤)دا, دەنوسێ: "ئەم نەتەوەیە لە کونی دواوە سێکسبازیان کردووە, بەڵام نەك لەگەڵ ژنان, بەڵکو لەگەڵ کوڕان".

جا بیر لەم دوو نوسینە بکەرەوە!.

٢- لە لاپەڕە (١٥٠)دا, لە بارەی (عائیشە)وە, دەنوسێ: "عائیشە یەکێك دەبێت لە چاوکراوەترین ژنانی پێغەمبەر, دوور لە وتاری ئاینیی و کاریگەری عەقیدە, پێویستە خوێندنەوەیەکی تایبەت و قوڵ بۆ ئەم ژنەی ناو کۆمەڵگایەکی جاهیل و دواکەوتوو بکەین".

دژەکەی: کەچی لە هەمان لاپەڕەدا, بە چەند دێڕێك لە خوارتر نووسیویەتی: "هیچ ڕیوایەتێك باس لە لێهاتوویی و زیرەکیی و مافناسی (عائیشە) وەك خاوەن هەق و وەك مرۆڤێك ناکەن ".

دەکرێ بپرسین, گەر هیچ ڕیوایەتێك نەهاتووە, ئەی مەریوان چۆن زانی یەکێکە لە چاوکراوەترین...هتد؟!.

٣- لە لاپەڕە (١٦٧)دا, دەنوسێ: "ئەوەی کە مێژووی ئیسلام باسی ناکات, ئەوەیە کە تاکە خاڵێك هەموو ژنەکانی کۆکردبێتەوە, جگە لە(سەودە)جوانی بووە".

دژەکەی: کەچی لە بارەی (خەدیجە)وە, دەنوسێ: "بەڵکو خەدیجە ناودارێکی ناسراو و سەروەت و سامانێکی گەورە و بێئەندازەی هەبووە".

لە لاپەڕە (١٤٣) و (١٧١)دا, لە بارەی (حەفصە)وە, دەنوسێ: "بە پێی سەرچاوەکان جوان نەبووە".

جا بەڕێزان, دوو فاقیی لەمە زیاتر چی, لە لایەك پێیوایە, هەموو ژنهێنانەکانی لە بەر جوانییان بووە, جگە لە (سەودە) نەبێ, لە لایەکی تریشەوە, پێچەوانەکەی باس دەکات !.

تێبینییەك/ بەڕێزان, لە بەر گەڕانەوەی کات, من تەعلیقەکانم بە جێدەهێڵم بۆ ئێوە, من تەنها نووسینە دژ بەیەکەکانی مەریوان دەنووسم و ئەوەی تر واز لێدێنم بۆ خوێنەر!.

٤- لە لاپەڕە (١٧٤)دا, دەنوسێ: "پێم وایە ڕابواردنی مارییە لەگەڵ مابوری ئامۆزای ڕووداوێکی ڕاستەقینە بێت".

دژەکەی: چەند دێڕێك لە سەرووی ئەوەوە, ڕیوایەتێك دێنێ: "کە لێی دەکۆڵێتەوە بۆتی دەردەکەوێت, کە مابوری چارەڕەش خەسێنراوە و هەردوو گونی دەرهاتووە و خوا شتێکی پێ نەداوە, کە لە پیاو بچێت".

٥- لە لاپەڕە (٢٤٥)دا, دەنوسێ: "هەر کات لەلایەن پەیامبەرەوە تەکبیری شەڕ لێدرا بێت, بە هەزاران ئیماندارو صەحابە ئامادەیی خۆیان نیشان داوە و بەبەردێك چەندین نیشانەیان شکاندووە, .... لەلایەکیشەوە دەتوانێ چەندین سەبایاو کەنیزەکیشی دەست کەوێتو بۆ ماوەیەك هەرچی پاڵنەرە سێکسییەکەی هەیە دایمرکێنێتەوە".

دژەکەی: کەچی لە لاپەڕە (٢٤٧)دا, لە پەراوێزەکەی خوارەوەدا, بە ژمارە (١٠٩) نوسیویەتی: "نەچوونی صەحابەکان بۆ جیهاد بەشێکی گرنگی پەیوەندی بە سێکسەوە هەبووە".

٦- لە لاپەڕە (٢٦١)دا, لە بارەی ژنی جوان و هێنانییەوە, دەنوسێ: "ئەم ڕووداوانە پەیوەندی بە باوەڕو بڕوا هێنانەوە (العقیدة والایمان) نییە, پەیوەندی بە پشت و هۆز و کەڵکە بوونی سامانەوە نییە".

دژەکەی: دەی کەوایە, ئیتر بۆ مەریوان کۆمەڵێ شت, کە پەیوەندییان بە دینەوە نییە, لە سەر دین حسابی دەکات, بەو قسەیە بێت, تەواوی نوسینەکەی پووچ و بێ کەڵکە!.

٧ – لە لاپەڕە (٣٠٣)دا, لە بارەی (موتعە) و سەرچاوەکانی و باسی موتعە, دەنوسێ: "ئێمە زیاتر پشت بە دەقە سەرەکییەکان دەبەستین, ئەویش یەکەم: قورئان, دووەم: سوننەیە".

دژەکەی: مەریوان لە باسی پێغەمبەراندا پشت بە قورئان و سوننە نابەستێت, چونکە زیانی مەسەلەکەی خۆی تیایە و پشت بە (تەورات) دەبەستێ!.

٨ – لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە, کە مەریوان بەم شێوەیە لە بارەی مرۆڤەوە دەنوسێ: "ئێمەی مرۆڤ دەبێ دان بەو ڕاستییەدا بنێین, کە جیاکردنەوەی خوو ڕەوشتی مرۆڤانەی خۆمان لە ئاژەڵ بەو مانایە دێت, کە سروشتیانە مامەڵە لەگەڵ دیاردە سروشتییەکان ناکەین".

لە لاپەڕە (٢٣٦)یشدا, شتێکی وا دەنوسێ, کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد.

دژەکەی: گەر کەسێکی ئایینی پاڵپشت بە ئایەت و فەرموودە, وتی: "سێکس سنوری هەیەو ئەم سنورەش دیاری کراوەو نابێت مرۆڤ بیبەزێنیت, ئەم جۆرە بیرکردنەوانە ناچنە ناو ڕەهەندەکانی بیر کردنەوەو خواستەکانی حەزو ئارەزوی مرۆڤەوە, وەك ئەوە وایە پێت بڵێن: مرۆڤ مەبەو ڕەوشتی ئاژەڵانەت هەبێ".

٩ – لە لاپەڕە (٣٨)دا, لە بارەی (لوط)ەوە, دەنوسێ: "بە خەڵکەکە دەڵێت: ئەوەتا دوو کچم هەیەو پیاو نەچووە بەلایاندا".

دژەکەی: کەچی یەك دوو دێڕ دوای ئەمە, نوسیویەتی: "دوو میوانەکەش بە (لوط) دەڵێن: خۆت و ژنەکەت و کچەکانت و زاواکانت ...".

١٠ – لە لاپەڕە (١٣٣)دا، دەنوسێ: "هەر چۆنێك بێت ئیمانداران و صەحابەکانی سەردەمی پەیامبەر لە کونی دوواوە چونەتە لای ژنەکانیان".

دژەکەی: هەر لە هەمان لاپەڕەدا، ئەم گێڕانەوەیە دەنوسێ: "صەحابەیەك لە کونی دواوە دەچێتە لای ژنەکەی و خەڵکی پێیان ناخۆش دەبێت"!.

ئایا ئەمانە لە سەر خۆچوون و شپرزەیی عەقڵی مەریوان دەرناخەن؟.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوە عەرەبییەکان

١ – قورئانی پیرۆز.

٢ – الجامع الاحكام القرآن، ابو عبدالله محمد بن احمد الانصاري القرطبي، دار احياء التراث العربي، بيروت، ١٩٨٥م.

٣ – تفسير القرآن العظيم، ابو الفداء اسماعل بن كثير القرشي الدمشقي، طبعة الاولى، دار يوسف، ١٩٨٣م.

٤ – تفسير الجلالين، جلال الدين محمد بن احمد الحلي و جلال الدين عبدالرحمن بن ابي بكر السيوطي، دار الفكر، ١٣٨٥هـ.

٥ – التفسير الكبير، للامام الفخر الرازي، طبعة الثانية، دار الكتب العلمية، طهران.

٦ – تفسير الواضح، محمد محمود الحجازي، طبعة الخامسة، مطبعة الاستقلال الكبرى، ١٩٦٤م.

٧ – تفسير الخازن السمى اللباب التأويل في معاني التنزيل وعلاءالدين علي بن محمد بن ابراهيم البغداد الصوفي المعروف بالخازن، دار المعرفة، بيروت – لبنان.

٨ – مختصر التفسير الطبري, اختصار محمد علي الصابوني والدكتور صالح احمد رضا، دار اليوسف.

٩ – التفسير القيم، للامام ابن القيم، جمعه محمد اويس الندوي، حققه محمد حامد الفقي، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان، ١٩٧٨م.

١٠ – فتح القدير محمد بن علي الشوكاني، دار الوفاء المنصورة، حققه وخرج احاديثه د. عبدالرحمن عميرة، طبعة الثانية، ١٩٩٧م.

١١ – زاد المسير في علم التفسير ابن الجوزي، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان, طبعة الاولى ١٩٩٤م. تخريج احمد شمس الدين.

١٢ – تفسير ايات الاحكام محمد بن علي السايس، مطبعة محمد علي صبيح.

١٣ – روائع البيات تفسير ايات الاحكام، محمد علي الصابوني، دار الاحسان، طهران – ايران.

١٤ – لُباب النقول في اسباب النزول، جلال الدين عبدالرحمن بن ابي بكر السيوطي، بزيل تفسير الجلالين.

١٥ – مفردات الفاظ القرآن، راغب الاصفهاني، تحقيق صفوان عدنان داودى, طبعة الاولى ١٩٩٢م. دار القلم و الدار الشامية.

١٦ – صحيح البخاري، محمد بن اسماعيل البخاري، مع فتح الباري, دار الحديث – القاهرة.

١٧ – صحيح مسلم، ابو حسين مسلم بن الحجاج القشيري النيسنابوري، دار احياء التراث العربي, طبعة الاولى, بيروت – لبنان, ٢٠٠٠م .

١٨ – صحيح سنن ابى داود، محمد ناصرالدين الالباني، مكتبة المعارف، الرياض, ٢٠٠٠م.

١٩ – سنن ابي داود، سليمان بن اشعت بن بشير السجستاني، دار الفكر, تحقيق محمد محىالدين عبدالحميد.

٢٠ – سنن الترمذي، أبو عيسى محمد عيسى بن سورة، دار احياء التراث العربي – بيروت، تحقيق احمد محمد شاكر و آخرون.

٢١ – سنن النسائي، أحمد بن شعيب بن علي، دار الفكر, بيروت – لبنان ١٩٩٥م.

٢٢ – سنن أبن ماجة، أبو عبدالله محمد بن يزيد بن ماجة القزويني، دار المعرفة, بيروت – لبنان، طبعة الاولى ١٩٩٨م. حقق اصوله وخرج احاديثه و رقمه خليل مأمون شيحا.

٢٣ – سنن الدار قطني، أبو الحسن علي بن عمر بن أحمد، دار المعرفة، تحقيق: السيد عبدالله هاشم يماني المدني، ١٩٦٦.

٢٤ – السنن الكبرى، أحمد بن شعيب علي، دار الكتب العلمية, بيروت، ١٩٩١م, طبعة الاولى، تحقيق: د. عبدالغفار سليمان البنداري، سيد كسروى حسن.

٢٥ – السنن الكبرى، أبو بكر البيهقي، مكتبة دار الباس ١٩٩٤م تحقيق محمد عبدالقادر عطا، مكة المكرمة.

٢٦ – سلسلة الاحاديث الصحيحة، محمد ناصرالدين الالباني، مكتبة المعارف، الرياض ١٩٩٥م.

٢٧ – سلسلة الاحاديث الضعيفة والموضوعة، المكتب الاسلامي, طبعة الخامسة، بيروت ١٩٨٥م.

٢٨ – صحيح الجامع الصغيرة و زيادته، مكتبة المعارف, طبعة الاولى ١٩٨٧م. الرياض.

٢٩ – أرواء الغليل، محمد ناصرالدين الالباني.

٣٠ – فتح الباري شرح صحيح البخاري، أحمد بن علي بن حجر العسقلاني، دار الحديث القاهرة، عن الطبعة التي حقق اصلها عبدالعزيز عبدالله بن باز، رقم كتبها و ابوابها واحاديثها محمد فؤاد عبد الباقي.

٣١ – شرح صحيح مسلم، للامام النووي، دار التراث العربي، طبعة الاولى ٢٠٠٠م، رقمه و خرج احاديثه محمد فؤاد عبد الباقي، حققه الشيخ عرفان حسونة.

٣٢ – الموطأ، للإمام مالك، دار احياء التراث العربي، مصر، ت: محمد فؤاد عبدالباقي.

٣٣ – عون المعبود شرح سنن أبي داود، أبو عبدالرحمن شرف الحق محمد أشرف الصديقى العظيم ابادى، دار احياء التراث العربي, طبعة الاولى ٢٠٠٠م, ت, و,ع و تصحيح: عبدالرحمن محمد عثمان.

٣٤ – شرح سنن النسائي، بشرح السيوطي وحاشية السندي، دار الفكر، ضبط وتوثيق صدقى جميل العطار ١٩٩٥ بيروت – لبنان.

٣٥ – سبل السلام الموصولة إلى بلوغ المرام، للامير آل صنعاني، ت: محمد صبحى حسن حلاق، طبعة الاولى ١٤١٨هـ. دار ابن الجوزية.

٣٦ – اسد الغابة في معرفة تميز الصحابة، ابن الاثير عز الدين ابي الحسن.

٣٧ – النهاية في غريب الحديث، إبن الاثير، دار الفكر, طبعة الاولى ١٩٩٧م, بيروت – لبنان.

٣٨ – المحلى لابن حزم الظاهري، دار احياء التراث العربي، ت: احمد محمد شاكر, طبعة الثانية ٢٠٠١م.

٣٩ – زاد المعاد في هدى خير العباد، إبن القيم الجوزي، ت، خ، ع: شعيب الارناؤط و عبدالقادر الارناؤط, مؤسسة الرسالة، ن.ط: ٢٦، ١٩٩٢م بيروت.

٤٠ – صفة الصفوة، إبن الجوزي، المكتبة التوفيقية، اشراف: توفيق شعلان.

٤١ – تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي، للسيوطي، ت: ابو قتيبة نظر محمد الفاريابى، طبعة الثالثة، دار الكلم الطيب ١٤١٧هـ. بيروت.

٤٢ – الباعث الحثيث، أحمد شاكر، تعليق محمد ناصرالدين الالباني، ت: عبدالحميد علي حسن، مكتبة المعارف، الرياض، طبعة الاولى ١٩٩٦م.

٤٣ – ضعيف سنن ابي داود، محمد ناصر الدين الالباني، المكتب الاسلامي, طبعة الاولى ١٩٩١م. اشراف: زهير الشاويش.

٤٤ – رحمة الامة في إختلاف الائمة, محمد بن عبدالرحمن الدمشقي، مؤسسة الرسالة، ت: على الشربجي و قاسم النوري، طبعة الاولى ١٩٩٤م. بيروت.

٤٥ – الأم، محمد بن إدريس الشافعي، دار الفكر بيروت – لبنان ١٩٩٠م.

٤٦ – الرحيق المختوم، صفى الرحمن المبار الكفورى، دار الخير, طبعة الثالثة دمشق – بيروت.

٤٧ – بداية المجتهد ونهاية المقتصد، إبن رُشد، ت. ص: محمد سالم محيسن وشعبان محمد اسماعيل، مكتبة الكليات الازهرية ١٩٧٤م.

٤٨ – فتوح البلدان، للبلاذري.

٤٩– البداية والنهاية، إبن كثير، مكتبة المعارف، بيروت، ١٩٩٠م.

٥٠– أخبار النساء، إبن القيم الجوزي، مكتبة التحرير، ١٩٨٨م.

٥١– جلباب المراة المسلمة, محمد ناصرالدين الالباني، المكتبة الاسلامية، طبعة الاولى، ١٤١٣هـ. عمان – الاردن.

٥٢– غاية المرام تخرج أحاديث الحلال والحرام، محمد ناصرالدين الالباني، المكتب الاسلامي، طبعة الثالثة، ١٩٨٥م, بيروت – دمشق.

٥٣– رفع الخفا شرح ذات الشفا، محمد بن الحاج حسن الالاني الكردي، ت: حمدى عبدالمجيد السلفي و صابر محمد سعدالله الزيباري.

٥٤– مختار الصحاح، محمد بن أبي بكر الرازي، دار الرسالة، كويت، ١٩٨٢م.

٥٥– مختصر سيرة الرسول، محمد بن عبدالوهاب، طبعة الاولى، الصناعات المطبعية والمكتبية، ٢٠٠١م.

٥٦– مذكرة أصول الفقه، محمد الامين الشنقيطي، ت.ع: ابي حفص سامي العربي، داراليقين، طبعة الاولى ١٩٩٩م.

٥٧– الاذكار للامام النووي، ت، خ، ع: بشير محمد عيون، مكتبة دار البيان، طبعة الثالثة ٢٠٠٣م.

٥٨– سير اعلام النبلاء، للامام الذهبي، طبعة التاسعة، مؤسسة الرسالة، ت: شعيب الارناؤط و محمد نعيم العرقوسي، ١٤١٣هـ.

٥٩– الزواجر عن إقتراف الكبائر، إبن حجر الهيتمي، الزهراء للاعلام العربي، راجعة وخرج احاديثه محمد محمد تامر، طبعة الاولى ٢٠٠٤م.

٦٠– الداء والدواء، إبن القيم الجوزي، ت, خ, ع: بشير محمد عيون، مكتبة دار البيان، طبعة الرابعة ١٩٩٦م، دمشق – بيروت.

٦١– تحفة المودود بأحكام المولود: إبن القيم الجوزي، ت: كمال علي الجمل، مؤسسة التاريخ العربى.

٦٢– مختصر صحيح مسلم، للمنذري، ت: ع, خ: د. مصطفى ديب البغاء، دار العلوم الانسانية، دمشق، حلبوني.

٦٣– تلخيص الحبير فى احاديث الرافعي الكبير، ابن حجر العسقلاني، ت: السيد عبدالله هاشم اليماني المدني، المدينة المنورة ١٩٦٤م.

٦٤– الدر المنثور، للسيوطى.

٦٥– الاستيعاب فى معرفة الاصحاب، أبو عمر بن عبدالبر، طبعة الاولى، دار الجيل, بيروت ١٤١٢هـ. ت: على محمد البجاوي.

٦٦– ضعيف سنن الترمذي، محمد ناصرالدين الالباني، المكتب الاسلامي، طبعة الاولى ١٩٩١م، بيروت – دمشق.

٦٧– المجموع للامام النووي، دار احياء التراث العربي، حققه و علق عليه و اكمله: محمد نجيب المطيعي، ١٩٥٠م.

٦٨– وبل الغمام على شفاء الاوام، محمد بن على الشوكاني، ت: محمد صبحي حسن حلاق، طبعة الاولى ١٤١٦هـ. مكتبة ابن تيمية.

٦٩– الروضة الندية شرح الدرر البهية، صديق حسن خان، ت: محمد صبحي حسن حلاق، طبعة الخامسة، مكتبة الكوثر، ١٩٩٥م. الرياض.

٧٠– الفقه الواضح، د. محمد بكر إسماعيل، طبعة الثانية ١٩٩٧م. دار المنار، القاهرة.

٧١– أحكام الجنائز، محمد نصرالدين الباني، مكتبة المعارف، الرياض ١٤١٢هـ.

٧٢– المعجم الكبير للطبراني، دار مكتبة العلوم والحكم، الموصل، ت: حمدى عبدالمجيد السلفي، طبعة الثانية ١٩٨٣م.

٧٣- اخبار الحمقى والمغفلين، إبن الجوزي، تقديم و تعليق: رضوان جامع رضوان، طبعة الاولى ١٩٩٧م ، دار الفكر، بيروت - لبنان.

٧٤- المسند، للامام أحمد بن حنبل، مؤسسة قرطبة، مصر.

٧٥- الشمائل المحمدية، إختصار و تحقيق: محمد ناصرالدين الالباني، المكتبة الاسلامية، طبعة الاولى ١٤٠٥هـ، عمان - الاردن.

٧٦- وفيات الاعيان إبن الخلكان.

٧٧- الاصابة في تميز الصحابة، إبن الحجر العسقلاني، طبعة الاولى، بيروت، ١٩٩٢م، ت: علي محمد البجاوي.

٧٨- تأريخ خلفاء الراشدين، د. علي محمد محمد الصلابي، دار ابن كثير، طبعة الثانية ٢٠٠٥م ، دمشق - بيروت.

٧٩- مقدمة فتح الباري، إبن حجر العسقلاني، دار الحديث، القاهرة، ٢٠٠٤م.

٨٠- الرسالة، محمد بن ادريس الشافعي، ت، ش: احمد محمد شاكر، المكتبة العلمية، بيروت- لبنان.

٨١- المستدرك على الصحيحين، محمد بن عبدالله ابو عبدالله الحاكم النيسابوري، طبعة الاولى, دار الكتب العلمية ١٩٩٠م - بيروت، ت: مصطفى عبدالقادر عطا.

٨٢- تأريخ الخلفاء، للسيوطي.

٨- تفسير الكشاف للزمخشري بتخريج إبن حجر العسقلاني، طبعة الثالثة ٢٠٠٣، دار الكتب العلمية، بيروت لبنان.

٨٤- نوال المنى فى إثبات عصمة امهات وازواج الانبياء من الزنى، محمد نسيب الرفاعي، طبعة الاولى ١٩٩٨م.

٨٥- لسان العرب، ابن منظور، دار احياء التراث الاسلامي، مؤسسة التاريخ العربي، بيروت- لبنان، طبعة الثالثة ١٩٩٩م.

٨٦- المعجم الوسيط.

## سەرچاوە کوردییەکان:

٨٧- شەریعەتی ئیسلام: مەلا عبدالکریمی المدرس، چاپی دووەم، دار المثنى للطباعة و النشر، بغداد.

٨٨- تەجریدی صەریحی بوخاری، بە کوردی کردنی: نوری فارس حەمە خان.

٨٩- ئیسلام و گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی: د. محسن عبدالحمید.

٩٠- پوختەیەکی بە سوود لە زانستەکانی قورئان: عومەر کەمال دەروێش، چاپی یەکەم, سلێمانی ٢٠٠٦.

٩١- سێکس و شەرع و ژن لە مێژووی ئیسلامدا: مەریوان هەڵەبجەیی, بێ ساڵ و شوێنی چاپ.

